


# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە

( مەلا محمدی کۆیی )

# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە

( مەلا محمدی کۆیی )

بەرگی سێیەم

جوزئی ( ٧-٨-٩ )

لەسەر ئەرکی بەڕێز مام جەلال سەرۆک کۆماری عێراقی فیدراڵ لەچاپدراوە



# سورەتی (مائیدە)

## لە ئایەتی ٨٣ تا کۆتایی

﴿وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ سواءٌ لە نفسي خۆي ببێن وەك ئەوانەي لە حەبەشتانەوە هاتن بۆ خدمەت پێغەمبەر یا لە غَیري، وەك بعضێ لەوانەي کە لەسەر دین مابون. لە هەرزەمانێ گوێ یان لە قرآن بێ تأثیریان تێ ئەکا ئەگرین، ئەوانە زۆر خَلوق وألوفن لەگەڵ ئێمە. شخصێ لە (کۆیە) بوو دکتور ناو (سلیمان) بەدائمي لەگەڵ ئێمە هەڵدەستاو دادەنیشت، بعضە جاریان کە گوێی لە قرآن خوندني (حاجی ئەفەندي) ئەبو غایەت متأثر دەبو ئەگریا ﴿تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ﴾ کأنَّهُ نفسي چاویان لەبەر فرمێسکان ئەهاتە خوارێ ئەڕژا لەبەر شِدَّەتي گریان ﴿مِمَّا عَرَفُواْ مِنَ ٱلۡحَقِّ﴾ ئەو فَیضانە سَبَبي ئەوەبو شتەکیان لە حەق وحقیقة زانی بوو، طبیعي ئەوەي مُلاقاتي لە خدمەت (رِسالەت پەناه) بو، بعضێ لە قُرآني دەبیست، وکَذا ئەوەي مُلاقاتي ئەکا لەگەڵ ئێمە (بعض)هکي ئەبێ ﴿يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا﴾ بە قرآن بە ما أنزل علی الرسول(ﷺ)﴿فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ٨٣﴾ لەگەڵ مسڵمانانمان بنوسە، ئێمەش شاهدي ئەدەین وەکي وان لەسەر حەقیَّەتي (قُرآن) ئەگەر چی حالاً بەقەدەر وانمان گوێ لێ نەبوە ﴿وَمَا لَنَا لَا نُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ﴾ إیمانێ دروست بێ شائبەي شرك بە خوایێ مُنَزَّه لە ژن وکورِ ﴿وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلۡحَقِّ﴾ دیارە

إیمانیـان بـە عمـومـي رسـالەتـي هێنـاوە، نـەوەك بعضـەکیـان ئـەڵێن رَسـولي (عەرەبە) ئەوانەش نَوعە إستکبارێ ئـەنوێنن ﴿وَنَطۡمَعُ أَن يُدۡخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلصَّٰلِحِينَ ٨٤﴾ ئومێدمان هەیـە خـوداي ئێمـە داخـل مـان بکـا لەگـەڵ قـومي صالح بە جێگاێ کە قَومي صاحلي ئەچنێ.

إیمان بە خواي حەق بە (ما جاءَ من الحق) داخـل بـون لەگـەڵ قـومي چـاك وپاك چ قەباحەت وخراپەي تیا هەیە؟ ﴿فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُواْ﴾ بە سَبَب ئـەوەي وتیان لە إیمان وسببي إیمان ﴿جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ کە بۆ عِبـادي مؤمن وصـالح دانـدراوە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ وەکـي برادەرکـانـي دینیـان ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٨٥﴾ لە هەر قَوم وطائفەێ بن.

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ باذوریەتي پێغەمبەران بن ﴿وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ (أکواني) و (قُراني) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ٨٦﴾ لەو مَقامە دەرئەکەوێ صلاحي أُمَّت بە صَلاحي علماو مشایخانە زاتاً ئەوانە بەمنزلەي دڵن وەك لـە (حـدیث) دایـە: (إذا صَلَحَ صَلَحَ الجسد کُلّه وإذا فسد فسد الجسد کله) وەبزانن ئەوانـەي لەسـەر ئەو مَشرەبەبن پاش زەماني سعادەت تائەمڕۆ دوو قسمن قسمێ مسڵمان ئـەبن دەست لە أولاد وثَروەت وجاهو إعتبـاري خۆیـان هـەڵ ئـەگرن، ئەگەرچـی مـع الأسف مسڵمانان لەم عصرە حورمەتیان تەواو ناگرن، بـەخێویان ناکـەن، حتّـا شخصێ لە (هەولێر) مسڵمان بو إنگلیز بو لە ناویان بە حورمەت صاحب معاش ووظیفە بو هەموي تەرك کرد الآن زۆر پەرێشانە لەو بەینە مـن لـە هـەولێر بـوم تـەماي بـو بچـێتە (بَغـدا) بـەڵکو مأموریەتـەکـي دەدەنـێ پـێـی بـەرێوە بچـێ. وەقسمێ زۆر حەز ئەکەن مسڵمان بن ئەڵێن (مالنا لا نـؤمن بـالله) أمـا پابەنـدي أهل وعَیالن، وەزیادەي بێ حورمەتي لەناو مسڵمانان، ئەبێتە مانعیان.

خواي تعالان مسڵمانان بەخەبەر بێنێ مال لەو نَوعە کەسە صرف بکەن نەك لە ورگ گەورەو مل ئەستورو عَطَلە وجَهَلە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ أمـــەتیٚ إجابـــە ﴿لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ ئەوي جَنابي حەق بە شريعەت و طبيعەت لە ئێوەي حَلال کردوە، لـە خۆتـانـي حەرام مەکەن، چ مأکل چ مشرب چ ملبس چ مَنکَحْ چ مَسْکَنْ، شتیٚ طيّب و پـاك وخاوێن، خوا لە ئێوەی حَلال کرديە بیٚ مَعنايە، ئێوە لە خۆتاني حەرام بکەن. مەلێن با ئێمەش ڕەهبان مان هەبیٚ وەکي (عيسَويان) خـودا طيّبـات لـە کـەس حەرام ناکا مەگەر ايجاب و مصلحتەکي تيا بیٚ، ئەو لزوم وضرورەتـە بـۆ ئێـوە نيە، خودا ئەيـەویٚ ئێـوە بـە قـوەتـي عقـل وبـازوان نشـري ديـن کـەن، دلٚ لـە إعتقاداتي باطلـە پـاك کەنـەوە، تـاکو بـە نفـوس زۆر بـن چـوار ژنـی لـیٚ حَـلال کردينە، ئێوە بە (ڕەهبەنەت) قطعي نَسـل دەکـەن. بـزانن ديـني ئێـوە لەگـەلٚ ڕەهبەنـەت چـەند لێـك دوورن، ديـني إسـلام فِطـريـە بـەس مقصَـدي تعـديلي فطرەتە، دينیٚ بالکليە مخالفي فِطرەت بیٚ مـەحو ئـەبیٚ سـەر نـاگریٚ طَبيعـەت نسخي ئەکا. لەو بەينە ديتم (مسيحیٚ) لە مقالەیٚ ئەي ووت: تعلماتـي (عيسـی) بشر قبولي ناکا أمّا تعليماتي (مُحَمدّي) زۆر موافقە. دين لە ئێوە تربيەي نفس وتزکيـەي ئـەویٚ. تعـذيـب وتـذليلي نـاویٚ (صـوفيە)ي ئێمـە هەڵخەلـەتان بـە ڕەهبانيەتي مسيحي، بۆ ديني إسلام زۆر زەرەر بو، شتي خۆش بخۆ وە بخۆوە ژن بێنە أولاد بەخێو کە، أمّا لدی الإيجاب ڕوح وأولاد ومالٚ نَفس ونَفيس لە ڕێی خوا صَرف بکە، دواي قسەي (غزالي) وأمثالي مەکـەوە، عضـویٚ عامـل بـە لـە هەيکەلی أُمَّت، بە نصاغي ولاوازي بەبیٚ هێزي بە فَقـيري خدمـەتـي ديـن وقـوم ومەفتەنت پیٚ ناکریٚ. ئەو آيەتە زۆر مَربوطە بە آيەتي سابق حاجەت بە سَـببي نزول نيە، گەرچی بعضە وقايعيان نقل کردوە کردويانە بە سببي نزول، وقعـەي (عثماني ابن مزعون)وە ياراني وەخطبهي پێغەمبەري إيرادي لێرە زۆر موافقە.

﴿وَلَا تَعْتَدُوٓاْ﴾ لە هيچ شت تجاوز لە حَد مەکەن، عدل برۆن، ئەمە لە ديني إسـلام مقصـودە. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾﴾ زينهـار زينهـار لـە تَعـدّا خۆتان مەکەنە ناخۆشەويسـتي خـودا ﴿وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُواْ

اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ (٨٨)﴾ ئەمانە هەموي معلوم بوە لە رابردو ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ﴾ ئەگەر سوێند بخۆن لەسەر شتێ حەرامي كەن لە خۆتان، ياعبادەتێ فوق التحمل بە سوێند لەسەر خۆتان لازمي كەن، بە شكاندني ئەو سوێندە خوا موآخذەتان ناكا، بەڵكو لەسەرتان لازم ئەكا بيشكێنن، ئەبێ (لَغوي في اليمين) لێرە، ئەمەبێ، بۆيەش لَغوە چونكي لاي خوا خۆش نيە. أمّا (لغو اليمين ضيفان وشاهدان) لێرە لام هيچ مناسبەي نيە.
﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ﴾ مؤاخذەتان ئەكا بەوەي سويندتان لەسەر خواردیە لە خۆتان حەرام كردیە، كەوابێ سوێندەكە بشكێنە وەكفارەت بدە. ﴿فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ﴾ طعام بدە بە (دە) مسكين، نەك طعامي (دە) كەس ولَوْ بۆ كەسێ بێ ﴿مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ﴾ طعامێ باش لەوەي كە ئەيدەنە عائلەي خۆتان.
طبيعي ئەوە بە أحوالي قَوم ئەگۆرێ. ئەوێ ڕۆژێ أوسَطي أطعمە نان وقەسپ وزَيت وگۆشت بوە، ئەمڕۆ لاي سَوادي أعظم نان بەتەنێ يا لەگەڵ قەسپ وزەيتي بە طعام حساب نيە، أما مجتهدەكان ئەو ڕێگايەيان بەستوە.
﴿أَوْ كِسْوَتُهُمْ﴾ يا جلكيان بدەنێ لەبەريان كەن ئەويش بالە أوسَطي (ما تلبسون أهليكم) بێ. أما عُلماي شرع وانا فەرمون(وە تفصيل لە كتبي شَرع دايە).
﴿أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ چاك وايە مؤمن بێ تا ببێتە عضوێ عامل لە هەيكەلي أُمَّت، وەوابێ ئەگەر ئازاد كرا نەبێتە چەل ومل بە شاني مسڵمانان، ئەو نوعە صاحبيان بەخێويان كەن باشترە. ئەو كەسي (كَفّارەت) ئەدا مخُيَّرە لە بەيني ئەو سێ يانە، هەر كامێكي بكا كفارەتە دێتەجێ. (مُعتزلە) لە أصول، بعضێ قسەي پروپوچيان هەيە شاياني نوسينەوە نين. وە ئەو كفارەتە لەگەڵ حالي سوێند خۆرەكان زۆر مُناسبە، خواردن ولباس ومعاشرەيان لەخۆ حرام كردبو.

ئەگەر دەسەلاتم هەبا ئەم گوت: (کەسێ خواردن لە خۆی حەرام کا کفارەتی إطعامە، ئەوي لباس حەرام کا کِسوەیە، ئەوي لە معاشرە منع بێ عبد ئازاد کردنە، ئەوي هەرسێکیان حەرام کا هەرسێك بێ) أما رفقي خوا بە عباد ئەو تکلیفە ناکا. ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ﴾ هیچ لەوانە نەبو یا چەنگی نەکەوت ﴿فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ﴾ لەو مقامە ڕۆژي لاي خوا زۆر ممدوح نیە چونکي ئەوان خۆیان لەسەر خۆیان لازم کردبو، ڕۆژ بە ڕۆژی وشەو بێ دار بن، أما لە صورەتي ناعلاجي (صیامي) سێ ڕۆژي بە کَفارەت بۆ دانان. ئەدي (واجد) کێ یە؟ إختلافیان زۆرە، لاي إمامان (مالکي وشافعي وأحمد) ئەوەي لە قوتي یوم ولیلی خۆی و ئەوەي نَفَقهي لەسەرە وەلەکِسوەتیان زیادي هەبێ، (واجِدە). لاي إمامي (حَنَفي) ئەوەي نِصابي زەکاتي هەبێ (هەبوە).

﴿ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ﴾ ئاگاتان لە سوێندي خۆتان بێ، یعني سوێندێ وا مەخۆن کە چاك وابێ بي شکێنن. تأمل کەن لەوەي سوێندی لەسەر ئەخۆن ئەوەی زەرەری هەیکەلی إسلامی هەبێ سوێندی لەسەر مەخۆن. ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾ علائم وأحکامي شرعتان بۆ بەیان ئەکا ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾﴾ حقیقةً إرشاد بۆ أموري نافعەي عامّە لە أعظمي نِعمانە موجبي شُکرانە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ إیماني دروست ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ﴾ ئە وي سەرخۆش بدا ﴿وَٱلْمَيْسِرُ﴾ قومار بە هەر شتەکي، حتّا بەگوێزو جگ ﴿وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ﴾ بە یانیان رابورد ﴿رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ کُلّێ لەوانە مُستقذرن عقل إباي لێ ئەکا، لە عمل وکردەوەي شیطانە، جوو و دیان ومُشرِك بە تبعیەتي شَیطان، خۆیان لێ ناپارێزن، ﴿فَٱجْتَنِبُوهُ﴾ ئێوە خۆتاني لێ بپارێزن بە دۆستي جوو ودیانان، تێ مەکەون، ڕوو لە شعائري دین پاکي ویەکیەتي کەن ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾﴾ ڕوو لە لادیني پیسی وشِرك بالکلیە

وەرگێرن ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ وە(کَذا) یارانی ئەو. زاتاً بە واسطەی وان ئەتوانێ إنفاذی مرادی خۆی بکا ﴿أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ﴾ لە کردن وخواردنەوەیان. ئەزانن پشتی إسلامەتی بە عَداوەت ورقەباری ئێوە ئەشکێ زەلیل ئەبن لە ژێر دەستیان، کامی خۆیان ئەبینن. لە عصری ئێمە یعنی عَصری مَدَنیەت شَراب وقومار لە غایەتی تَعممی دایە مسڵمانێ عشرەتی نەبێ بە وەحشی ئەازنن. وەقومار أنَّهُ عَلامەتی عَظمەت وکبریایە، بۆیە گەورە گەورەکانی مِلَل زیادە إنهماکی تیا ئەکەن ﴿وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ سبحان الله ئەوانی منهمکن لەو دوو خبیثە ناوی خوایان لابێ قینیان هەڵدەستێ، ڕوو لە نوێژ کردن حاشا. لە أوائلی عمرم ئەم دیت ئەوەی نوێژ نەکەر بایە لە مجمَعی (ناس) زۆر مخجول ئەبو حَتّا بعضەك بۆ رەفعی خَجالەت بێ دەست نوێژ نوێژیان ئەکرد، ئێستا ئەوەی نوێژ بکا بە شەرمەوە هەڵدەستێ بۆ نوێژ وەیارانی جَمعیەت إستثقالی ئەکەن بە گەمە و قەشمەری ئەی لێنێ تەماشا تەماشا (ئەفەنگی) نوێژ ئەکا بە تورکی پێ یان ئەڵێن (بو، دلّە) ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾﴾ ئیتر عوزر نەما چارە نەما إلاّ تەرکیان، شتێ ئەو زەرەرە گەورەی هەبێ بۆ دونیاو دین ئەوی مسڵمان بێ خۆی لێ ئەپارێزێ ﴿وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُوا۟﴾ لە مُخالفەیان ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ﴾ بالعکس عَملتان کرد ﴿فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٩٢﴾﴾ ئەو لە (أدای) رِسالەت قصور ناکا ئێوەش چ عوزرتان نامێنێ لەپاش بَلاغێ واشکرا.

﴿لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ﴾ هیچ حَرَجیان لەسەر نیە ﴿فِيمَا طَعِمُوٓا۟﴾ لەوەی بیخۆن وبیخۆنەوە وە(کَذا) ئەوەی لەبەری کەن ئەوەی ذەوق ولەزەتی لێ ببینن، بازۆر بە لەزەت بێ زۆر قیمەت دار بێ ﴿إِذَا مَا ٱتَّقَوا۟﴾ لە مُحَرَّمات لە إصراف لە تفاخر خۆهەڵکێشان بەسەر خەڵکی لە قەرداری

﴿وَءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ مقصد ايمان وعملى چاكەيە، بانەبى بەپەيامەنوس خوا وەك رەوحانيەكاني ئێمە. كەسێ بە خواردني شتي خۆش ولباسي چاك ومعاشرەي ژني دواي هەواو هەوەسي نەكەوێ، چ جُناحێكى تياهەيە؟ حاشا نيە.

﴿ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ﴾ بە لزائز نەگۆرێن لەسەر إيمان وتَقواو چاكە كردن بن. ئەوانەي رەهبانيەت ئەكەن زۆر غَلَطن باري خۆيان گران دەكەن. كەم وايە بيبەنە سەر. ئەوەي خواو پێغەمبەر أمريان پێ فەرموە نَهيان لێ كردوە، بۆ سعادتي دونياو قيامەت كافيە وەك لە آيەتي سابقە فەرموي.

إنسان سەيرە، ئێمە إيمانيان بە فەرمايشتي خواو پێغەمبەر هێنايە، ئەوي ئەوان فەرمويان بەسەرچاو، خۆ عذاب دان خۆ رەزيل كردن، مُشَقّەت ومانىدي بون بۆ چ؟ ئێمە عَبدين، سَيِّدمان چى ئەفەرموێ، واي ئەكەين، ئەمە خۆيەتي، باقي پوچە. ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٩٣﴾ ئەوەي رەهباني بكا كەي إحساني پێ ئەكري؟ دائماً چاوي لە دەستي خەڵكە. مامۆستا (مەلا ئەحمەدي كۆر) رەحمەتي خواي لێ بێ بە تَعريض ئەي فەرمو: (ئێمە بە عِزّەت تەركي دونيامان كرد أمّا بە زيلّەت طَلَبي ئەكەين).

ئەي خودا لە تفسيري ئەو ئايەتە مُفسرەكان چ هەرايانە. تەماشاي روح المعاني كەن وە ئەمەم لا سەيرە ئەڵێن: (كە تحريمي خَمر وقومار صادر بو صحابان فەرمويان ئەبێ حالي ئەو مسڵمانانەي مردوو چۆن بێ؟ شەرابيان خواردبتەوە، قومار كەر وخواردويانە)، خواي تعالان ئەو آيەتەي نارد. من لام وايە صحابە هەندە بێ وقوف نين لە وەقتي تحريم ئەواني نەمابون لە دار التكليف چوبونەدەر، لە وەقتي ئەيان خواردو ئەيان خواردەوە حەرام نەبون، چى جێ إستفسارە لە كَيفيەتي حاليان؟ لە مسألەي تحويلي (قِبلە)ش شتێ نَقل ئەكەن، لكن نايەتە دەماغ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ﴾ إمتحانتان ئەكا حضرەتي باري ﴿بِشَيۡءٖ مِّنَ

﴿ٱلصَّيۡدِ﴾ ئەمەخۆيەتي؟ لەپەناو پاسار دانيشتن گۆيا تەركي دونيامان كرديە، چ نيە. إنسان ئەوەيە لەو نوعە شتە تقواي خوا بكا خِلافي شرع نەكا ﴿تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ﴾ دەستتان ئەيگاتێ بەداوو فاقە و (أشبكە) وەبە ڕمبان لێ يان ئەدەن. ئاگادار بن خۆ توشي مردار خواردني نەكەن، لەو هەنگامە لە خوا بترسن، بزانن خەبەر دارە ﴿لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ﴾ زۆر ئەبێ شخصێ بەتەنێ ئەچێتە ڕاو نێچير ئەكوژێ، ئەگەر ترسي خواي هەبێ، كە مرداربێ نايخوا وە دەرخواردي منالي خۆی نادا، ئەگەر بێ نەترسێ، كەس ئاگاي لێ نيە ئەويش ئاگاي لە ئاگاداري خواي نيە، ئەيخواو ئەلێ مُزكّايە وەدەرخواردي خەلّكيش ئەدا. جەنابي (حەق) قبل الوقوع ئەزانێ شت ئەبێ، نابێ چۆن ئەبێ، چۆن نابێ، أما علمي وەقتي بون وەك علمي پێش بون نيە، كەوابێ ئەوەي بلێ شت پێش بون نازانێ وەك بعضە (معتزلە)يەك هَذَيان ئەكا، فرق نيە إلاّ لە كيفيەت، أولي ئەزانێ ئەبێ، الآن ئەزانێ ئەوا بو. ﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ﴾ لەپاش ئەو آيەتە تجاوز بكا حَدّي شَرعي ﴿فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٩٤﴾ ديارە ئەو نوعە كەسە ترسي خواي نيە، فَرقي حلال وحَرامي ناكا، ئەو خَوفي لە خەلكي ئەكا لە خواي ناكا. ئەلێن ئەو آيەتە لە عُمرەي (حُدَيبيَّە) نزولي كرديە. وحوش ئەهاتنە ناويان كە ئەيان تواني بە دەست بيان گرن، بە ڕمب لێ يان دەن، وەقصديان كرد بيان گرن، نَهيان لێ كرا. لام وايە ئەوە لەبەر (تنالە أيديكم ورماحكم)ە، وەلە تەفسيري ئەمەش قيلَ قيليان زۆرە (خوايە نجات لە منازعات!) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوەي ئەو عنوانەي صِدق لێ بێ ﴿لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ﴾ ئەوەي بەنێچير بشێ. حساب بكرێ، مەيكوژن، وەئێوە لەإحرام دابن بە حەج يابە عُمرە، لە حەرەم دا بن يا لە غەيري حەڕەم. ﴿وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا﴾ بزانێ لە إحرام دايە نەبە سَهو وەك (داودي ظاهري) ئەلێ.

﴿فَجَزَآءٌ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ﴾ وَلَـوْ مُماثلـەكـە بـە وەجهـیّ زۆر دوور بـیّ، بۆیـە ئەفەرمویّ ﴿يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٍ مِّنكُمۡ﴾ لـەخۆتان. أصـحابـي وقـوف بـن جِهـهـتي تماثُلُ وتخالُف بە دقت تەماشا كەن وەك بەيني (شاة) و(حَمام) لـە هَـدير و ئـاو خواردنەوە، ئەوە بنا لە مذهبي (شافعي)ن بناله مذهبي إمامي (حَنَفي) إجتهـاد كەن لەقيمەت. لێرەش مخُالفات زۆرە ﴿هَدۡيَۢا﴾ لەطرف نێچیر كوژي وەك إمامي (أبوحنيفە) ئەفەرمویّ. یا لەطرف حَكَمَیْن ﴿بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ﴾ بگەیندرێتـە (بَیـت). ﴿أَوۡ كَفَّٰرَةٌ﴾ ئەوچیە؟﴿طَعَامُ مَسَٰكِينَ﴾ جماعەتیّ لە مسـكینان ﴿أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا﴾ بە عددي ماكینان. ظاهر وایە پاش تعیني (هَدي) وَەعَددي مسـاكین وەمُعادلي وي لە أيّام بۆ صیام، صَیّاد مخُیَّرە یەك لەوانە بكا. ئـەو جَـزایـە كـە قەرار درا ﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ﴾ تاكو بچێژیّ گراني ئەو كـارە، یـا گـرانـي أمـري خودا، (وَبال) بە معنا (نقِلە) بە باراني زۆر ئەلێن (وابـِل) چـونكە گـرانـي هەیـە ڕنگە لە عارد دێنیّ، (وبیل) بە طعاميّ قـورس ودیـر مَعظـم ئـەلێن. ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ﴾ نازانم لەگەلّ سببي نزولەكەیان چۆن ڕێك ئەكەویّ؟ ئەگەر لـە زەمـانـي جـاهلـي بـیّ (الإسـلام یُجَـبُّ مـا قبلـه لمَـن أسْلَمَ)إحتیـاجي بە عفونیـە، بالـە شریعەتي (إسماعیل) حەرام بوبیّ. دیارە، مقصد ئەوەي لەزەماني إسلامەتیان دا كردبـیّ (قبـل نـزول الآیـة) خـوا موآخـذە ناكـا. ﴿وَمَنۡ عَادَ﴾ (بَعْـد التحـریم) ﴿فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ﴾ لە قیامەت. لاشك مُراد عَودي إختیاریە، ئەگەر مضـطر بـو، قەیدي نیە. ئەگەر بموێرابا ئـەم گـوت بـیّ (كفـارەت). ئایـا مضـطر لـە بـەیـني (مَیتە) وەصَیدیّ هكذاي چی بكا؟ (زُفـر)ئەفـەرمویّ (میتـە) بخـوا، ظـاهر وایـە لەبەر شِدّەتي ئەو آیەتە بیّ. أما (حَنَفي) ئەفـەرمویّ: (نێچـیر بخـوا، كـەفارەت بدا، چونكە حورمەتي صَید بـۆ حورمـەتـي إحـرام وحەرەمـە موەقتـە). ﴿وَٱللَّهُ

﴿عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ۝٩٥﴾ إلاهي ئەوانەي لەو عصره خەريكي صَيدي مال و روحي ضعفاي إسلامن بە عِزّەتي خۆت إنتقاميان لێ بستێنی لەبەر چاوي ئەو بێ دەسەلاتانە پارچە پارچەيان بكەي. ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ﴾ ڕاوكردن لە بَحر، ماسي طير ئەوانە بگرن چونكە إحرام وەك شەموي جولەكەكان نيە.

﴿وَطَعَامُهُۥ﴾ خۆتان بيخۆن. قَولێكی (شافعي) هەيە: (صيدي مُحْرِمْ بۆ خۆی حەرامە، بۆ كەسێ لە إحرام دا نەبێ خواردنی حَلالە). إحتمالي هەيە لەو كلمەي وەرگرتبێ، كەوابێ (صَيد) لێرە بە معنا مَصدريە نەك بە مَعنا نێچير. وە حاجەت نيە بيكەينە عَطفي خاص لەسەر عام ﴿مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ﴾ مقصَد لە ڕاوي بحر، مُجَرَّدي إشتغال بەڕاو كردن نيە، سواءً حَيوانەكە بخورێ يان نەخورێ، مقصدإستفادە لە نێچيرەكەيە، بۆ ئەواني (مُحْرِمْ) لەووەقتي عافيێتى كەن ياهەلي گرن لە ڕێگا لە حەرەم دا بيخۆن. ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا﴾ كە خۆتان بيگرن. أما كەسێ غيرە مُحْرِم صَيد بكا ئايا ئەو صَيدە لە (مُحْرِمْ) حەلالە ياحەرامە؟ نِزاعيان هەيە تفصيلي لە (روحُ المعاني) دايە، ئێمە لە (چنارۆك) وەقتي ئەم طول وتفصيلە مان نيە (إن شاءَ الله) لە تبيضي شتێ ئەنوسين (وعلى الله التوكل). ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ لە جميعي أمين (حُرُم) بن يا غَيرە (حُرُم) لە هەرچی نهي تان لێ ئەكا صَيْد الحَرَم يا غير. ﴿ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ۝٩٦﴾ هەر ئەو ملكي يومي جَزايە، حَشرتان هەر بۆلاي ئەوە، أصنام وأنصاب أشباهيان كەلك ناگرن.

﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ﴾ ئەمڕۆ كە ڕۆژي فتح وفيرۆزي وپاك كردنەوەي (بَيْت)ە، كعبە بويتەوە (بيت الحرام) پێش ئەمڕۆ گێرابويان بە (بيت الأصنام) گەرچی صورةً حُرمەتيان ئەگرت، أما لە ژێر ئەو أرجاسانە، زۆر مُحَقَّر ومُهان بو. ئەو (جَعْلَ)ە (جَعْل)ێ تشريعيە، نە خلق

وأيجادي خودايە. لە زەماني (خليل) و (إسماعيل) بيت الحراميان گێڕا بە مجمع ومأمن بۆ إنسانان،مجمعي دلّ، نەك بەدەن و بەس، مجمعي أخوَّەت پالّ پێك دان، نەك نەفرەت ولێك بوونەوە. في الحقيقة پاش عصري سعادەت (بيت الحرام) زۆر بێ حورمەت بو لەناو مسلّمانان، أمن وئاسايش تێ دا نەبوو، لە أطراف وأكناف أرض عالەم ئەچون بۆ (حَج) كەس لە رووح ومالّي خۆی أمين نەبوو، ئەوي (قَرامِطە) بەسەريان هێنا لە چ دەورێ بەسەريا نەهاتبوو. بابم لە خدمەت بابي لە تأريخي ١٢٨٨هـجري چو بوە حج، ئەو وەقت بە وَلَد نەبوبوم، دوايێ ئەيگێڕايەوە يەكي لە حاجيان قۆڕ دەبێ بە أغلبي شەو ئەچو بۆ طواف ونوێژ، بعضێ ئەيبينن ئەچێتە ركوع وسجود بۆزاييێكی لەناو گەلاّندايە، وا گومان دەبەن كيسە پارەيە لەوێی بەستوە، شەوێ هجومي ئەكەنە سەر بەچاپوكي ئەيخنكێنن، كەچی تەماشا ئەكەن ئەو بۆزايە شتێ ترە لاشەكەي ئەبەن ئەيهاوێنە ناو بيري (زمزم)، پاش دوو رۆژ بێ گەني ئەبێ، ئەلّێن أسبابي چيە؟ ئەمە قَط نەبوە، ئەچنە ناوي ئەبينن لاشە إنسانە تيايا تَعَفُّني كرديە. حاصلي خلاصە ئەو سيِّئاتي لەوێ ئەكرا لە هيچ (دار الفسق) بەلّكو (دار الكفر) نەدەكرا. حكومەتي عثماني هەرچەند سعي ئەكرد لە دَفعي ئەو نَوعە قبايحە بێ فائدە بو. تا لەو چەند سالاّنە (عبد العزيز ابن السعود) سلطاني (نجد) (حجازي) گرت بويە ملكي حجاز بَسطي أمن وئاسايشي تيا كرد، ئەوي دێتەوە لە حَجْ هەمو دوعاي بۆ ئەكەن. مسلّمانان سالماً غانِماً ئەچنە حَجْ وە دێنەوە، خودا بەرقەراري كا لە تَعَصّبي مذهبي دووربێ. ﴿وَٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ﴾ أشهري حُرُميشي گێڕاوە بە زەماني (أمن) بۆ (ناسان) هەرچەندە دوشمن وخون خواري يەك بان، لەو مكانەدا، تعرضي يەكيان نەدەكرد، لەسەر ئەو هەموو جهالت و كفرو شرورە حورمەتي ئەو مكانەيان لاهەبو. ﴿وَٱلۡهَدۡيَ وَٱلۡقَلَٰٓئِدَۚ﴾ هَديە هەرچی بێ، ذات القلائد عبارەتە لەبەر (بُدُن) كە قەلێتەيان لە مل ئەكردن دەيان نارد بۆ طرفي (كعبە)، تَصريح بەو، بۆ اِظهاري عموميَّەتە بِنابە

روايەتي (أبي الشيخ) كە ئەڵێ (مَجازه). لە زەمانـي جاهليـەت ئەگـەر إنسـانێ چوبايە إحرام (قەلادەكي) لەموو لە ملي خۆی ئەكرد، كەس تعرضي نـەدەكرد، (قَلائد) داخلي هَدي نيە.

﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو گێڕانە ﴿لِتَعۡلَمُوٓاْ﴾ بە يقين بـزانن بـێ شـك وشُبهە ﴿أَنَّ ٱللَّهَ﴾ سبحانە وتعـالى ﴿يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ ديـارە دانـاي ئـەو نوعـە أحكامە، بێ علم بە جُزئيّات، نابێ. إعـتراف بـە رِسـالەت لەگـەڵ إنكـاري علمـي خوا بە جزئيات گرنابێتـەوە. بـەڵێ علـم بـە مَعنـى حصـولي صـورەتـي شـت، ياصورەتي حاصِلە. ئێمەش ئەڵێين بۆ خواي نيە(نعـوذ بـالله) صـورەتـي أشـيا مادّي ومعنوي لە ذاتي أقدسي كبريائي إنطباعي بـێ. حقيقـەتـي علـم بـە معنـا تَجلّـي وظهـوري شيئە لاي عـالم، يـا صـفەتێكە مبـدأي ئـەو تجليـە، ئەمـە بـۆ حضـرەتـي ذو الجـلال مُقـرّرە. ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ٩٧﴾ جـزەي كُلّـي، واجب، ممكـن، ممتنـع، رابـردو، حالـە، آتـي، قبـل الوقـوع، حـين الوقـوع، بعد الوقوع مادام خوا بێ، ئەبێ وابێ. لكن منازعاتي علمايان نەبا لە تفسيري علمە وەكـي إشـارەمان بـۆ كـرد، حكمـاش معترفـن وە علمـي كبريـائـي لاي وان (حُضوري)يە. كـە زانيتـان علمـي خـوا محيطـە وە ئـەو أحكامـە لـە طـرف وي دانـدراوە. ئاگاتـان لـەخۆ بـێ، ئاگـاي لـە ئێـوە نـابڕێ، مخالفـەي مەكـەن.

﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ عقاب زەرەرێكە لەگەڵ إنكسار وإهانە. خوا حفظمان بكا لە عقابي خَفيفي، فَضل لـە شَـديدي، ئـەوە بـۆ مخالفـان ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٩٨﴾ ئەمەش بۆ موافقان. كـەوابێ إنسـان خواپـەرستي بكـا لـە بەيني خَوف ورجاء ﴿مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ﴾ لازم نيە پێغەمبەر عالمي سِرَو علن علمي بە كائنات محيط بێ، وظيفە ي وي تَبليغە، ئەوەي خوا بە وحـي بـۆ نارد بيگەيێنێ بە أُمّـتي دَعـوەت. چ حضـرە تـي محمـد (ﷺ) چ سـائري رسلي عظام لە أداي ئەم وظيفة قصوريان نەبوە.

﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ﴿٩٩﴾﴾ علم بە هەموو شت خاصّي خوايە، نە (مَلَك)، نە (عقل)ن نە (رسول)، نە قطبي فَردو غيرە فَرد، نصيبيان لە شمولي علم نيە. ئەوانەي مُدّعينە كَذّابن ئەگەر ايمانيان بەو آيە تانە هەبێ وەياخود خۆيان بناسن وەكەمێ لە خواصّي مقامي ألوهيەت بزانن ئەو نَوعە هَذَيانانە ناكەن، أما جهل وميلي فاسد هەمو قسەيێك بە إنسان ئەكەن. مادام خواي تعالان ئەوەي بە ئاشكرا ئەيكەن يا بە پنهان، ئەيزانێ لێي بزر نابێ، ئێوە ظاهر وباطن پاك كەن، ﴿قُلۡ﴾ ئەي مُبلِّغ ﴿لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ﴾ پيس وپاك خراپ وچاك لەهەر نوعێ بێ وەك يەك نابن، ئەوە بەديهيە. وەمقام مقامي تجارەت نيە تا إعتبار بە سببي نزول بكەين. گۆيا جماعەتێ لە مسڵمانان إرادەيان كردوە كە فێل لە حجاجي (يَمامە) بكەن مالي چروكيان بدەنێ مالي چاكيان لێ وەرگرن، ياخود پياوێ عرضي پێغەمبەري كرديە (تجارەتي من لەسەر (شَراب) بوە لە فروشتني ماڵەكي زۆرم گرد كرديتەوە ئايا نفعم ئەداتێ ئەگەر لە طاعهتي خواي صرفي بكەم؟ حضرهتي رسالەت لە جوابا فەرمويەتي (ئەمە ئەگەر لە حج وجهادي صرف كەي بەقەدەر بالي مێشولەيەك خێرت ناگاتێ) ئەوجا ئەو ئايەتە نزولي كرديە. وەتفسيري (خبيث) بە حَرام (طَيِّب) بە حَلال وەك لە (حسن) نقل كراوە وە (جُبّائي) پەسەندي كرديە زۆر مناسبەي نيە. ئەگەر چي حقيقة حلال پاكە وەحرام پيسە. أما تفسيري (خبيث) بە مُشرك (طَيِّب) بە مؤمن وەك (إبن جرير) لە (سدّي) نقل كرديە جوانە، مشرك لە حوريەتي ضمير ناگاتە مؤمن وەلو مُشرك شاهنشاە وەمؤمن گەدابێ، وەمؤمنيش هەتا مؤمن فەرقي هەيە، كەسێ بە (يَقين) بزانێ خوا ئاگاداري ظاهر وباطنيەتي وە ئەو ايمانە لە دڵيا شين بوبێ قوەتي ساندبێ لەسەر هەواي سُمعەو ريا لە ئاشكراي ونهاني صاف وصادق لە كوێ؟ كەسێ ئەو أيمانەي هەبێ أما لە دڵيا نەچەسپابێ بە نَوعێ كە لە رياو چاپ لوسى مَنع كا، (دەريَرابَر چو گوسفندي سليم دەر قفا هم چوگورگى مَردوم خوار) لەكوێ؟

لاي من لێرە (طيِّب) ئەوانەن کە باطن وظاهر طَيِّب وطاهرين ئاگاداربن کە خوا ئاگادارە، (خَبيث) ئەوانەن (مقتضاي) ئەو إيمانەيان نەبێ با أصلي ايمانيشيان هەبێ، أما چ شَجَرە بێ ثَمَرە کەلْکی چیە؟ بيبڕێ، بيسوتێنێ. ممکنە (خبيث) و (طَيِّب) رووکاتە (هَدي) و (قلائد) يعني هدي باش بنێرن بۆ کعبە زێرا (طَيِّب) ولو کەميش بێ چاکترە لە (خَبيث) ولو زۆر بێ، ئەگەر چی تۆ ئەي (رَسول) بەزۆري کەيفت دێت تاکو هەر فَقيرە لە فُقراي (مکە) شتەکيان بەرکەوێ. ديارە بەوإعتبارە خطاب بۆ حضرەتی(رسول) جوانە﴿وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ﴾ ئەي ناظر ﴿كَثۡرَةُ ٱلۡخَبِيثِۚ﴾ حقيقە (خَبيث) لە هەمو شت لە (طَيِّب) زۆرترە خصوص لە ساحەي ايمان وإسلام، مُزَخرەف زۆرە ئەوەندە زۆرە نايەت حساب، أما وەکي ئەڵێن ئيش لە (كَيفيەت) دايە نەلە (كَمِيَّەت)، (يکێ مَردي جنگی بەِ أرصد هَزار). ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ ئەو کەسي صاحب (لُبْ) بێ ئەزانێ معناي ئێمە ماڵی باش و زۆر بنێرن بۆ (کعبە) لەگەڵ ئەو جُملە زۆر مُناسِبە وەلەگەڵ سابقيشي مُنتظمە.

ئەوي صاحب دل وهۆش بێ تَقواي خوا ئەکا لە سِرّوعَلَنْ، دين ناکاتە دواي دونيا لەناو خَلق ولە خلوەتخانەي خۆی وەك يەك ئەبێ. ئەگەرچی مَيل ويساطهتي أُمَّت بويتە سَبَبي كَثرەتي رياکار وەحيلەگەران لايان زۆر بە حورمەتن. أما مۆمني بە ڕاستي نابێ خۆی بۆ ئەو نَوعە عِزّە لە خوا بکا مُعاملەێ منافقانەي لێ روو بدا، بەڵکو تَمَسُّك بە ايماني صحيح ئەکا، لەگەڵ عبادي خواو خوا راست ئەبێ، با لەناو أُمَّت بێ قەدرو قيمەت بێ، طبيعي لاي خوا هەر ئەو بە حورمەتە ﴿لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٠٠﴾ رجاتان وابێ بە تَقوا فَوزياب ئەبن بە ثَوابي دونياو قيامەت، مُشرك ومُزَخرَفْ لاشَك محرومن، ئەگەر مۆمني رووکەش نجاتيش ببێ ناگاتە مۆمني خالص ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ کە خوا عالمي سِرّو جَهر وماتُبدونَ وما تَكْتُمونە ﴿لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ﴾ سوآل

مەكەن لە پێغەمبەري لەھەندەك شت چ أحكام چ غَيرِ أحكام.

﴿إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ﴾ ئەمە ئەگەر بۆتان ئاشكرا بكرێ دلّ آزوردەتان ئەكا پێتان ناخۆش ئەبێ ﴿وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ﴾ لەوەقتي نزولي آياتي قُرآني ﴿تُبۡدَ لَكُمۡ﴾ خوا إعلامي پێغەمبەري ئەكا، هەرچەند خوا فەرموي وظيفەي پێغەمبەر هەر بَلاغه، أمَّا ئەوە مانع ي كشفي بعضه أشيا لە طَرف خوا بۆي بكرێ، نيە. ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ﴾ خواي تعالان مُسامحەي كرديە لەو جۆرە شتە بۆتاني داناوە بَياني نەفەرموە، ئێوە بۆ چ لێي ئەتۆژنەوە؟. روايەتە پێغەمبەر فەرموي خوا حجّي لەسەر ئێوە فَرض كرديە، (أقَرعي بن حابس) عرضي كرد هەمو سالّێ؟ حضرەت سكوتي فەرموتا سێ جار، پێغەمبەر فەرموي ئەگەر بم گوتبايە (بەلّێ) هەمو سالّ لەسەرتان واجب دەبو، وە نەتان دەتواني، پاشان فەرموي: (لێم گەرێن مادام ئەمن لە ئێوە گەرێم، أُمّتەكاني دي بە هيلاك چوين لەبەر زۆر سؤآل كردن لە پێغەمبەري خۆيان، ئەگەر أمرم كردنێ بە شتێ ئەوەندي قوەتتان پێ ئەگا بيكەن، وە كەنهيم لێ كردن لە شتێ، مەيكەن). وەئەلّێن شخصێ سؤالي لێ كرد (باوكم لە كێندەرێ يە؟) فەرموي: (لە جَهنَّم دايە). ئەو سؤالەي چ پێ ئەوێ؟ خوا بە خصوصي لە حەق باوك ودايكي كێ فەرمويەتي ئەوە لە بەھەشتە ئەمە لە جَهنّمە؟ قَومێ وەكي ئێوە مُشَرَّف بوين بە خزمەت ئەو (ذاتە) لە مهامي أموري نافعه بۆ دين ودونيا لە كَشفي حقَايقي كائنات حسب القّوة سؤالي لێ بكەن زۆر باشە زۆر بەجێ يە، ياخود خودا لە سؤالەكاني پێش نزولي ئەو آيەتە عفوي كردن نەكەن عَودەت بكەن بۆ أمثالي ئەو سؤالانە.

﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ١٠١﴾ لەگەلّ هەردوو معنا مناسبەي هەيە.

(لَطيفة):– لە شرحي (لاميه) ئەلێ سؤاليان كرد لە شخصێ لە إعلالي (أشياءَ) ئەويش لە ژێرەوە نوسي (لا تَسئلوا عَنْ أشياءَ)... الآية. سَيّدي

(آلوسي) زۆري لەسەر رۆيشتيە أما فهمي معنا پەكي لەسەر ئەو طول وتفصيلە نەكەوتوە. ﴿قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ﴾ قـومي (موسـى) لـە زەمـانـي وي لـە دواي وي قَومي (صالح) قومي قُريش ﴿مِّن قَبْلِكُمْ﴾ بنا لە تأويل بە قَومي قُريش ئەبێ خطاب لەگەڵ ئەو سائلانە بێ ﴿ثُمَّ﴾ لەپاش سؤال وجـواب ﴿أَصْبَحُواْ بِهَا﴾ بـە سـبَبَ ئـەو سـؤالانە ﴿كَٰفِرِينَ ١٠٢﴾ ئێـوەش خۆتـان تـوشـي كُفـرو ضـلال مەكـەن، مەبنـە سَـبَبي بـارگراني و پـێ نەهاتنـە جـێ ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ﴾ پێشكەش ودياري وقَلائد لە طرف خوايە شرعي إلاهيە، أما (بَحيرە) و ئـەواني تر لە طرف جەنابي حـەق دا نەنـدراوە. (بَحيرە) چـي يـە؟ إنسـان بـە حـيرەت تەماشاي خلاقي نَقالان ئەكا نێزيكە بلێ (ما جعل الله من بحيرة). أصلي بە معنى (شَقَّه). (زَجّاج) ئـەڵێ: (لـە زەمـانـي جاهليـەت حوشـترێ پێـنج زگـى كردبايـە پێنجەمينيان ئەگەر نێريـا گـوێ يـان شـەق ئـەكرد نـەيان ئەكوشـتەوە سـواري نـەدەبون منـع نـەدەكرا لـە ئـاو لـە پـاوان ئەمـە بَحـيرەيـە). (قَتـادە) ئـەڵێ: (تەماشاي بێچوي پێنجـەمينيان ئـەكرد، ئەگـەر نێريـا ئـەيان كوشـتەوە ئـەيان خوارد ئەگەر مێ با گوێ يان شـەق ئـەكرد بـەرەڵلايان ئـەكرد ئەلـەوەڕا نـەيان ئەدۆشي سواري نەدەبون).

بعضێ ئەڵێن ئەو حوشترە مێ يە پێنجـەمين زگـە گۆشـت وشـيري بـۆ ژنـان حَلال نەبو، ئەگەر بمردبايە ژن وپياو ئەيان خوارد.

لە (محمدي بن أسحاق) وە (مجاهد) نقل كراوە (بَحيرە) سائبەيەكە دێ، أما ئەوە بێ معنايـە، چـونكي سـائبەش بـە خصوصـي ذكـر ئەفـەرموێ. خلاصـە قيلەقيليان زۆرە إنسان ناتوانێ هەموي نقل بكـا. ئەڵبەتـە لـە زەمـانـي نـزولـي آيەت زاناندراوە بە تعين چيە وەإحتمـالي هەيـە بـە عـاداتـي أقـوامـي مُشـركين مختلف بن. ﴿وَلَا سَآئِبَةٍ﴾ لەوەش إختلافيان زۆرە. بعضێ ئەڵێن حوشـترێ دە (١٠) زگ بكا هەموي مێ بێ تركي ئەكـەن نايكوژنـەوە بـە غَـيري ميـوان كـەس

شیري ناخواتەوە ﴿وَلَا وَصِيلَةٍ﴾ لەمەش خلافیان هەیە، أما أكثریان لەسەر ئەمە نەلە نوعي (مەرە). ﴿وَلَا حَامٍ﴾ ئەمەیان لە نوعي نێرە. لاشكَّ أحكامي سَماوي هەمووي مصالحي عامَّە، بە معنایە، پڕ حكمەتە، إفتراو شركي تیا نیە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ﴾ لە روایەتي (أبو هُریرە) دەرئەكەوێ أول كەسێ لە عەرەبان دیني (خلیل الله)ي تێك دا (عَمروی بن لحی بن قَمْعَه بنِ خَنْدَفْ) بوو، ئەو (بَحیرە) و (سائبە) و (وصیلە) و (حام)ي داناوە. ومن العجایبي بعضە علما ئەڵێن (طَیر) بەرەڵلاكردنیش لە مقولەي سائبەیە. ﴿وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ١٠٣﴾ نازانم لەو مقامە چ بنوسم ئەگەر بڵێم عقل تمییز ئەكا لە بەیني أحكامێ كە لە طرف خوابێ لەگەڵ أحكامێ بە كذب وإفترا داندرابێ، ئەڵێن ئەمە مەیلي إعتزالە، ذاتاً من لام وایە پاش تأسیس نبوَّەت حاكمیەتي عقلێ إنكار ناكرێ، وەپێش نبّوەتیش بَعضە أشیا بە بداهەت ئەزانێ باطلە نابێ إنسان قبولي كا، أما ئەو مشركانە یا زۆر ضعیف العقل بوین یا عقڵیان لێ سلب كراوە وەكي ئێمە، ئەوي مامۆستا فەرموي، وایە. معقولە نامعقولە، مستبعدە، محالە، هیچ محاكمەي عقلي ممنوعە. ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ لە كتابي مبین ﴿وَإِلَى ٱلرَّسُولِ﴾ كە مُبَلِّغە لە طرف خوا ﴿قَالُوا۟ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ﴾ آباي ئێمە لەسەر چ بوینە بەسیە بۆ ئێمە، حاجَتمان بە ارشادي كەس نیە. خوا ئەزانێ ئەمرۆش ئەو فكرە مستولیە بەسەر أذهاني عامَّە، ئەوي گوتراوە هەر دەبێ وابێ، رأي العین غلطتي بۆ دەركەوتوە، گوێي ناداتێ. ئەم عصرە پێی ئەڵێن عصري (نورە) عصري علم وعرفانە مع أنَّهُ لە هەزار كەس نۆصەدو نەودو نۆ ونیوي هەر لەسەر فكري پێشون. ئەو علم وعرفانە ئەكەنە علمي شَیطاني، مُزخرفاتي خۆیان ئەكەنە علمي رەحماني، سَوادي أعظمیش دوایان ئەكەوێ، ألآنَ كانَ كما كان ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا﴾ لە هیچ ناگەن، ئەوي دایان ناوە لەسەر

مُقتضاي عقل نەبووە ﴿وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾﴾ بە آياتي خواو بيّناتي پێغەمبەران بەرێوە نەرۆيشتون وەناڕۆن ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ تا لە صحت وعافيەت دان ﴿عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ ئاگاداري نفسي خۆتان بن زۆر مُقيّد بن مُتخلّق بن بە أخلاقي كريمە، سەررووشتەي عقل لە دەست خۆتان مەدەن، سَلّمَه السلام زمامي خۆتان تسليمي ئەو وئەم مەكەن، مەينە پاپيلكە. زاتاً لەو رووەوە توانيان خەرافات داخلي شرايعي إلاهي بكەن ﴿لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ﴾ ئێوە كە بەرێی راستا بڕۆن ايمانتان صحيح وأعمالتان صالح بێ، ئەوي گومراه بێ ولَوْ خەريكي إفساد بێ، زەرەر بە ئێوە ناگەيێنێ. ديارە مقصد تركي أمر بە معروف ونهي لە مُنكر نيە، سعي بۆ هدايەتي مسلّمانان، لەسەر مسلّمانان لازمە، ئەويش كەسێ تێ فكرێ لە وەحدەتي إسلاميەت، ئەزانێ داخلي (عليكم أنفسكم)ە مع أنه أمره بۆ كُلّي مسلّمانێ إصلاحي نفسي خۆی بكا. كەوابێ حاجَت بەهەرا هەراي (تَقّالان) ولاداني آيەت نيە. ﴿إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ﴾ مبدأ خوايە، گەڕانەوەتان بۆ لاي خوايە ﴿جَمِيعًا﴾ هەموو ضالّ ومهتدي ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾﴾ لە دونيا چتان ئەكرد سرّوعلن ظاهرو باطن خبرتان ئەداتێ بە جزاي چاك وخراپ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ لە حالي نێزيكي (مَوْت) وبدأي گەڕانەوە بۆ طرفي حەق ئاگادار بن. ئەوەي لە سەرەمەرگەوە وەصيّەت بكا ئەگەر منالّ وپالي هەبێ (وەصي) دانێ ئێوەش حاضر وئاگادار بن بۆ وَصيّت وصايەت ﴿شَهَٰدَةُ بَيْنِكُمْ﴾ شهادەت بە معنا إحضار وقضاء وحكم وسوێندو علم وإيصاء، يعني سەر وَصيەت دانان هاتوە ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ﴾ نێزيك بوو لە مردن لەسەر جێ و مَاواي خۆی ﴿حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ﴾ بەمالّ يا حِفظي أولاد﴿ٱثْنَانِ﴾إحضاري دووكەس﴿ذَوَا عَدْلٍ

﴿مِّنكُمۡ﴾ له خۆتان یعني (مؤمن) چونکي خِطاب به عنواني إیمانه جمهور واي تفسیر ئەکەن. له (حَسَن) و (عِكْرِمَة) روایەت کراوه تفسیر به (خـزم) نـەوەك توشي شاهدي أجنبي بن. له تفسیرێك عدل به أمانَت وعَقل تفسیر ئەکا لام وایه له دەوري صحابان (عدل) به ملکەیه که منعي صاحِبي بکا له گوناهي کبیره وإصرار له صغیرەی خسیسه وخِلافِ مُروَّت، نەزاندراوه، إصلاحێکه له بەیني (أصولي) و (فقهاء) داندراوه وەإلاّ ئەو نوعه عدالەته له غایەتي نُدرەتـه، نـەك ئەمڕۆ هەزار ساڵ له پیش ئـەمڕۆ زیـتر. ﴿أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ﴾ لەهاو دینتـان نەبێ ولَوْ (ذِمّي ووَثَني ومَجوسي) بێ، ئەوه قَولي (ابن عباس) (وأبي موسی ي أشعري)یه، وەمختاری (سعیدي بن مُسَيَّب وإبراهیم نَخَعي وه سَعیدي بن جُبَيْر وه مجاهد وعُبَيْد)یه.

﴿إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بـه سَـفَر چـون ﴿فَأَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِۚ﴾ دیاره مردني مسلمانێ لـه دیـاري غـریبي خصـوص هـیچ هـاورێی دیـني خـۆی لەگەڵ نەبێ، زۆر مۆلمه، حزن ئەدا به هـەموو ناسـیارو گوێ دەران کأنّـه ئـەو مصیبەته إصابەي هەموانی کردیه، بۆیـه لێـره بـه گـوێرەي عبارەتـي پێشـی نافەرموێ (فَحَضَر أحدکم الموت) ئەوه له زەماني قـوّەتـي رابطـه ي أخـوّەتـي إیمان بێ شکه، وەئەمڕۆش لەگەڵ سستي ئەو رابطه ئەم زێـده تـأثره لـه دلـي مسلمانان داهەیه. ﴿تَحۡبِسُونَهُمَا﴾ رایان بگـرن ﴿مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ لـه پـاش نوێژو طاعەتي خۆیان که هاتن و کَیفیەتیـان بـۆ بـەیان کـرد ﴿فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ﴾ سوێند بخۆن به خـوا ﴿إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ﴾ شـکتان بـو لـه راسـتیان ئەمـەش بلێـن ﴿لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ﴾ به سوێند ﴿ثَمَنٗا وَلَوۡ كَانَ﴾ ئـەوەي سـوێندي بـۆ ئـەخۆین ﴿ذَا قُرۡبَىٰ﴾ خزم بێ مختاري حقیر له مەیاني أقوالي مُفَسرين ئەمەیـه: (کـه ئـەو طول و تفصیله بۆ شهادەتي أجنبیه، أما مسلمان کـه لـه داري غُربَتْ رەفیقـي نەبێ نه درۆ نه خیانەت لێی تصور ناکرێ، وه ئەو حکمـه بـەو نوعـه صـورەته

ثابته، منسوخ نیـه). ﴿وَلَا نَكْتُمُ شَهَـٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْأَثِمِينَ ﴿١٠٦﴾﴾ ئـەوەش ئـەڵێن زێـدە تـأكیـدە ﴿فَإِنْ عُثِرَ﴾ إطّلاعـي بـوو ﴿عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا﴾ ئـەو دوو كەسـە أجنبیه سوێند خۆرەكان ﴿ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا﴾ بەواسطەي درۆ لە أداي شَهادەت بـە وَصِیَّەت یا خیانەت لە ماڵ. ﴿فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا﴾ دووكەسي تر دەچـنە جێی وان بۆ سوێند خـواردن، ئـەو دووكەسـە ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ﴾ لـە أولیـاو ورثـەی مَـیّتي ﴿ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَـٰنِ﴾ بـەواسـطەي وان ئـەو دوو شخصـي سـابق تووشي گوناه بوین كە أولى بوون بە مردیەكە لە هەموو كەس، ئەو ذاتە ئەواني بە أمین زانیە لاي وان وصَیەتي كردیە وە مالـي تسلیم كردنیـە وەكـي (فخـري رازي) ئەفەرموێ. یا أولى ترن بە سوێند چونكي منكري كذب و خیانەتن وەكي مرحوم (سَیِّد رَشید) ئەفەرموێ. أما لـە پـاش سوێندي سـابق إطّلاعـي بەسـەر گوناهیان دابوو (وثوق) بە سوێندیان نەماوە. یاخود ئـەو دوو كەسـە كـە حـالاً دێن سوێند بخۆن أولى بن لە مەیاني (وَرَثە) بە (مَیّت) لە هەمویان نێزیـك تـرین یا أفضل و أعلم بن یعني أولى بن بە سوێندو شَهادەت لەبـەر (تَقْـوا). وە أوَّلـین خوێندرایەوە لە قِراءَتێ معتبر ﴿فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ﴾ ئەو دوو ذاتي آخر واش بلّێن ﴿لَشَهَـٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَـٰدَتِهِمَا﴾ ئـي ئــەو دووي سـابق ﴿وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ﴾ ع ظلمـان لـەوان نەكردیـە بـەو إتِّهامـە ﴿إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٠٧﴾﴾ وە ئـەوي مسلّمان بێ تجاوز لە حدودي حەق ناكا وَلَوْ دەربارەي غیرە دین بـێ. ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوي ذكركرا ﴿أَدْنَىٰٓ﴾ نێزیك ترە لەغَیری ئەو تصویرە. ﴿أَن يَأْتُوا۟﴾ ئەو شاهدانە ﴿بِٱلشَّهَـٰدَةِ﴾ لەسەر وَصِیَّەت وەسوێند لەسـەر أمانـەت ﴿عَلَىٰ وَجْهِهَآ﴾ چۆن بوە واقعەكە، بەو نوعە بـەیانـي بكـەن. ﴿أَوْ يَخَافُوٓا۟ أَن تُرَدَّ أَيْمَـٰنٌۢ﴾ بـۆ لاي (وَرَثـە) ﴿بَعْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ﴾ لە پاش سوێندي وان، كە زاناندیان إعتبار بـە سـوێندي (ورثـە)

هەیە ئەترسن لە ئابروو چوون. لە پاش تبیانی ئەو حکمەتە حەق نەبوو إختلافیان ببیٚ لە قبولي شهادەتي أجنبي وە سوێندي وارث، (وقعهي زە ماني رسالهت و أبو موسی ي أشعري لە تَبیض ی مداد ذکر ئەکریٚ إنشاالله). في الحقیقة ئەو آیەتە زۆر مشکله صاف کردني معناي غایَت صعبه خاصةً پاش إختلافي أئمەي تفسیرو فقه إعراب لەگەلٚ قراءَتي (أوْلَیان و أوَّلین)، بۆیە (إمامي رازي) ئەفەرمویٚ: (إتفاقي علماي تفسیر هەیە کە ئەو آیەتە لە غایَتي صعوبت دایە لە جِهَت إعراب ونظم وحکم)، وە لە إمامي (عمر) نقل کراوە فەرمویەتي: (ئەو آیەتە أعْضَلُ ما في هذا الصورةِ مِنَ الأحکام)، في الحقیقة جَنَّة مکاني (سَیِّد رشید) بیٚ دادي داوە تحقیقات و تدقیقاتیٚ زۆر شایاني هەیە با أربابی حَواشي إنشاالله بیکەن بە حاشیه. ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لە هەمو حالان ﴿وَٱسْمَعُواْ﴾ بە گویٚ لیٚ بوني إجابَت و إطاعَتْ، ئاگاداربن، لە إطاعە دەرمەچن. ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ قومیٚ لە إطاعَت دەرچن خوا بە (جَبر) هدایەتیان نادا، عبادي خوا لە رُشدو ضَلال مُخَیَّرن، ایماني إختیاري ونَظَري مقبولە، نە إجباري و سەرزاري. بۆ ئەوانەي لە إطاعە دەرئەچن بە واسطهي قَرابَت لە رُسُلي کرام وە إعتماد لەسەر تکاي ئەم و ئەو، وقعەي (عیسی) و غیرە وەزیرە ذِکر بکە.

﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ﴾. هەمویان لە (آدەم) یا (نوح) تا (محمد)، أما قادیاني وبهائي ئیٚراني لەگەلٚ وان نین ﴿فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ﴾ دەعوەتي أُمَّتي خۆتان کرد؟ جوابیان چ بو؟ یا بە چ بو؟ حضرەتي کبریائي أعلمه فائدەي سؤالي لە جوابي رُسُل دەردەکەویٚ ﴿قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآ﴾ ئەو جوابە لەو مَوقفە دیارە بیٚ تَجَوّز وتأویله وە دیارە لە دەهشەت نیە لە هۆش وگۆشی تەواوە، نابیني ئەفەرمون ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾﴾ ئیٚمە إطّلاعیمان بە (ما في الضمیر)ي ئەو عالەمەدانیە، دەرەجەي إیمانیان، خلوصیان، یەکە یەکە، سِرّو علنیان، بە عمومي وتَفصیل، هەر تۆ ئەیزانی، خصوصاً ئەوانەي پاش وەفاتیان هاتونە

دونیا بە تەواوي أحوالّیان نازانن. ئەوانەي إدّعاي إطلاعي بەسەر أسراري عالەم وما في القلوب ئەکەن گوێیان لیٚ بیٚ، ئەوانەي بەنسبەتي نسبي مغرورن بێنەوە هۆش تیٚ کۆشن بەخَیالات خۆیان نەخەڵەتێنن. ﴿إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ﴾ بە خصوصي خطاب لەگەڵ ئەو ئەکا لە مەیاني رُسُل تاکو بە تەواوي فضیحەتي ئەوانەي کە إدّعاي ألوهیەتیان بۆکردیە، دەرکەویٚ. لە أتباعي رسل غَیرِي وانْ کەس ئەو هَذَیانەي دەرحەق بە پێغەمبەري خۆي نەکردیە. ﴿ٱذۡكُرۡ نِعۡمَتِي عَلَيۡكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ﴾ لە تذکاري ئەو نِعمَە تَوبیخي ئەوانەي کە إیمانیان پیٚ نەهێنایە، تیایە، وأسُّ الأساسیش إتهامي دایکي بووە ﴿إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ﴾ مَلَکي وَحي کە (جبریل)ە ﴿تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ﴾ بە مندالي لە باوەش دایکت شَهادەت لەسەر براءَتي ئەدەي ﴿وَكَهۡلٗا﴾ قسەي زەماني مندالي تو زەماني قوەتي إدراکت فَرقي نەبوە، پر حکمەت ومُشتمِلْ لەسەر وەحدەتي إلاهیە ﴿وَإِذۡ عَلَّمۡتُكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ نوسین و حقایقي أشیام فێرکردي ﴿وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ﴾ زانیت (تَورات) حەق وباطلي تیایە، ئەوەي لە طرف غیري خوا هاویشترایتیٚ، خەبەر دارم کردي. لە هەموي أعزب ودوورتر لە وَحي سَماوي قانوني (بَرَص) ▪ مَحروم کردني کۆرانە. خۆزي بم توانیبایە فصولي قانوني (بَرَص) م لێرە نوسیبایە.

رجا ئەکەم تەماشاي (کتابي مُقدَّس) کەن کە بەو نێزیکە لە عاصمەي (حامي دین یَسوع) بە فارسي ترجمە کرایە وەلەچاپ درایە، سبحان الله ئەو نوعە خرافاتە ئەکەنە کتابي مُقدَّس، بە قرآن ئەڵێن درۆیە، إنجیل أصلاً تدوین نەکرایە، ئەو أناجیلي ئێستا هەن، بەوَحي ناچیٚ. ﴿وَإِذۡ تَخۡلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ﴾ خلق داناني مقداري شتێکە کە دروستي بکەي لە خَیال یالە خارج ئەوەش یادکە، لە قوڕ شتەکت دروست دەکرد، وێنەي طَیري حتّا ئەوەندەش

﴿بِإِذۡنِي﴾ بـە تسـهیلي ئیمەیـە ﴿فَتَنفُخُ فِيهَا﴾ لـەو هَیئـەتـە ﴿فَتَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِيۖ﴾ ئـەبوە طـیر ﴿وَتُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ﴾ چاوپړوپوشـاوي ﴿وَٱلۡأَبۡرَصَ﴾ بەڵەك ﴿بِإِذۡنِيۖ﴾ تا تەماشاي تَوراتم نەكرد زێده له أمراضان تبریەي ئەو دووەم نەدەزاني. وَمِنَ العجایبِ مرحوم (سیّد رشید)یش تعرضي بۆ نەكردیـە نـە لێره نـە لـە (آل عمـران) ﴿وَإِذۡ تُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِيۖ﴾ مـردي زیندیكردنـەوە شـتەكـي هەندە ئاسان نیە وەكي نَقّالان وإسرائیلیّون حكایەت ئەكەن، لە نظري وان وەك فوو له هەمباني چەقوكەریە. لەویّ رۆژي خوا حیواناتي خلـق كردیـە تـا ئـەمرۆ خۆی بو إختیاري خۆی هیچ مردي زیندي نەكردیتەوە، أما له نظري نَقـالان كـە معجزە یا كرامَت هاتە كۆڕیّ، ئەوە مەپرسە، بە مَلایین مردي زیندي دەبنـەوە. بەڵیّ من ایمانم هەیە بە قُدرەتي خوا وە ایمانم هەیـە بـۆ (حَشـر) إنسـان زینـدو ئەكاتەوە، وەكي خۆی فەرمویەتي، وەایمانیشم هەیە لَدی الأیجاب بـۆ بَعضـە رُسُل مردي زیندي كردیتـەوە بـۆ حضـرەتـي عیسـی بـووە، أمانـە وا بـە زۆري حِكَـایـەت خوانـەكان ئـەیلێن، وەنـە مردیـەكـي قـدیم وەك (سـامي كـوري حضـرەتي نوح) ئیشی خوا وڵو بە طریقي وجوب نەبیّ، أمـا ئـەبیّ بـەجیّ بـیّ ﴿وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذۡ جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ مـع أنّـە هـەموویا عَدوت بون وەظاهراً ئـەیان تـواني بتكـوژن عـذابت دەن، كـەس نـەبوو ناصـرو معینـت بـیّ، غـیري خـوا. ﴿فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ﴾ نەبیسـتراوە كـەس لـە بَـني إسرائیلي ئەوانەي آیاتي بـۆ إظهـار كردبـوون ایمانیـان هێنـابیّ. إحتمـالي هەیـە بعضـیَك ایمانیـان هێنـابیّ، خۆیـان ئاشـكرا نـەكردبیّ. ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ١١٠﴾ سِحریّ ئاشكرایەو بەس چیتر نیە. ئەمە زۆر سەیرە أغلب كەس كـە شـتیّ غریبیـان دیت ئـەڵێن ئـەوە سِـحرە، أمـا نـازانن سِـحر چـیە كأنّـە مقصودیان ئەوە شتیّ بیّ أصله له طرف خَواي نیە، لەو جملـەدا تَـوبیخي بـني

إسرائيلي تيايه. ﴿وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ﴾ هاويشتمه دلّيان (حَواري) له أصلى زوباني عَرَبي به شتي سپى رەنگ وخاوێن ئەڵێن بۆيه به كەسێ دوست بێ بێ غَلّ وغەش ئەڵێن. ﴿أَنۡ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي﴾ كه (عيسى)يه ﴿قَالُوٓاْ﴾ قَولێ مُناسبي وَحي ﴿ءَامَنَّا﴾ بێ توقف. ذاتاً ئەوەي به وَحي بێته دلّ وەك بَديهي جوابي بێ جێ له مقابلدا ناكرێ. ﴿وَٱشۡهَدۡ﴾ ياربّنا ﴿بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ ١١١﴾ مُنقاد وفەرمان بەردارين.

﴿إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ﴾ ئەمەش يادكه تشكري ئەم نعمەتەش بەجێ بێنه. ظاهر وايه ئەمەش له رۆژي قيامەت له مَشهدي رُسُلْ بفەرموێ، سبحان الله لەو نظمه وقعەێ خوا ئەزانێ كەي دەبێ تصوير ئەكا بۆ پێغەمبەر بۆ ئێمه كأنّه واقعه. وه لەمەياندا واقعەێ ذكر ئەفەرموێ كه واقعه بەو نوعه هۆندنەوە. وەممكنه به مناسبه لەو مقامه ذكر كرابێ باله قيامەت نەشي فەرموێ (أيّاً كان) قوەتي إنتظام هەر له جێى خۆيەتي. ﴿يَٰعِيسَى﴾ بەناوي خۆيان نِدا كردە، يا چونكي له أوائلي ايمان بوين، ياخود ئەم تكلفاتي ألقاب وتعظيماتي عبارەتي لايان نەبوە، ئێستاش ئەو فَخْفَخه و بَخْبَخهي لاي ئێمه هەيه لاي أقوامي راقيەي متمدن نيه ﴿ٱبۡنَ مَرۡيَمَ﴾ ذاتاً هەموو كەس هەر به إبني مريمي دەزانێ، واته تعبيراتي (أناجيله) گشتي إفترايه به حواريەكان. ﴿هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ﴾ ئێره لايان كەمێ به گرفته، ئەگەر ايمان دارن چۆن ئەڵێن: (ئايا خواي تۆ ئەتوانێ) ﴿أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ خوانێ بەسەر ئێمەدا بنێرێ له ئاسمان، وەقسەيان زۆر لێ كرديه، لكن ئەمانەو خۆيان. له جوابى ﴿قَالَ﴾ عيسى ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لەو نوعه إقتراحه چاوتان له (أديم)ى أرض بێ. سعدي ئەڵێ:

(أديمي زَمني سُفَري عامي أوست
بَراني خوان بَفَرما چ دوشمن چ دوست)

﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ١١٢﴾ ئەلّبەتە كەسێك ایماني به قوەت بیّ حاجَت بە تجربە ناكا. ﴿قَالُوا۟﴾ (معاذ الله) شكمان له قدرەتـي إلاهـي نیـه. ﴿نُرِيدُ﴾ أولاً ﴿أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا﴾ طعامـیّ. حَلال وزولال ومُبـارەك رأْسـاً بـیّ لَمسـي بَشَـر لـه طرف خوا، بیّ، بیخوّین. حقیقةً ئەمه تاسوخ ئەكریّ، وەهاتـني ئـەو طعامـه بـیّ دەست لیّ داني بَشَري، زۆر مناسبه لەگەلّ بوني حضـره تـي عیسـی. ثانیـا ﴿وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا﴾ هەمو حَواسمان وەك سمـع مُشاهدەي آیـەتـي إلاهـي بكـا. ثالثاً ﴿وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا﴾ به علـم الـيقين. رابعـاً ﴿وَنَكُونَ عَلَيْهَا﴾ لەسـەر نـزولـي مائـده ئـەوآیەتـه خارقـه بـۆ قواعـدي مقـررەي طبیعَـت. ﴿مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ١١٣﴾ له (مِنْ) وادەرئەكەویّ ئي دیش حاضر بوین، یَعني ئێمه تـاكو جملەي شاهدان شهادەت بدەین لاي بَني إسرائیلي، ئەوانەي كه حاضر نەبوین. ﴿قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ پارایـەوه لەبـەر خـوا ووتـي ﴿ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ﴾ خوداوەنـدي ئێمـه ﴿أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ وەكـو ئەوانـه إقتراحیـان كردیـه. ﴿تَكُونُ لَنَا﴾ ئەو مائدەیه ﴿عِيدًا﴾ جەژن ﴿لِّأَوَّلِنَا﴾ ئەوانەي ئێسـتا ایمانیـان هەیـه ﴿وَءَاخِرِنَا﴾ ئەوانەي لەمەو دوا ایمان دێـنن، یعـني ئـەو رۆژه كـه مائـدەي تیـا نزول ئەكا، ببیته جەژني عمومـي. ﴿وَءَايَةً مِّنكَ﴾ ئەمانـه پیّـی مُطمئنُ القلـب بن، یعني آیەتیّ كه ایمانیان نێزیك كا له ایمـانیّ عَیـاني، لەبـەر غایـەتـي ظهـور وئاشكراي. ﴿وَٱرْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ١١٤﴾ ﴿قَالَ ٱللَّهُ﴾ جەنابي حەق فەرموي ﴿إِنِّى مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ﴾ ئەمه آسـانه، مـن مائـده بـۆ ئێـوه ئـەنێرم، نـەجاریّ بلّكـو زۆر كەرەت أما شرطيّ هەیه كه إشـارەي بـۆ ئـەكا بـەم فەرمایشـه ﴿فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ

مِنكُمْ ﴾ لەپاش ناردنی مائدە ﴿فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ﴾ ئەوکەسە ﴿عَذَابًا﴾ جەفایێ ﴿لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ﴾ بەو عذابە ﴿أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾﴾ أوّلـین وآخـرین، یـا إي زەمـانـي خۆیان، یا پاش ئەو عذابە. لەو أناجیلي ئێستا بەدەستەوەیە باسي ئەو مائدە نیە، زۆر نێزیکە لەو أناجیلانەي إبطال کراون، بووبێ. وەعُلماي ئێمە خلافیان هەیە أکثر لەسەر ئەوەن کە نازِل بوو، ئێمەش ئەوەي قبول ئەکەین، أما خلافیان زۆرە لە أطعمهي سەرخوان، بعضێ زۆر عجایبیان رازاندوەتەوە، أما ئەوە لاي ئێمە بێ قیمەتە، ئەوەندەي خوا فەرمویەتي لە (قرآن)، کافیە. خۆراي نیە زێدەي نەفەرمووە. رەحمەتي خواي لە (إبْنِ جَرِیر)ي مُفَسِّر بێ ئەڵێ: (هەندەکي خواردن لەسەر بووە، أمّا ئێمە تعیني ناکەین، زاناندني نفعي تێ دا نیە، نەزاندنیش زەرەر نیە). وەئەشڵێن پاش نزولي بعضێ إنکاریان کرد گوتیان (سِحر)ە، بونە مەیمون وبەراز، ئەوەش لاي ئێمە معلوم نیە. وەئەبێ (عالَمین) تخصیص بکرێ بە غَیري (أوَّلین)، زێرا لە أسلافي کرامیشیان بعضێ بوون بە بەرازو مەیمون. وە (مجاهد) و (حَسَنْ) ئەفەرمون: (مائدە نەهات، ترسان، ووتیان، نامانەوێ) هاتوە، نەهاتوە، چي لەسەر بووە، چي لەسەر نەبووە، ئەوانەي خواردیان چیان لێ هات، ئەواني پاش إنکاریان چیان بەسەر هات، خۆماني پێوە ماندي ناکەین. تەماشاي ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ﴾ إلخ، ئەکەین، چونکي (غایة الغایة) لەو جمع وما جرایە، لەو سؤال وجوابە دایە. ﴿ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئایا تۆ وتوتە من ودایکم قبول کەن بە خوا لە وەحدانیەتي إلاهي وعبادەتي خاصي ئەو روو وەرگێڕن، عبادەتي ئێمە بکەن. ذانێ هەیە لە عَیسوي ناوي (راجِن)ە قریبي سي(٣٠) ساڵ ئەبێ محبتي مني هەیە زۆر مخلِصە وەإنسانێ بە فضل وعرفانە خەرافاتي (یسوع) یاني لە دەماغ دانیە، ووتي: ((مـن مـلازمـي خدمـەتي سلیمان بەگی جلیلي زادەي موصلي بووم زۆرم إستفادە لە صُحبەتي ئەو زاتە گەورەیە ئەکرد، شەوێکی رمضان پاش طَراویح لە سَلاملغي ئەو قرآنیان ئەخوێند ئەویش

بۆ کاریٚ تشریفي لەلاي دائرەي حرم بوو، یەك لە قرآن خوێنان ئەو آیەتەي خوێندەوە بعضیٚ مەلاش لەویٚ بوون سۆالم لیٚ کردن لاشَك (قرآن) ئەوەي واقع ومحقق نەبیٚ نایڵیٚ وەکەس لە ئێمە عبارەتي (مَریم)ي نەکردوە ئەمە چیە؟ ئەوانیش لەبەر بیٚ إطلاعي جوابیان نەبوو، (بەگ) تشریفي هاتەدەر ووتي إعتقادت لە حەق (فَلائِل رَق) خۆتان چۆنە؟ ووتم (قسەي معتبرە موثوق بِه)یە، چۆوە زۆر رسالەکي ئەوي هێنادەر تیاي بوو کە قَومیٚ لە عیسَوي عبادەتي (مَرْیَمَە)ي کردووە بە شعار وە معبدیان بۆ دروست کردیە)).

حاصلي ئەمە بیٚ شکە وەپێی ئەڵێن دایکي خوا، طبیعي دایك أصلە ولد لەوي پاش ئەکەویٚ. مرحوم (سیِّد رشید) لە کتبي مُعتبرەیان نقل ئەکا لە کنائسي شرقیە بەڵکو غربییەش عبادەتي مریمەیان بەنوێژو رۆژي کردوە وەإعتقادي چراي غَیبیان پیٚ هەیە وە ضَرٌ ونَفع ئەدا بە واسطەي کوڕي یامُستقل. وەئەمڕۆ شرق وغرب تعظیمي صورەتي سَیِّدة مریمە ئەکەن غیري (پرۆتستانت) بە عمومي.

﴿قَالَ﴾ عیسی ﴿سُبۡحَٰنَكَ﴾ پاکي وتَنَزُّه وقُدسیەت بۆ تۆیە، لە ئارایشي شِرك دووري ﴿مَا يَكُونُ لِيٓ﴾ نابیٚ ممکن نیە بۆ من ﴿أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ﴾ شتەکي بلێم کە حەقم لێی نیە، ألوهیەت وحقوقي ألوهیەت خاصي حضرەتي کبریائیە، کەسیٚ وەکي بەندەي ضعیف لەسەر ئەو هەمو لطف وعنایەتە دەعوەت بۆ خۆی ئەکا؟ خەڵکی ئەهێنێتە سەر شِرك وگومراهي؟ ﴿إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ﴾ ئەگەر من ئەو قسەم گوتبیٚ ﴿فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ﴾ خۆت زاناندووتە ﴿تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي﴾ سرّي من وخفاي نفسي من ئەزاني ئەمە بە وەهم وخیاڵیشم دا نەهاتووە ﴿وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ﴾ ئەمن أسراري غَیبي تۆ نازانم، مادام من جاهل بم چۆن ئەڵێم ممکنە خوابم؟ ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ١١٦﴾ حقیقةً هەرتۆ علمت بە أسرار وخفایا مُحیطە هیچت لیٚ بزر نابیٚ. نازانم ئەوانەي

ئە لێن قُطبي فرد علمي وەك علمي خوايە لەو آيەتە ئەڵێن چى؟ شكم نيە نازانن كَيفيهتي علمي خوا چۆنە، أما تصوف هەموو دەركەي جهالَتي بۆ مسلّمانان كردەوە، تالە مەيانيان دا صۆڤي (أحمدي قاديانـي) خـۆى بـە نَبيّ ومسيحي منتظر لە قَلم دا.

﴿ مَاقُلْتُ لَهُمْ ﴾ هيچ شت ﴿إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ﴾ ئايا ئەتو أمر بە شِرك ئەكەي؟ چۆن ئەبێ؟ ﴿أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ﴾ لاشَك ئەگەر لە عبادەتي عيسى (أبـي وأبيكُم) هەبێ (ربّى) پێ مـرادە. ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ﴾ تـا من لـە ناويان بويم ئاگاداريم بەسەريان دابووە، ئەوان بە غيري عبادەتي تۆ، عبادەتي كەسيان نەكردووە، من ودايكميان بە عبدو جاريەي تۆ زانيووە ﴿فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى﴾ لێرە (قادياني) وسائري علماي إسلامي ومسيحي نزاعيان هەيە. ئەمرۆ شِدّەتـي خِصامە، قاديانـي ئـەڵێن مرديـە بـۆ ئاسمـان نەچـووە بـەدزي هـەلاّتووە پـاش چەندێ لە (كشمير) وەفاتي كرديە ﴿كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ﴾ هەر تۆ مُطّلِعـي أحوالّيان بوي، من هيچم ئاگا لێ نيە. ديارە ئەگەر ماش بـێ، ألآن هـيچ ئاگـاي لە أُمّتي خۆى نيە.

لەو جِهەتە ژيان ومردني وەك يەكە. من خۆم بەو هەرا هەرايە ماندي ناكـەم، ئەوەندە رجا لە مسلّمانان ئەكەم بۆ إصلاحـي حـالـي خۆيـان إنتظـاري نـزولـي (عيسى) وخروجي (مَهدي) نەكەن، خۆيان تـێ كۆشن لە ذِلّت دەرچن، ئـەوەش ديارە بەچى ئەبێ، بـە إتفـاق وإنفـاق وإخـتراع ئـەبێ. ئەوەنـدەي بـە معنويـات خۆيان خەريك ئەكەن مقابلي دوشمن خۆيان بە مادّيان خەريك بكـەن، بـێ شـك سەرئەكەون وەإلاّ فَلا.

﴿وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ﴾ نەتـەنها مـا في الـنفس وأحـوالاتـي أُمّـتي مـن هەرچـى (شَـيءً) بـێ ﴿شَهِيدٌ ۝١١٧﴾ ئاگـاداري وإطّلاعـت پـێ هەيـە. ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ﴾ بەندەي تۆن بێ دەسەلاّتن كەس نيە نجاتيان بدا، كە وابێ با هەر لەو

رووەوە فكري فِديە إعتماد لەسەر شفاعت لە دەماغيان بچێتە دەر، بۆ كەس خۆيان لە خوا نەكەن. ﴿وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ﴾ لەگەڵ ئەو كفرەي كەپرە لە جَهل وحماقەت ﴿فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ﴾ غالبي قومي ﴿الْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾﴾ شتي بێ هودە ناكەي. خودا ئەو خودايەيە وەك سعدي ئەڵێ:

(نەمُستَغني أز طاعَتَش پشتي كَس
نەبر صرفي أو جاي أنگُشتي كَسْ).

ئەوي مشرك بێ ئەوي إنكاري خوا بكا هەر عَبدە لە مُلكي خوا دەرناچێ، ئەگەر حضرەتي حەق لە هەمو كافران خۆش بێ كێ زەرەر ئەكا؟ زەرەر بۆ خوا نيە، ئێمەش لە بەهەشت پێك ناكەوين عداوتمان نامينێ. ئەگەر من قسەم هەبا ملحدو شركەكانم ئەدا موحدِّكان لە (جَنَّة) وەك كەر إستخداميان كەن، بەلاّم ئەوانە خۆيان لە خوا كرديە رابطە ي بَيْني خۆيان وخوايان بريوە، ئيتر وَصل ممكن نيە، وە مقصدي (عيسى) (عليه السلام) شفاعت نيە حاشا بەڵكو بەياني حقيقەتي حالە كە خوا مالكي رۆژي جَزايە كەس دەسەلاتي هيچي نيە.

﴿قَالَ اللَّهُ﴾ لە ختامي ئەو جمع و سؤال وجوابە ﴿هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ الصَّادِقِينَ صِدْقُهُمْ﴾ ئەگەر لە دونيا بعضە إنسان بەدرۆ دەلەسە قورتار ببێ، لەو رۆژەدا درۆ كەڵك ناگرێ، ئەو رۆژە رۆژێكە راستي نفع ئەداتە راستان، وەكي لە كوردي ئەڵێ (ئەگەر راستي رەوتي ئەگەر چەوتي كەوتي).

﴿لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ قَط نامرن ليێ ناچنە دەر نابرێ ﴿رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ خوا لەوان راضيە، ئەوان لە خوا راضين. كەسێ كە ايماني صادق بێ غَلّ وغَشّي نەهاوێتێ، ئەوي سببي رقي خوا بێن يا هەر ليێ صادر نابێ، ياخود زوو تَلافي ئەكا، بۆ إستجلابي رضاي خوا تێ ئەكۆشێ. ﴿ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١١٩﴾﴾ رَضامەندي خوا يا لەگەڵ ئەو دخولە مَذكورە، نَيْلي گەورەيە بە مقصود ومطلوب گەرچي رضامەندي خوا لە فوقي

هەمو مطالب ومقاصدە.

﴿لِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ﴾ کەسێ حەقي مالکیەتي نیە، هەر ئەوە خالقي کُل، مُدَبّري کُل، مُتصرفي في کُلّ شيءٍ. عیسی وغیري عیسی ذەررەیەکە لەو مُلکە عظیمە ﴿وَهُوَ﴾ خوداوەندي أرض وئاسمان و ئەوێ لەوانەدایە. ﴿عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ١٢٠﴾ کەشیئ بێ، نەك أوهام وخَیالي سەوداوي وخیال پەرستان بێ، وەلازم نیە هەرچی قدرەتي بەسەردابێ، بیکا، ئەوي بیکا، بە إختیاري خۆی ئەیکا، ئەوي نەیکا بە إختیاري خۆی نایکا، با خالّیش نەبێ لە حکمت ومصلحت.[1]

[1]- تەواو بو تفسیري سورەي مائده لە رۆژي سێ (٣) شەمو ٢٣ رجب موافقي ٩ تشرین أولي رۆمي. أما قریبي چوار مانگە چیمان نەنووسیووە لەبەر مشاغل وآلام وغموم. وە غەمي لە هەمووي گەورەتر غەمي وەفاتي (سیّد رشید رضایە) حەقّا مردني ئەو نۆعە مەلایە لەو هەنگامە تأسفێ زۆر ئەدا خودا لێی راضي بێ وەعلماي إسلام موفق کا لەسەر نهجي ئەو تفسیري (قرآن) تەواوکەن. آمین. ١٣٥٤ هجري.

## سورەتي الانعام

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾

سورەي (أنعام) ئەلێن ئەو سورەتەش هەمووي تێكڕا نزولي كرد، بعضێ سێ بعضێ شەش آيەت إستثناء ئەكەن. كەسێ گوێی لە آيەتي نهايەتي سورەي مائدە بێ وە بەتأمل تەماشاي مَلَكوتي آسمان وأرض وئەوەي لە بينيان دايە، بكا، خاصةً لە أربابي حدس وخَيَالي هَندَسەي بێ، لە عجايباتي ئەو ملكە عظيمە لە ترتيبي نسجي ئەو أجرامي متجاذبە ومتدافعە فكرێ ئەزانێ، موجد وناظم وواضعي ئەو كائناتە، كەسێكە فوق الكُل فوق الطبيعة قاهري قواي عاتيە وعاصيەيە عَلِم وقَوي و قادرە، ئەوجا لە دڵی صاف بێ غَلّ وغەشّ و دەغدەغەي شِرك بێ فاصِلە ئەڵێ ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ أما بۆ إشارە بۆ إهتمامي مندرجاتي مابَعد، ئەو جملە مُتَّصِلە، إبتداو تَيَمُّنْ بە إسمي خوداوەندي رەحمان و رەحيم ئەكا. ئەوي لە هەورازە پێ ئەڵێن (آسمان)، تعريفي آسمان كە علماي هَيْئَەت ئەيكەن لە پێغەمبەري معصوم وەرنەگيراوە تامخالفەی دروست نەبێ.

فَلَكيّوني عصر ئەگەر بڵێن: ((جِرمٌ كُرِيٌّ يُحيطُ بِه سَطحانِ متوازيان مركزهما مركز العالم)) لە دەوری ئێمە نيە، نابێ بە سبب تَفسيق وتكفير. ئەوەي حكماي (يونان) لەحەق أفلاكيان وتيە نە خَفيفە، نە ثَقيلە، نەسارد، نەگەرم، نەهيشكە، نەتەرر، قبوڵی دڕان وپێكەوە نوسان ناكا، لە نظر حكماي عَصر، بە هَذَيان حِسابە.

أجرامي عُلويّە لە أرضي خۆمان زیترنین مُرکّبّاتن لەو معادن و عناصرە کە عالەمي ئێمەي لێ مُرکّبە وەك أرض مُسَخَّري ناموس وقاعدەي طَبیعەتە. تەمامي ئەوەی لە إعتقادي إسلامیان بوەشێتەوە، ئەوەیە. أرضیش بێ قیمەت نیە، گەر حَسْبَ الحِسْ بە سُفْلي ئەزانین، ئەویش داخلي زُمرەي عُلویاتە بەلکو بە خَیالي (یونانیان) أرض زۆر عَزیزە، فلك الأعظم وما حواه لە دەوري ئەسورین طَوافی ئەکەن، فلك الأطلس کە لە فلك الثوابت مُزَیَّن ونگارە، پەردەیەکە بە دەوري أرض دا دراوە.

﴿وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ﴾ أجرامي (نَیِّرە)ي أیجاد کردیە کە شُعاعي لە أجرامي كثيفة بذا سێبەري بە جِهەت مُقابل ئەڕوا ئەبێتە تاریکي، وەئەو نووري لەو عصرە لە أرض کشف کرایە وەك ضیاي کَهربائي ورونتکین، گەرچی بعضێ دڵ ومێشکی مُنَوَّر کردیە، لکن زۆریان لە ظُلمات أوهام وخیالي أدواري مُظلمە دا ماون، قطعیاً رووناکیان پێ نەگەیشتوە. ﴿ثُمَّ﴾ مَعَ أنَّهُ لە غایەتي دووریە ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەي حەق بزر ئەکەن عقل دادەپۆسن ﴿بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾﴾ شِرك وهەمتاي بۆ پەیا ئەکەن حتّا لە عنواني خالقي وەلە وَصفي واجب الوجودي.

تاریکي ورووناکي بەو مَعناي ئێمە ئەیزانین قابل نیە کەس بلێ، خوات، یەکي موجدي خیر، یەکي موجدِي شەڕە، ئەگەر بلێن یەکیان مُنوَّرە مُظلمە، ئەوە محضي وهمە، لەبوني خَیر وشەر توهمیان بردووە، بویەش مُشرکیني (یونانی) إلاهي (سِلْم) إلاهي (طَرَبْ) بەکچی جوان ونازدار، إلاهي (حَربْ) بەزەبەللاحێ رەشي گرژي ووژ، تصور ئەکەن. مع أنّە خَلقي خیرو شەڕ، داخلي یەك قاعدەیە. إنسان وصەگ وشێرو گورگو بەرازو مامزو کەروێشك هەموو بە قاعدەیێ تولد ئەکا، لە عانێ إنسلن بۆ (مار) یان مار بۆ إنسان وەك یەك قاتلە، شەڕو شۆڕو فَساد أسبابي بوني أسبابي مدافعي دیارە، خلق وتقدیري، (آلِهِي) پێ ناوي. لەهەموي دوورتر قول بە ألوهیەتي (عیسی)یە. وەك سابقاً لە

(عضد)مان نقل كرد بعضيَ له ئێمه له ئێمەش ئەڵێن خالقي آسمان، أرضه، خوا ئەوي خلق كرديه، ئەويش عالەمي أيجاد كرديه. له بَعضيّ رسائلي خۆم وتيتم ئەم ديوه مِلّتي له عَمَل إلاّ يا تنازُلي دايه بەخوا هێنايتيه رێزەي بعضيّ له ممكنات، يابعضيّ له ممكناتي بلّند كرديه برديتيه رێزي خوا كرديتيه ما فوق الطّبيعه، ئەمانه خوا له مقامي خۆي دينن خوار، نه ممكنات له طَوري خۆيان دەرئەچن نه ألوهيەت و خَواصي ألوهيەت شركەت قبولّ ئەكا، وه إلاّ ألوهيەت نامێنێ. (حِرماني) لايان واجب الوجود پێنجن، (جەنابي حەق) عالمي بالعواقب مؤثري غير مُتأثر، (مادّه) ئەويش متأثري غيره مؤَثر، (نَفس) مؤثِر ومُتأثرة، (فَضا) و (زەمان) نه مؤثر نه مُتأثر أما وجودي عالەم پەكي لەسەريان كەوتووه.

ئەوانه نَوعه إمتيازێ بۆ خوا قەرار ئەدەن. أما (يَسوعي) خوايان هێنايته رێزەي ذەررەي حَيويّه كه له ناو رەحمي مێ ێ (نُما) ئەكا ئەبێ به (حَيَوان). سبحان الله دەعوەتي أنام ئەكەن بۆ ئەو إعتقادە، ئەڵێن: (مداري نَجاته). بعضيّ له قُدماي حُكما ئەڵێن: (ئەم أرض وآسمان ونجوم وسائري أجسام واجب الوجودة، واجب الوجود حاجەتي به خوا نيه). قسميّ ئەڵێن: (به صورەت وأشكال حادثن، به مادّه واجبن)، (يا ذه رراتي كَرّاتي واجبه كَرّاةً على طريقِ الصُّدفَةِ) تشكلي كرديه، ئەوه، مذهبي (ديموقراطيه) ئەمانه إنكاري خوا ئەكەن أما أساساً نەيان زانيوه لَوازمي واجب الوجود چيه، خواصي ممكنات چيه، تا (أفلاطون) و (أرسطو) وأمثالي وانه پێ گەيشتن، تێ گەيشتن وَحدانيەتي واجب الوجوديان تحقيق كرد (رەحمەتي خوايان لێ بێ).

﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ﴾ سوپاس وستايشي كبريائي لەسەر خلقي أرض سەر ئەكێشێته سوپاس لەسەر (خَلق)ي خۆمان، بەو خَلقي حاضره، ئەگەر أرض نەبا ئێمەش نەدەبوين، گياشين ئەبێ له أرض توخُم ئەدا، دار بەر ئەدا إنسان ئەيخوا، نطفەي لێ پەيا ئەبێ، لەرەحما ئەبێ به إنسان، كەوابێ

ئێستاش راستە بێ حمل لەسەر (خَلْقي) أبـو البشـر، خـوا ئێـوە لـە قـوڕ خَلـق ئەكا، موادي غذائيهي نبات وأشجار نەرم نەبێ وەكي هەويرو قوڕ، تۆ ناتوانـي. بيخۆي وحَلّي بكەي. ئەو خطابە خِطابە لەگەڵ كافرەكاني هەمتا بۆ خوا پەيـدا ئەكەن. لە تَطوراتي إنساني، كەس إشتراكي نيە، بە غَيري طَبيعەت، كـە إعمـال وعُمّالي ديارە، وەإكتشافاتي عُلماي طبيعي بۆ تطور وتولدي إنسـانـي مادّەيـان هێنايتە صورەتێ زۆر ظـاهر ئەگـەر شـايانـي گفـت وگـۆ بـێ، نوعاً مـا خَيـالي مُعادلەي لێ بكرێ، غَيري طَبيعەت هيچي تر أهميەتي نيە، مَحَضاً إدّعاي أوهـام وخيالاتي فاسدەيە. إنسانێ بە إنصاف تەماشاكا، ئەزانێ طبيعـەت مُسـتخدمە، عُمّالي جاهل و بێ شعورن، بێ مرتبەي عَليم وقَدير ئەمانە گردنابنەوە ئيشـيان پێ ناكرێ. إنسـانێ بـەو هـەمو دقـايقـي تركيـب وقـواي مُدركـەو فكـرو هـۆش، محصولي طبيعهتي بێ شعورو إدراك بێ. حاشـا ثُـمَّ حاشـا مُحالـە عقـل قبـولـي ناكا. ﴿ثُمَّ﴾ ئەڵێن بۆ ترتيبي ذِكريە ﴿قَضَىٰٓ أَجَلٗاۖ﴾ نوسي ومُقَدّرو مُقَرَّەري كرد أجَلي، هەر كەس أجَلكي بۆ دانا، زەمانەكەي مُعَيَّن ومحدودە، إمـراري حيـاتـي تيا ئەكا. وەلاي ئەمانە كە ئەفەرمون (نُطفَـە) كـە گەيشتە وەقـتي روح هاتنـە بەري، خوا ملائكەتێ ئەنێرێ روحي پێ ئەكاتێ وەچوار كَلِمـە بـە أمـري إلاهـي لەناو چاواني ئەنوسێ، رزق وعمل وأجَل وە شَقيە يا سعيد، ئەمەلـە صَحيحَين دايە، مەلايەكانيش قبوڵيان كرديە ئـەڵێن (ثُـمَّ) بـۆ تـرتـيبي زەمانيـە، خُلاصـە مَـلائكـە هـەوێنی هەموشـتن. ﴿وَأَجَلٞ مُّسَمًّى﴾ مُبتدايـە ﴿عِندَهُۥۖ﴾ خَـبريـەتـي. ئەوەندە قسەيان لەو دوو (أجله) كرديە مۆمن ئەخەنە (مريـة=رَيْبـة) ئايـا مُـراد چي يە؟ سبحان الله مَيلي بَشَر لەسەر خِلافـە. خِـلافي (أشـاعِرة) و (مُعْتَزِلـە) لـە تعددي أجَل مشهورە هەرچەند مُعْتَزِله لە أكثري مسائلي خۆيـان صـاحـبي رأي نين، قَول قولي حُكماي طبيعي وسائِريە، أما مُعتزله إختياريان كرديە، ناو ناوي وانـە. بـەڵێ حكُمـاي طبيعـي ئـەڵێن: (مَـوتي طبيعـي وعارضـي هەيـە) ئـەمڕۆ (سيگۆرتە) ئەكەن، حتّا لە بلادي إسلاميش دا پەيا بووە وە إنتشار ئەكا، نـەك

بۆ حَياتي إنسان بۆ بنا بۆ لِباس إعتنا به متانتي وچاك دروست كردني ئەكـەن تا زۆر دەوام كا، مع أنه ئەزانىٚ قابله به ئافەتىٚ بفەوتىٚ. حَقّا تەماشاي هَيكلي إنسان بكەي بەو نوعە كەلـە (تشريح الأبدان) بـەياني كـردوه ئـەڵێ ئەمـە بـۆ دەوام دروست كراوە، ئەو بنيانە مرصوصە نـارِمىٚ، كەچـى ئـەبيني رائەقـەنىٚ سەرەنگرىٚ ئەبىٚ ئەڕزىٚ لەبارىەك دێتە دەرىٚ، لەبەر ئەمە، ئەگەر (ثُمَّ) بكەينـە (إستبعادي) دوور نيە. موتي طبيعي تا مال بـۆ كـەس نەبوە،يـەكىٚ لـە علمـاي غرب ئەڵێ: (مَوتي طبيعي شتێكە وەك نوستن تا لە قەبر بەخەبەر دىٚ بىٚ ئێش ولێش). تائەمرۆ ئەوي مردوه هەموي ئافاتي بوه لكن ئەمە ئايا ئەبىٚ؟ يانابىٚ؟ ببىٚ كەي ئەبىٚ؟ دوور و نێزيك أمَلي بەبوني هەيە، أما حَتّا ئەڵێى دوورە.

﴿ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾﴾ شك وشُبْهَ ئەكەن لە وجودي خوا لە وحدانيەتـي، يـا لـە زيندوبونـەوە بـۆ حـەق وحسـاب. وجـودي واجـب الوجـود (جَـلَّ وَعَلـى) وَحدانيەتي جێـى إشـتِباه، إسْتِبعاد نيـە. واجـب الوجـود نـەبىٚ كائنـات نـابىٚ. زيندوبونەوە كەمىٚ لە نظر دوور ئەنوێنىٚ، وەلىٚ كۆڵێنەوەي كەم كەمـە خَدْشـە بە أذهان ئەدا، لكِنْ سِعهتي علمُ وقُدرەتي إلاهي بَلكو تَفَنُّني طبيعـەت، نێـزيكـي ئەكاتەوە، گەر لە نظري ناظران دوورە لاي خوا نێزيكـە، وەتَصـويـرو تَصَـوّري كَيفِيَه تي إعادەي عناصري مردي ،عائدي ئێمە نيـە، ئـەو نشـأتـەي دىٚ وەكـي رابردي، لەسەر خوايە، خۆي ئـەيكا، خـۆي ئـەزانىٚ چـۆنـي ئـەكا. ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَفِي ٱلْأَرْضِ﴾ خوا تاقە لە ئاسمان وە لە عەردي، هەر ذاتي كبريـائـي موجِد وخـالق ومُـدَبّرە، حَتّـا مبـدأي (فَيّـاضْ) كـە لاي حكمـاي (يۆنـان) عقلـي عاشِرە، گۆيا تَدبيرو تَدويري عالەمي عَناصِر لە طرف ويە، بىٚ وجودە، لەخَيالىٚ شـاعرانە قَـوليـان پـىٚ كـردووە. لاي مـن وجـودي مُجَـرَّدات محالـە، بـەغَـيري حضرەتي كبريائي، كەس فـوق الطبيعـەت نيـە. فرقـەىٚ ئـەڵێن خـواي عـەدري لەگەڵ خواي آسمانان جوايەزە، لام وايە لەبەر ئەم شەڕو شۆڕ وفسادي كـە لـە عالەمي كَون وفَسادداية خواييكي مَبَدأي شەڕيان بۆ پەيدا كرديـە. ﴿يَعْلَمُ سِرَّكُمْ

﴿وَجَهۡرَكُمۡ﴾ گشتي ئەزانێ، سر لەو بزر نابێ، دیارە سرّ بۆ خواي نیە، بۆ ئەو هەموي جهرو عيانە. ﴿وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡسِبُونَ ٣﴾ لەچاكەو لەخراپە كە بەإختياري خۆتان ئەيكەن، لە رۆژي جزا، جزا ئەبينن. ﴿وَمَا تَأۡتِيهِم مِّنۡ ءَايَةٖ﴾ هەر آيەتێكي هەبێ ﴿مِّنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِمۡ﴾ لە طرف خوا بۆ وان بێ لەسەر لساني پێغەمبەر تبليغيان بكرێ ﴿إِلَّا كَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ ٤﴾ گوێي لێ ناكەن دلي نادەنێ تاتێي بگەن، ئەمانە لە آياتي (كَوْنِيَّە) نە لە آياتي (قَوْلِيَّە) إستفادە ناكەن.

﴿فَقَدۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ﴾ أوّل وَهلة كە حقيان بۆ هات تكذيبيان كرد، بێ تدبر وتفكر وەمحاكمەي عقلي، رديان كرد، دواێ وەك لێ يان ببێتە كورتە خێرەتي روويان تێ نەكردوە، لەسەر ئەو تكذيبە رۆين ﴿فَسَوۡفَ يَأۡتِيهِمۡ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٥﴾ دیارە تكذيبيان لەگەلّ گەپ وگاڵتە بووە، قەشمەريان پێ كردوە، بعضاً حضرەتي رسالەت پەنا، لە وَحي إلاهي بعضە خبەرەكي ئەدا حقيقةً ئەوەي إيماني بە قوەت نەبايە تكذيبي قەشمەرچيانی ئەهاتە دل، وەك لە (خەندەق) بشارەتي ئەدا بە فتحي (ئەستەمبول) و (بُصرى) و (مَدائن)، لكنْ ئەمانە هەموي هاتە جێ. خەبەريان پێ ئەكەي لە غايەتي فَقرو ذِلّتْ بشارەتي ئەدا بە إستملاكي كنوز وتاج تەختي (كِسرا)و (هِرقَل). خاصّةً ئەوانەي ئەوەي دەربارەي مَغلوبيەتي خۆيان ئەيان بيست، ريشە خەندەيان پێ ئەهات. عادةً ئەمانەيان زۆر زۆر دوور ئەزاني، ئەو إستبعادەشيان لەبەر بێ تأمُّلي بووە لە سيري عالەم ﴿أَلَمۡ يَرَوۡاْ﴾ نەيان ديوە؟ نەيان زانيوە؟ بۆيان حكايەت نەكراوە؟ ﴿كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ﴾ قرن لە مُقارَنە ونێزيكيە، قومێ لە زەمانێ گرد ببنەوەو بژين، قَرْنيان پێ ئەلێن، وەك عالەمي بَشري ئێستا لەسەر كورەي أرضي پێكەوە ئەژين، وەبەزەمانەكەش ئەلێن (قَرن).

ئێستا (قَرن) بەصەد ساڵ تحدید ئەکەن. ئەو هەموو قرنە بە هیلاك چوون، تبدیل وتبدُّلي سلطَنەتیان لەناو بوو، ضَعیف بەسەر قَوي غالب بوو. ﴿مَكَّنَّـٰهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ﴾ (مَكَّنَهُ) (مَكَّنَ لَهُ) لاي أكثر يەك مَعنايە، (آلوسي) نقل لە بعضە محققین ئەکا أوَّل لە ثاني بە قووەت ترە، لکن زیادە تفسیري نەفەرموە. لەبەر فَرق. (سیِّد رشید) ئەیکاتە (صنعة الأحتباك) كأنَّهُ ئەفەرموێ: ((مَكّناهُمْ في الأرْضِ ما لَمْ نُمَكّنْكُمْ)) و ((مَكنّا لَهُمْ ما لَمْ نُمَكّن لَكُمْ))، لە هەر طرفە شتەکي لێ حذف کرا بە قَرینەی آخر. حاصلي مَعْنَی ئەوان لە ئێوە قەرارگیرتر بوون لە أرضي لەبەر قوەتي مَتانەتیان کەس پەنجەبازي لەگەڵ پێ نەدەکران، ئێوە ئەو إستقرارەتان نیە، وە ئەو أسبابي إستِقرارو تَصرُّف لە مُلك وأنواعي إنعام کەبۆ وان سهل ومُهَیّا کرا، بۆ ئێوە نەبوو. منیش ئەڵێم ظاهر لە (مَكّنَ لَهُ) رێك خستني أسباب ومقدماتي کارێکە، (مَكّنَه) گەیاندنیەتي بە ئیشێکە، بناءً علیه حاجت نیە بە إحتباك یَعني ئەواني پێشي قرار گیربوون لە أرضي بوونە مالِك المُلك، ئێوە أسبابیشتان نیە، فضل لە تَمكّن. ﴿وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم﴾ باران مان بەسەردا دەباراندن ﴿مِّدْرَارًا﴾ غزیرو بەقوەت ومنفعەت، ئێوە کە بارانتان نیە، وەئەگەر بباریێ چ فایدەي هەیە بۆ ئێوە؟ ﴿وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَـٰرَ﴾ لەباغان ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِهِمْ﴾ لەسەر تەخت وقەنەفە دادەنیشن، ئەو جۆو جۆبارەیان بە بەردەما دەڕۆي، ئێوە ئەگەر بیري (زمزم) نەبا لە تێنان ئەخنکان. بناءً علیه قوەت مکنەت سَلطنهتي ئێوە بە چي یە؟ ئەو لاف و گەزاف وکبرو أناني لەبەرچیە؟ ﴿فَأَهْلَكْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ﴾ بە مجردي ظلم وغُرور، مع أنَّهُ بەنظر ئێوە، جێگەکەیان لایَق بوو.

﴿وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٦﴾﴾ ئەوانیش زەمانێ لەسەر عَدالەت رۆیشتن، دوایێ تێك چوون فەوتان، یا قەومێ دي بەسەریان دا غالب بوون. قَومي (قُرَیش) لەو قرونانە زێتر نین، لاشَك لەسەر ئەو حاڵە دەوام ناکەن.

﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ﴾ نوسراوێك لە كاغەز ﴿فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ﴾ بۆ دەفعي شك وشُبهە، قوەي لامسة زۆر كەم غَلَطە، خاصة (كَفي) دەست، لەويش سەرئەنگوست، چاو زۆر غلط ئەبێ ﴿لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ ئەوانەي خۆمان ئەيزانين ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ۝٧﴾ ئاشكرايە كەسێ كە كُفر لە دليا رەگی داكوتان نە بە اياتي أكواني نە بە اياتي قرآني ايمان ناهێنێ، ايمان بۆ ئەوانە، ئەبێ بە مُحال. ئايا ئەو قومە مُعجزەي سِحرو سائري أقسامي نادرات وعجايباتي بۆبێ، ظاهر ئەبێ؟ ئەيزانن؟ باوەڕ ناكەم. أما ئەوەي جاهل بێ، هەرچی بڵێ، ئەيڵێ. ﴿وَقَالُواْ﴾ ئەوەش إقتراحێ ترە ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ مَلَكٌ﴾ پێغەمبەر ئەفەرموێ مَلَك دێت وە چم بۆ دێنێ ئێوە پێی بڕوا ناكەن، ئەتانەوێ مَلَك بەكِسوەي مَلَكي بێت پێتان بڵێ شاهدي بدا، ئەوە پێغەمبەرە.

ئايا ئێوە لەسەر ئەو هەموو جهلە، حقيقەتي مَلَك ئەزانن؟ عِلمتان بە مَزاياو خَواصيان هەيە؟ تا لە ديتنيان إشتباهتان نەبێ؟ يا ئەتانەوێ مَلَك بنێرين بە رِسالەت أنّهُ نابێ بَشَر رسول بێ؟ وەكي تصريحي پێ ئەكەن أدبا وعقلاً (لايخلو) يا ئەبێ ئێوە بچنە لِباسي مَلَكي لە كِسوەي بَشَري بچنە دەر، يائەوان بێنە كِسوەي بَشَري. ﴿وَلَوْ أَنزَلْنَا مَلَكًا﴾ بەهەر وەجهێ لە وەجهَين سابِقَين بێ ﴿لَّقُضِىَ ٱلْأَمْرُ﴾ ئيش تەواو ئەبێ. ئێوە لەبَشَري دەرئەچن ئەبنە عالمي غَيب بشريەت نامينێ، ئەو أرضە تێك وپێك ئەچێ، كەوابێ إقامەي ئەو دليلە هَدْي مُدّعی ئەكات، وە ئێوە بكەنە دەرجەي مَلَك پێغەمبەرتان بۆ چيە؟ وە ئەو مَلَكە بۆ بڵێ ئەوە پێغەمبەرە؟ زاتاً لەو حاڵەتەدا، نبوّەت ئەڕوا. ئەڵێن ئەگەر ملائكەت ببينن، ئەمرن، تحمل ناكەن. ياخود ايەت بە گوێرەي إقتراح بێت (بَعْدَهُ)، إمهالي مخُالِف نادرێت. وە ممكنە بڵێين پاش حصولي ئەو إقتراحە إيي گەورەتر طَلَب ئەكەن، تاكو وەك بَني إسرائيلي بەر صاعِقەي غضَبي إلاهي ئەكەون. ﴿ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ۝٨﴾ ئەگەر ايمان نەهێنن ﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا﴾

رأساً مَلَكْ بنێرن بە رسالەت. وەك بَيان كرا، يا ئەبێ ئێوە تَرقي كەن بين بە عالەمي نوراني لَطيف، ئەو نابێ، رِسالەت بۆ إمحاي بَشَرِيَّت نەهاتووە، يا مَلَكْ دێتە كِسوەي بَشَرْ، ئەوە ئەبێ.

﴿لَّجَعَلْنَـٰهُ رَجُلًا﴾ با وجودي ئێوە ئەڵێن ملائكەت (بَنـاتُ اللهِ)ن، ئەمە دوو قَلبي تيايە ﴿وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ۝٩﴾ ئەو وەقتە چۆن فَرق و تَميزيان ئەكەن؟ ئەوە حقيقةً مَلَكە، ظاهراً بَشَرە، بەو نَوعە باز ئەڵێن با مَلَكْ بێ بە رسالەت، وە ئەگەر ئێوە علمتان گەيشتيتە ئەو دەرجە حَقيقەتي أعْلى وأشرَفي ممكنات كە مَلَكْ وبَشَرە بزانن، لە حاڵەتي إلتباس فَرقيان بكەن، ئێوە ئەبێ سەر تاجي رسُلُ وحُكما بن، ئەدي ئەو شِرك وجَهلە چيە؟ خُلاصە إقتراحێ زۆر أحمقانەيە، بەهەر صورەتێ مَلَكْ ببێ بە رسولي بَشَرْ، بَشَرْ بە هِلاك ئەچێ، فِطرەتي مَلَكي لەسەر دەوامي تقديس وتَسبيح وعِبادەتە، حوائجيان نيە، حَتّا ئەوانەي گۆيا غَلَبەي رَوحانەتيان لەسەر جسمانيەت بوە، وەك (غزالي) و رؤساي طرائق، دەعوەتي عباد ئەكەن بۆ دەست لە دونيا هەڵگرتن لە خوا غافلْ نەبون تَعذيبي نَفس بە مخالَفەو رياضەت مواظبە لەسەر ذِكر وفِكر نوێژو رۆژي وە أوْراد هەموو أوقات، لەسەر ئەو حاڵە بَشَر چۆن ئەژي؟ للهِ الحَمد حَوائج لە دەعوەتي وان بە قوەت ترە وإلاّ لە مێژبوو بَشَرْ إنقراضي بوبوو. ﴿وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ﴾ زۆر گەورە گەورە. دەرئەكەوێ ئەو نَوعە إقتراحەيان لە رووي قەشمەريەوە بووە ﴿مِّن قَبْلِكَ﴾ دڵت سەغڵەت نەبێ، ئەوە رەوشتي بَشَرە ﴿فَحَاقَ﴾ إحاطەي دا ﴿بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم﴾ لە أُممي رابردوو ﴿مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ۝١٠﴾ عذابێ مَوعود. لە تقديري دەواميان لەسەر كُفرو طُغيان، ئەوانەش شُبهە مەكە، تووش ئەبن. ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ لەكۆنە هەواران بنۆڕن ﴿ثُمَّ ٱنظُرُوا۟﴾ بە دِقّت وچاوی إعتِبار

تەماشاي آثار كەن ﴿كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾﴾ ئێوەش لە عاقبەت بترسن، تكذيبي پێغەمبەر مەكەن ﴿قُل لِّمَن مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لە مَلَك، لە إنسان ،لە أجرامي نوراني إي كێ يە؟ بۆ كێ يە؟ ئەو شركاي ئێوە چ مُداخلەيان لە ايجاديان، لە ادمەيان، لە إبادەيان دا هەيە؟

﴿قُل لِّلَّهِ﴾ خۆت جواب دەوە، في الحقيقة مُشركەكانيش هەر وا جواب ئەدەنەوە، أمّا (عيسَوي) ئەلێن إي عيسى يە، بعضێ لەمە ئەلێن (الأرضُ أرضي وَالسماءُ سَمائي) ئەلێن تَدبيرو تَدويري ئەو عالەمە (مُفَوَّضي قُطبي فَردە)، بێ أمر وإدارەي وي ذەررەيەك حَرَكت ناكا، سُبحان الله ئەوەيە كُفري بالأيمان، أصلاً مُشرِك ئەو هَذَيانە ناكا. ﴿كَتَبَ عَلَىٰ نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ﴾ لەسەر خۆي لازم كرديە، لەبەر رەحمي نەبايە، ئەبا لەسەر ئەو قسانە بە انـي أرض واسمان تێك بدا ﴿لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ ئەمەش رەحمێكە تا قيامەت كردتان ئەكاتەوە، يَعني عَذابي إستِئْصالي تان نادا، وەكي خەڵكي تر ئەژين، بەڵكو مؤمِنێ لە ئێوەو أمثالي ئێوە پەيابێ. ياخود جَمعي في البَرزَخ پاش مردن تا قيامەت. ياخود جَمعي في القِيامَة كە (إلى) بە مَعنا (في) بێ.

﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ لە قيامي قيامەت شك نيە، يَعني جێی شكي نيە ﴿الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ﴾ نَفسي خۆيان دۆڕانديە، لە مَقامي بَشري تَنَزُّليان كرديە، لە حَيوانات وجمادات كەمتر بوين ﴿فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾﴾ نـأيلي رِبحي ايمان نابن، ئەو ذِلَّەتە بويتە طبيعي لەوان، حَتّا دَركي مَذَلَّەت ناكەن، نَفرەت لە عِزَّەتي ايمان ئەكەن.

﴿وَلَهُ مَا سَكَنَ فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ لاي حَقير مُراد (بما سَكَنَ)ە بُت وأصنام وهياكليانە كە ئەيان پەرستي نە لە شەو نە لە رۆژ حركەيان نيە، حيوانات قسمێ لەشەو ئەگەڕێ بەرۆژ ساكِنە، قسمێ بالعكسە، ديارە ئەوانە لە هەمو

حیوانات حقیر تـرو بـێ دەسـەلات تـرن، هـەر ئەوانـە بەبـەر مـافي الأرض مُقَدَّر ئەکەون، أما بۆ عطفي نظریان، تصریحي پێ نەکراوە. مەلایاني تـر ئەفـەرمون (سَكَنَ)ە لە (سُكنا)یـە یعـني هەرچـی مسكن ومأوایـەکي هـەبێ، چ ساكـن چ متحرك، یا لە (سكونَ) مُقابلي حَذف کرایە، (وَما تَحَرَّكَ). مـن دڵـم بـە چـتاقیان دانەکـەوت. ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣﴾﴾ چـۆن ئـەو جمـاداتـي (لا یَتَحـرك)ە عبادەت ئەکەن إتخاذیان ئەکـەن بـە شَـریـك؟ زاتـێ ئاگاداري كُلّي وجُزئـي، چ مناسبەي هەیە لەگەڵ غیرە مُدرك؟

﴿قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا﴾ غـیري خـوا بگـرم بیکەمـە ناصِـرو مَعبـود؟ ﴿فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ شَـقّي آسمـان وأرضـي كردیـە لێکـی جـودا کردینـە (فـاطِر) تفسیر کرایە بە (مُبْدِع) (إبداع) إیجـادي علـی غَیْـرِ مِثالـە، یعـني لەسـەر نمونـە نەبێ. لە خَلق وإیجادي عالەم، شریكي نیـە، مـن چـۆن إتخـاذي شَریك بكـەم؟ ﴿وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ﴾ حاجەتي بە غِذا نیە، مُنَزَّهە لەو نوعە حیاتە، وەکەسـێ إحتیاجي ببێ بە خواردن، چۆن بیکەمە مَعبود؟ وەمعلومە نتیجەي خواردن لـە حیواناتي چیە، ذاتـێ حَیاتي خۆی پەکي لەسەر پارچە نانێ جـۆ بکـەوێ، کـوو بیکەین بە مَعبود؟ بیکەینە ما فَوق الطبیعة؟ لەلاي حقـیر غـیري حَیاتي إلاهـي هیچ حیاتێ مُستَغني نیە لە إمدادي خارجی، ئەوجا هەر نَوعە غِـذایێ بـبێ ﴿قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ﴾ لە طَرَف خوا، یا لە طَرَف وجِدانـي پـاك، بـە أمـرێ شـبهي تَكْویني ﴿أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ﴾ بۆ خواي بێ لام وجیم، قبـوڵ ئەکـەم، إلاهـە، عالِمە، مُقَدَّسە، لە إحتیاجي بە شتێ إمدادي حَیاتي بکـا. حیـاتي ئـەو، ذاتیـە، ئي غَیر، ئەو غَیرەیە محتاجە بە إمداد.

﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٤﴾﴾ لە شِرکي جَليّ وخَفيّ أخفی، خوداي من، نَفسي من، نَهیم ئەکەن لە هەمو أنـواعي شِـرك. سُبحان الله ئـەو شِـرکي ئـەمرۆ لەناو (مِلیون)دا هەیە، قَط نەبووە. ئەگەر بۆ إنفاذي أوامِـر نـەبێ خوایـان هـەر

پێ ناوێ.

﴿قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ﴾ ئەترسم ﴿إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي﴾ جەواب بەجێ بەجێي نەكەم ﴿عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾﴾ لە عَذابي رۆژێ گەورە. حقيقةً ئەبێ وابێ، رسولي خودا لە خودا زۆر بترسێ، ئەزانێ خوا غَنّي يە پەكي بە هيچ ناكەوێ، لەو نوعە كارە كەس ناتوانێ بڵێ بۆ وا ئەكەي، بشلێي، هەبايە، ايمان بە جَلال وعَظَمەت وقَهري كبريائي كە لە دڵدا شين بوو، ترس غالب ئەبێ. رَسولي أكرَم ئەيفەرموو (من لە هەموتان خوا چاتر دەناسم، لە هەموتان پتري لێ دەترسم).

ئەوانەي بە نَسَبْ يا بە أمَلي شَفاعەت ترسيان نەماوە، گوێ يان لێ بێ. ﴿مَّن﴾ هەركەسێ بێ حتّا رسول ﴿يُصۡرَفۡ عَنۡهُ﴾ ئەوەي لە عذاب وەرگێڕدرێ، دوور خرێتەوە لە عَذاب، يا تحويلي عَذابي لێ كرێ. ﴿يَوۡمَئِذٖ﴾ رۆژي قيامەت ﴿فَقَدۡ رَحِمَهُۥ﴾ خاصةً ئەمانەي كە گوناهيان نەكردووە، تا عَذاب بدرێن، وەك مَلائِكەت، ئەفەرموێ: (ئەوي حِفظي كەي لە گوناه، بەحەقەت رەحمت پێ كردوە). ﴿وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٦﴾﴾ ئەوي گوناە كار ئەبێ وخوا عَفوي بكا، ئەويش لە رەحمە. لَكِنْ فَرق لە بە يني ئەو دوو رەحمە زۆرە، وەكي فرق لە بە يني (فَوْزَين). لام وايە فَرق لە بە يني (زُحْزِحَ) و (صُرِفَ) زۆرە، كەوابێ حاجەت نيە بە جِدالي أشاعِرَە ومُعتَزِلە لەسەر وجوب وعَدَمە وجوبي (عَلـى الله). ﴿وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ﴾ ئەلبەتە لە خِطابي رسول خۆي، بۆيە نافەرموێ (بِشَرٍ). ئەگەر خواي تعالان ئەلەمەك و زەرەرەكت پێ بگەينێ ﴿فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ﴾ كەس نيە إزالەي بكا إلاّ خوا نەبێ، كەوابێ، كێ بكەم لە وەلي وناصِر ومُعيني خۆم؟ لە إلاهي ئێوە؟ ﴿وَإِن يَمۡسَسۡكَ بِخَيۡرٖ﴾ شتەكي چاكت پێ بگەيەنێ ﴿فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٧﴾﴾ سُبحان الله ئەبێ وصولي خَير بۆ طَرَفي

رسول لايان له غايەتي دووري بێ، وەإلاّ چۆن إستدلال دێنێ لەسەر ئەو مادّە جُزئيه به عموم وشمولي قدرەتي حضرەتي كبريائي؟ ئەوە لە زەمانـي فَقرو ضرورەت ومُضايقه وإضطهاد ذِلتْ نازِل بووە، دوشمن نظر بە حالي نَبَويّ وياراني وا به قوەت وساعي له كوژاندنەوەي نوري إسلام، نَيلي خَيرو سَعادەت، زۆر دوور هاتيته بەر نَظَر. (سيّد رشيد)ي مرحوم لەبەر بَياني نُكتەي مُقابلەي (ضَرْ) به (خَيْر) له بَدَل (نَفع) و (شَرْ) لەو حكمەتە غافلْ بووە، وەكەسيان تعرضيان بۆ نەكرديه. له عبارەتي (سَيِّدي) وادەرئەكەوێ كە خطاب لەگەلْ (من يصلح الخطاب)ە نەك لەگەلْ حضرەتي رَسول، بەلاّم من بۆوە هيچ وجە نابينم.

﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦۚ﴾ هەر ئەوە غالبە لەسەر عبادي خۆی، إنس بێ، جِنْ، يا مَلَك، ضعيف وقويّ ودەولەمەند، گەداو پادشا، زەليلي قدرەتي ئەوە. لەو فَوقيەتە دياره مقصدي فَوقيەتي قدرەت وعَظَمەت و شكوهو جاهو جَلالە. لەو كَلِمه مُبارەكه نايەتە فَهم كە خوا لە هەورازي عبادي خۆي دانيشتووە، حَتّا ئەو نَوعه عبارەتە دەربارەي ئەوانەي بِالفِعل لە مَكان وجِهەت دان بگوترێ، فَوقيەتي مَكاني نايەتە دلْ، (وَاِنّا فَوْقَهُم قاهِرونَ) وەكەسێ أهلي نَظَر بێ ئەزانێ فوقيەتي حِسّي ومكّانيّ وجِهِتي، عَيني زِلّەتە. لكِنْ أوائِل ئەو جۆرە محاكمەيان نەبووە، يان نەكردووە، إستغناي مَوجودي خارِجي له جِهِتي وَضع وتَحَيُّز، في الحقيقة دووره له عقل، بەلْكو لاي گەلێ عُقَلا محالە.أما وجوبي وجود بە حەق مع اللوازِم تَصَوّر بكرێ، ئەو وەقتە لە نظري عقل ئەگۆڕێ ئەزانێ بووني واجب الوجود، له جِهەت وحَيِّز، محالە، وەئەزانێ ئەو تقدس وإستغنايە بۆ غَيري زاتي أقدَس واجِبِ الوجود غَنيّ عَنِ العالمين، محالە. بۆيە من بە صورەتي قطعي ئەلّێم وجودي عقولي مُجَرَّدە بەو طَرزه كە حُكما ئەلێن، محالە قابل نيە. وەتعجب ئەكەم لە (طوسي) باوجودي إستغناء لە جهەت ئەكاتە خاصّەو لازمي وجوبي وجود، جَزم بە أمتناعي عقولي مُجَرَّده ناكا. بِناءً بەو تقريره كە عَرض

کرا، حاجەت نیە بە هاي وهوي سَلَفي وخَلَفي تَأويل وتَفويض لە مَسلكي (سَلَفي) قول بە مَلزوم ونفي لازِم، حَقّاً مُحيِّرُ العقولە، خاصَّةً کە لازمیٚ بَیٚن ومُساوي بیٚ. هەروولا ئەگەرچی مقصدیان حەقّە، أمّا لە حەق یەك تجاوزاتي بیٚ أدَبانە ئەکەن، قائِل بە جِهەت وا ئەنوێنن بوني جەنابي حەق لە جِهە تي فَوق لە قَضاياي فِطريەیە، إنسان طبعاً لە دوعا روو ئەکاتە جهەتي فَوق، مُنَزِّهين ئەفەرمون ئەمە حُکمي وهمە إعتباري پیٚ نیە. أمّا نازانم لایێ ئەڵێن عالەم هەموي حادِثە، لایێ ئەڵێن خوا لە جِهەتە، ئەمە چۆن ئەبیٚ؟ ﴿وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ١٨﴾ حکیمي علمي وعمليە، علمي بە طبايعي مُختَلِفە هەیە، وەئەتوانیٚ مَزجیان بکا، أنواعي أحياي ليٚ پەیا ئەکا، ئاگاي لە أحوالي عالەم هەیە وردوو درشت، سِرّو جَهر، مَنْوي ومُظهَر. ئەو جُملە دلالەت ئەکا کە قاهِري ئەو، معنویە، وە دلالەت ئەکا، قهري ظالِمانە نیە. کەوابیٚ کیٚ إتخاذ کەم بە وَلي؟ کیٚ بکەم بە شریکي خواي سَماوات وأرض وما فیهِما؟ ئای وەي، کەس مُعارضە ي إرادەي وي پیٚ ناکریٚ، قاهِري مُطلقە فَوقَ الکُلّە هەمو بۆ ئەو ذەلیل ومُسَخَّرن، خودايەکە فَوْقَ الطَّبيعەتە فَوْقَ الجِهەتە نە لە جِهەتي فَوقە.
﴿قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ﴾ سابقاً إقتراحيان کرد (مَلَكْ) بیٚ شايَدي بدا لەسەر صِدقي پێغەمبەري وە جوابیان درایەوە، بۆ حَسمي شُبْهە ئەفەرمویٚ: بلّیٚ چي لەهەمو کەس لەهەمو شت گەورەترە لە جهەت شايەدي شايەدي وي هیچ إشتباهي تیا نەبیٚ ﴿قُلِ ٱللَّهُۖ﴾ مُطَّلِعي سِرّو عَلَنە، ماڧي الصدور، وما ڧي السَّموات والأرض، لەوي بزر نابیٚ، ئەو عالِمُ السِّرّە ﴿شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ﴾ ئێوەش ئەزانن خوا ئاگادارە، ئەو خودايە شايەدي ئەدا لەسەر صِدقي رِسالەت و دەعوەتي من، بۆ وَحدانيەت وإبْطالي شِركْ جَليّ وخَفي ذاتي و وَصفي ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ﴾ کە بەسەرتان دا ئەخوێنمەوە پڕە لە اياتي بيِّناتي (کَوني) کە حضرە تي کبريائي واحِدو بیٚ شریکە. ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ﴾ ئەوەي دعوەتي بگاتیٚ،

حضرەتي كبرياتي بە وَحي قُرآن شايەدي بۆ ئـەدا كـە پێغەمبـەرم. ديـارە ئـەو كتابە حكيمە عظيم الشأنە، خۆكردي نيە، خاصَّةً لە ذاتیٚ أُمّي نەخوێندەوارە.

﴿أَئِنَّكُمْ﴾ بـاوجودي طَلَـبي شـاهِـد كـە ئەكـەن لەسـەر رِسـالە تـي خـۆم وحدانيەتي إلاهي، وەشاهِدي هەمو ئەو اياتي بَيِّناتە قبولٚ ناكـەن، ئـەدي ئێوە ﴿لَتَشْهَدُونَ﴾ شـاهدي ئـەدەن؟ ﴿أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ﴾ چـەند خـواي دي هەن لەگەلٚ ذاتي أقدس يعني شَريكي ئەون؟ ئەگەر شاهِدي بدەن لەسـەر چـی شاهِدي ئەدەن؟ مَلَكْ هاتووە؟ شاهدي داوە، رسوليان ناردوە، اياتيان داناوە؟ بی سَنَد وثبت چۆن ئەو شاهِديە ئەدەن؟ دوعواي شاهِدْ لە من ئەكـەن، خۆتـان بێ شاهِدْ، شاهِدي لەسەر شِرك ئەدەن؟ زۆر سەيرە وەكي ئێستا ئەڵێن (إشلون دۆخە) باریٚ چ نەبیٚ ئێوە تفريق بكەن لە بـە يـني تَوحيـدو شِـرك، لەسـەر ئـەو جَهلە منيش دەعوەت ئەكەن بۆ شِرك؟ ﴿قُل لَّآ أَشْهَدُ﴾ حاشا من شاهِدي بەدرۆ نادەم ﴿قُلْ﴾ بە صَريحي ﴿إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ بیٚ شَريك وبیٚ نَظير بیٚ ضِد وبیٚ نِـدّ ﴿وَإِنَّنِي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿١٩﴾﴾ لـە شِـركتـان لـە شُـركاتـان ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ﴾ لە علماي يهود ونصارى ﴿يَعْرِفُونَهُۥ﴾ بەو علائم وأوصافە كەلە كـتبي سماويـان وەرگرتيـە لـدى التطبيـق پێغەمبـەري پـیٚ ئەناسـن ﴿كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمُ﴾ لە حقيقتدا ئەزانن رسولي خوايە أمّا لەبەر تَكَبُّر وعنـاد وحَسَد إيمـان ناهێنن شاهدي نادەن، بەڵكو بالعكس شاهدي لەسەر باطِلي ئەدەن، ظاهر وايە ئەمانە لە پێغەمبەر بە عومر تر بووبن وە ئاگاداري أحوالي پێغەمبـەر بـوين لـە منداڵي تا زەماني رسالەتي ﴿ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ﴾ فەرقي نيە چ أهلي كتاب بیٚ چ أُمّي كە فِطرەتي تێك چوو عَداوەتـي وحَسَد داخلـي دلـي بـوو، الاّ ﴿فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾﴾ وامەزانن هەرچی أهلي كتاب وخوێندەوار بـوو نَفسـي پـاك ئـەبیٚ أخلاقي چاك ئەبیٚ، حاشا وەكي كوردي ئەڵێن: (شير هەر بزِركا لە هەموو شتیٚ

خراپترە) مایەي فَساد وإفساد ئەمانن، مایەیان پیسە وە بوني بە زانا ئەوانە ئەگەر بە مندالي بەواسِطەي داك وبابیان ایمانیان بە پێغەمبەرەکاني پێشو نەهێنابا، أصلاً ایمانیان بە کەس نەدەهێنا. لە تفسیري (طَنطاوي) واوەرئەگیرێ ئەواني أهلي کتاب کە پێغەمبەري ئەناسن، وەکو کوڕاني خۆیان ئەناسن، وەایمانیان هێناوە بە رسالەتي پێغەمبەرو شاهدي ئەدەن وەکي (عبد الله بن سَلام) (الَّذین خَسِروا)ی ئێرە هەر ئەواني پێشون، ئەمە باشە، أمّا لێرەنا، زێرا شَهادتي إبن السلام وأمثالي لە (مَدینە) بوو پاش ئەو مَحاوەراتە کە خوا لەو سورەتەدا ئەي فەرموێ، وەشَهادەتي إبن السلام لە موقعي خۆی دێ. ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ بەدرۆ بلێ خوا مني ناردیە بەپەیام بەري، یا فلان ذات وتویەتي من کوڕي خوام، یا خوا شأنێ لە شئوني ألوهیەت ئەداتە کەسێ وەك علمي کاملْ قُدرەتي شامِل أمري (کُنْ فَکانَ)ي، نعوذُ بالله لە کُفري ایماني ﴿أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ﴾ قُرآني أکواني بێ علم و شعور بلێ ئەمە سِحرە، یا تعلیمی عمرو زَیدە مُختَلَقە أساطیرە، ئەمە زۆر تجاوزە لە حَدْ ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢١﴾ بە مطلَب ناگا (فکَیْفَ بالأظْلَمْ؟) گەلێ درۆزن دەعواي رسالەتیان کرد خائِبْ بوون، لکِنْ لە آیّامي ئێمە لە کِسوەي (تَصَوُّف) دەعواي (نبوّەت)، بەلّکو فوق الرسالەتیان بۆ چووە سەر وە دەچێتە سەر ئەگەر لە دونیا طَماعیان حسب الهوی یە ﴿وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعًا﴾ صادِق وکاذِب مُصَدِّق ومُکَذِّب ﴿ثُمَّ نَقُولُ﴾ على رؤس الأشهاد ﴿لِلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ﴾ بەهەر جورە شِرکێ بێ ﴿أَيۡنَ شُرَكَآؤُكُمُ﴾ لە کوێن ئەوانە؟ في الحقیقة شَریکي خۆتانن، شَریکي خوانین ﴿ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ٢٢﴾ بە گومان وأوهام ي کاذبي خۆتان، ئەلّێن ئەوانە شَریکي خوان ﴿ثُمَّ﴾ پاش ئەو سؤالە ﴿لَمۡ تَكُن فِتۡنَتُهُمۡ﴾ عُذریان ﴿إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ ٢٣﴾ ئێمە مُشرك نەبوین، سوێند بە زاتي أقدس ئەخۆن

وەمُلاحظەی وَەصفي ربوبیّەتي ئەكەن، یعني نە لە ذات نەلە صفەتي ألوهیـەت وربوبیّەت، شِركمان بۆ نـەگرتوە. مُفَسّریك نَقل ئـەكا لـە (زَجّـاج) (فِتْن)ە بـە محبەت تفسیر ئەكا وە ئەفەرمویٚ لەو كلمە معنایٚ لطیف هەیە، حاصِلي ئەوانە بە محَبّتي ئەو (بوتانە) گیرۆدە بوبـون وەك عاشـقیٚ كەدلّداتـە محبـوبي خـۆی، كەچی ئەو مَقامەدا عِشقي وان دەربارەي أصنامەكان غَیري إباو حاشا لیٚ كردن چیتر نەبو. ﴿ٱنظُرۡ﴾ لە وَجهي تعجبەوە تۆ یا ئەوي قابلي نَظَر بـیٚ ﴿كَيۡفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡۚ﴾ كو درۆیان لەسەر ماني الضمیُرو وِجداني خۆیان كرد. واقعـاً ئـەوە جێی تعجبە. لكِنْ لەواني نَفسیان خاسِرو خائِبْ بووە لە دەناسەتی كُفـرو شِـرك روو چووە، وەدرۆ بویتە خویان وەك (سیاسِیّون)ي عَصـري ئێمـە، دوور نیـە. ئەواني ئێمە ئەفەرمون ئەمەیان لە دەهشەتەوە دێتە سەر، حاشا لە عبارەتـان بۆنی دەهشەتیٚ لیٚ نایٚ. (جُبائي قاضـي عبـد الجبـار) ئـەلّیٚ: (ئـەم درۆیـە لـە قیامەت نابیٚ مُحالە) لەبەر ئەوە خَلّلیان بە نَظم داوە، لكِنْ ئەوە قیاسُ النَّفسە. حاصلي لاي من هیچ شُبهە نیە ئـەو مُشـرِكانـە لـەو مَقـامـە بـەهۆش وگـۆشـي، لەسەر خۆ بیٚ دەهشەت و هەراس، ئەو درۆیە ئەكەن، حقیقةً جێـی تعجبـە أمـا جێی إنكار نیە.

﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٢٤﴾ رۆی لـیٚ یـان گـوم بـوو ئـەوبوت و أصـنـام وإلاهي كە إفترایان بۆ ئەكردن، ئەمانە وسیلەو شَفیعن، ئەوان لە دونیـا گـومڕاە بون بە واسطەي أصنام لە رۆژی أمیّد أصنامەكان لەوان گوم بوون. ﴿وَمِنۡهُم﴾ بعضیٚ لەو مشركانە ﴿مَّن يَسۡتَمِعُ إِلَيۡكَۖ﴾ اي وایان هـەن گـویٚ بـۆ تـۆ رائـەگریٚ. گوێت ئەداتیٚ، بعضـیٚ بـالكُلّـي إعـراض ئـەنێن هـەر گـویٚ نـادەنیٚ وەك سـابقاً إشارەي بۆ فەرمون، أمّا لەو إستماعە إسـتفادە ناكـەن ﴿وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ﴾ ئەوي گویٚی لـە قسـان بـیٚ كـە دلـي نـەداتیٚ، نـازانیٚ ئـەلّێی چـی، لەمَعناي ناگات، ئەوانە دلّ رەقیان لـە حـەق رَسـول بـە دەرەجەیەكـە، مَعنـاي

آيەتي قُرآني، ناگاتە دلّيان، حَسَد، كِبر، عَداوە ت، حبّي رأسەت، تقليدي أسلاف يەك لەسەر يەك بوينە پەردەي فِطري بەسەر دلّيان دا داشكاوە، بە نَوعێ كە (رونتكين)ي نوري ايمان لە گوێ و خيوطي دەقيقە كە رابطەيە لە بەيني مێشك ودلّ، نفوذ ناكات.

﴿وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ﴾ لە گوێ يان دا ﴿وَقۡرٗاۚ﴾ گراني. گەرچى گوێ رادەگرن، أمّا گوێ گرانن نابێن، ئەوە نسبەتيان لەگەلّ سمعيات ﴿وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ﴾ بەچاو مُشاهَدە عَياناً ببينن، هەر أيەتێ بێ، ﴿لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَاۖ﴾ ايماني پێ ناهێنن، شِدَّەتي كفرو عناديان گەيتشتە مَقامێ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ﴾ ئەمە مُحَيِّرُ العقوله وەك مبشرەكاني مسيحي لەسەر ئەو جهالەتە مُجادَلە لەگەلّ أهلي علم وعقلّ ئەكەن.

﴿يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ كُفر بويتە صلەي مَوصوليان ﴿إِنۡ هَٰذَآ﴾ نيە ئەو قُرآنە ﴿إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٢٥﴾ أحاديث وحكايەتى پێشينانە، هەلّ بەستراوە، بێ أصل وأساسە ﴿وَهُمۡ﴾ ئەو كافرانە ﴿يَنۡهَوۡنَ عَنۡهُ﴾ لە قُرآن ﴿وَيَنۡـَٔوۡنَ عَنۡهُۖ﴾ لێى دوور ئەكەونەوە، چ جاێ خۆيان، نايەلّن خەلّكي ديش گوێ دەنە قُرآن تێى بگەن ايمان بێنن. بعضێ ئەلّێن ئەوە (أبو طالِب)ە نَهي ئەكا لە ئەزيەت داني پێغەمبەر وەخۆي دوور ئەكا لە ايمان، حاشا ئەمە لەو مَقامە استفادە ناكرێ، صَرفِي ئەو ضَمائرانە لە مَرجَعي صَريحي خۆيان، هيچ وَجهي نيە، با (أبو طالِب) وابوبێ. ﴿وَإِن يُهۡلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ﴾ هەر خۆيان بە هِيلاك ئەبەن زەرەريان بۆ تو نابێ، رَغمَ أنفِهِمْ گەلێ كەس گوێ لە قُرآن ئەگرن، ايمان دێنن، دينت انتشار ئەكا، لە فينان ئەپسێن، عاقِبەت بە قَطعي مغلوب ئەبن. في الحقيقة وابوو (أبو جَهل) وأمثالي لە سَلاطيني ضَلال وإضْلالْ منكوباً مەحو نابوود بوون، گەرچى بەناوێ بەد تا أبَد ياد ئەكرێن ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ ٢٦﴾ أدنى مَرتَبە ي إدراك شعوري

پێ ئەڵێن، شعور لاي بعضێ حُكما بۆ قسمێ لە أشجار ونباتات هەیە، ئەوانە ئەوەندەشیان نیە. یاخود ئاگایان لێ نیە کە خۆیان بە هلاك ئەبەن، وەهەر خۆیان بە هلاك ئەچن، ئەمە پادشاهیانە لە دونیا ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ﴾ راگیران لەسەر ئاگري أكتُّهي دڵیان درا، گوێ یان سووك بوو، چاویان کرایەوە، حقیقەتي حالیان لێ عەیان بوو ﴿فَقَالُواْ يَٰلَيْتَنَا﴾ خۆزیا ﴿نُرَدُّ﴾ بۆداري دونیا ﴿وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا﴾ بە ایەتێ لە ایاتي خواي خۆمان قُرآني وأکواني ﴿وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۝٢٧﴾ ئایا ئەو تَمَنّایەیان لە وِجدان وجزم ي دڵە؟ کە ایمان بە ایاتي خوا بێنن؟ نەخێر. ﴿بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ﴾ چیە ئەوەي بزریان ئەکرد لە پێشدان؟ حين الوقوف على النّار بۆیان ئاشکرا بوە؟ هەشت قَولي تیایە، قَولي نۆهەم قولي (سَیِّد رَشید)ي مَرحومە، كأنە جمعي لە بە ینې أقوالەکان کردیە، بە إعتباري صنوفِ مَوقوفین، وەبعضە أصنافي مسڵمانانیشي تێ هاویشتیە، أمّا لێرە شُبهە نیە کە مُراد ئەوانەن ایمانیان بە ایاتي خوا نەهێنایە مُقَلّدي مسڵمانانن، (حاشا لەو مَوقِفە دانیە). وەممکنە علماي تَقلید ئەوانەي ئەمرِۆ إدّعاي مجتَهِدي ئەکەن ظاهراً خۆیان بە کتاب وسُنَّة مُقَیَّد ئەکەن گوێ نادەنێ قَولي أئمَّە ي أوَّلین، شتەکیان لە دڵدا هەیە، ئەوێ رۆژێ بۆیان ئاشکرا ئەبێ، ندامەت ئەکەن، (أمّا ئەوانە خۆی نیە). دیارە مَقصَد مُشرِك وأهلي کتابن ئەوانەي کە (یعرفون إلخ کما یَعرفون أبناءَهم) وە ایماني پێ ناهێنن وە مُشرکەکانیش بعضاً مُجَرَّد لە عِناد وحَسَد ویاخود لەبەر لۆمەي پیرێژنان ایمانیان نەدێنا ئەیانزاني پێغەمبەرێ بە حەقە اقراریان نەدەکرد، هەریەك لەوانە شتەکي ئەکردە سَبَب بۆ ایمان نەهێنان لەو مَوقِفە دەردەکەوێ کە شتێ بۆف بووە بەکەڵکیان نەهاتووە بۆیان نەبویتە مَعذرەت. ﴿وَلَوْ رُدُّواْ﴾ بۆ دونیا. خوا ایاتیان بۆ بنێرێ ﴿لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنْهُ﴾ لە تکذیب وإفتراي علی الله ﴿وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ۝٢٨﴾ کەسێ درۆزني بووە خووي وەك عرض کرا، لە حضوري خواش

دۆر ئەكا، وە ئەو فەرمودەي إلاهي هيچ شُبهەي تيا نيە، وەعيني حال لە دونيادا موجودە. زۆر كەسمان ديوە لە نەخۆشى دا چونكي ئَواعي شَهوەتي نەماوە هەزا تَوبە بە انێ ئەكا هەزار سوێندو پەيمان ئەگەر خوا شِفاي بدا قَط گوناه ناكا، دواێ كە هاتەوە سەر شنگ وتاقەت (وەكي جاران بەدوو پاران) كەي پاراوەتەوە، كەي توبەي كرديە ﴿وَقَالُوٓاْ﴾ باز ئەيان ووت وەك حالي سابق ﴿إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا﴾ ژيان نيە، إلا ژياني دونيامان، ژيانمان لە دونياێ. ﴿وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ ٢٩﴾ ديسان إنكاري قيامەت ئەكەن يعني بعد العَودِ إلى الدُّنيا دەچنەوە سەر إنكاري حَشرو نَشرو حِساب و كتاب جَنَّة وجَحيم، لام وايە ئەوە لە نظر بعضيێ دوورە بەڵكو محالە، بۆيە ئەڵێن ئەو قولە قَولي حياتي حاضريە قَبْلَ المَوتِ وَالعيانَ، نەك بَعْدَ العَودِ والرَّدِّ إلى الدُّنيا، بەلام لاي من دوور نيە مادام عادوا لِما نُهوا عَنْهُ ببنەوە ئەبێ ئەو قسەش بكەن، بەڵكو يەكانە سَبَبي عَودي إلى ما كانواعلَيهِ إنكاري بَعثه.

﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ﴾ ئەي رەسولي تكذيب كراو، راگيران لەسەر خوا ممكن نيە، بعضيێ ئەڵێن تَمثيلە ياكِنايەتى بۆ ڕاگرتنيان بۆ سؤال وزَجر وتَوبيخْ، كەسێ تر ئەڵێ (وُقِفُوا) بە معنا إطلاعيە، يَعني إطلاعيان بوو بەسەر قَضاي جزاي خواي خۆيان، مُفَسِّرێ تر ئەفەرموێ: إطلاعيان ئەبێ بەخوا يعني چاكي ئەناسن وەحدانيەتيان باش لێ معلوم ئەبێ، بعضيێ ئەڵێن بە معنا عَرض نواندنە بۆ سؤال وجَواب، منيش ئەڵێم ممكنە مقصد لە (رَبِّهِمْ) الاهي خۆيان بێ كە إتخاذيان كرديە بە شريكي خوا لەو هەنگامە خوايەكەيان ئەبينن بە خوارو مُحَقَّر خۆيان لە فَوقي ئەون كَأَنَّهُ لە ژێر قَدَميانە وەعلاجي ضَميري ﴿قَالَ﴾ سَهلە قائلێك پێ يان ئەڵێ: مفسرەكان ئەفەرمون خوا ئەفەرموێ ﴿أَلَيۡسَ هَٰذَا بِٱلۡحَقِّۚ﴾ زيندو بونەوەو ولَواحِقي حەق نيە؟ ﴿قَالُواْ بَلَىٰ﴾ حەق شك وشُبهە نەما ﴿وَرَبِّنَاۚ﴾ خواي حَقيقي ئێمە، إعراضيان نا لە (رَبّ)ە كەي پێشويان ﴿قَالَ

﴿فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ٣٠﴾ شُرکاو شُفعا کەڵکتان ناگرێ. في الحقیقة ایماني ڕاستي لە قیامەت ئەوەیە کە بزاني خوا مالکي ئەو ڕۆژەیە. (یوم لا تَملكُ نَفسٌ لِنَفسٍ شیئاً والأمرُ یومئذٍ لله). ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ﴾ کەسێ تەماشاي أحوالي عمومي کا، ئەزانێ وە لە وجداني خۆی یَقین ئەکا، ئەوي ایماني بە زیندو وبوونەوەي قیامەت نەبێ، یاخود بە أوهام وخیالاتي فاسدە نَوعاً ما تأمینێکی وەرگرتبێ کە عَذاب نادرێ، یا عَذابێ خَفیف ئەچێژێ، مُبالاتي بە دین نامێنێ، لە سَیِّئات وکاري ناشایستە ناگەڕێتەوە، لە تَرقي وتزکیەي نَفس وأعمالي چاکە محروم ئەبێ. خُلاصە ئەبێ بەسەگە بەڕەڵا، ئەوي مَیلي نفسي بێنێ بۆي ڕیك کەوت، ئەیکا. في الحقیقة ئەوەتي شکانێکە کە سەرمایەي ئەبا. ئەو کەسە أصلاً مُتأثر نابێ بەگوناه، بەڵکو سروري پێ پەیا ئەبێ ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةً﴾ مردن یا قیامەت بێ هەنگام وبەناکاو، یامردن نَظَر بە أوائِل، قیامەت نَظر بە أواخِر، چ قەیدي یە؟ ئەمانە چونکي إحضاراتیان بۆ اخِرەت نیە، ئەگەر ناصاغیان طولیش بکێشێ، مردن بۆ وان هەر ناکاویە، وکَذا قیامي قیامەت باعَلائم ومُقَدَّماتي زەمانێکی پێ بچێ، ئەوەي إیماني پێ نەبێ بافَرهود بێن فُجائیە. ﴿قَالُواْ يَٰحَسۡرَتَنَا﴾ آهي ئەندوهو حَسرەت هەڵدەکێشن ﴿عَلَىٰ مَا فَرَّطۡنَا فِيهَا﴾ لەسەر ئەو تَقصیرە کە لە حَیاتي دونیامان دا دەکرد نَفسي خۆمان بە خَسارەت دا رووچوین لە شَهَوات وامان ئەزاني هەر ئەو حَیاتە هەیە ﴿وَهُمۡ يَحۡمِلُونَ أَوۡزَارَهُمۡ عَلَىٰ ظُهُورِهِمۡۚ﴾ ئەوان باري گراني گوناهان لەسەر پشتێ خۆیان دائەنێن هەڵدەگرن کەس باریان سووك ناکا لەگەڵیان هەڵناگرن نە فِدیە نە شُرَکا نە ئەو نە ئەم. ئەوانەي لە حَمْل وبار مَعناي عَوامي پەتي پەتي دوور لە فَهم وعَقلي ئەدەنەوە، ڕیوایەتێ هەڵدەبەستن لە (سَدِّ)ي وغَیري سَدِّي لله الحمد ناگاتە پێغەمبەر وئەڵێن: (أعمالي أهلي ایمان دێتە سەر صورەتێ زۆر جوان بە مؤمِنە کە ئەلێ وەرە سوارم بە من زۆرت سوار بویم لە

دونيا، أعمالي كافر دێتە سەر صورەتیٚ زۆر ناشیرین ئەلیٚ من عملي تۆم زۆرم سوار بوي لە دونیایٚ من ئەمڕۆ سوارت ئەبم).

سُبحان الله (نَقّال) چەند بیٚ محاكمەن. عَمَلي مؤمِن چۆن سواري مؤمِن دەبیٚ لە دونيا؟ كافر چۆن سواري عملي خۆی دەبیٚ لە دونيا؟ مادام حَمل وسواري ئەو مَعنايە مَعنويەي هەيە بۆ دونيا، بالەو مَعنايەشي هەبیٚ بۆ قيامەت، چی پیٚ دەویٚ قَلبي أعمال حَتّا أعمال وسواري وحَمْل ي حِسّي بۆ قيامەت؟ ﴿أَلَا﴾ ئێوە ئاگادار بن لەڕوو وەوە بزانن ﴿سَآءَ مَا يَزِرُونَ ٣١﴾ باري خراپ هەلٚ ئەگرن ﴿وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ﴾ حَياتیٚ كە ئەو كَفرە پێی مغرور بوبون لايان وابو فَوقي ئەو حَياتە حَياتیٚ ترنيە ﴿إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾ هەر كەمەو غَفلەتە حَياتي دونيا وەك (مُعَرّي) ئەلیٚ: (تَعِبٌ كُلُّها) ژەهریٚ تالٚەكەلە سەرە مەرگ بەئاو زنيگان (قَي) ئەكرێتەوە، دەردێكە دەرماني مەرگە، ئەگەر لەزەتەكي تيا هەبیٚ لەگەمەو ئاگانەبونە، كەوابیٚ إنساني عاقل پێی فريتە نابیٚ. ئەوەي لە حَياتي دونيا ئەكا دوو گروهن قسمیٚ بە قومارو مُسكرات واشتغال بە شَهَوات راي ئەبوێریٚ، قسمیٚ بە طاعَت وحَسَنە وخَيرات ومَبَرّات بە سەري ئە با، ئەواە اهلي تقوان أمێديان بە حَياتیَ پر ومَسَرّات وسَعادەت هەيە، ئەويش لەو دار وێرانە بەدەست ناكەویٚ، لەداریٚ تر هەيە ﴿وَلَلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ خۆيان لە سياسەت ئەپارێزن ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ ٣٢﴾ فَرق لە بەيني لَعب ولَهو چيە؟ ئەوەندە قيلە قيلی تيايە، كأنّە كردی تيانە لهو ولَعب.

وە لە نوكتەي تقديمي (لَعب) لە (لَهو) لە بعضە ايەت، وە تقديمي (لَهو) لە (لَعب) لە بعضیٚ ايەتیٚ تريان دواون. صاحبي (دُرَّةُ التنزيل) طول وتفصيليَكي هەيە. (سيّد رشيد)يش مەيدان داريەكي تەواوي كردوە، ئەگەر نقليان بكەم ماندي دەبم، إنشأ الله كەسیٚ دواي ئێمە ئەيكا بە حاشيە ﴿قَدْ نَعْلَمُ﴾ بە حقّەت ئەزانين ﴿إِنَّهُۥ لَيَحْزُنُكَ ٱلَّذِى يَقُولُونَ﴾ ئەوەي ئەيلێن لە حەق تۆ كە (داعي إلى

الوَحْدَة)ي ئەو اَلَمي نَفْسيَّە بۆ حضرەتي رسالەت پەناە نوعاً ما مجبوريە،...

(جاي انَست كي خون مَوجْ زَنَدْ دەر دل
لعل زين تَغابُنْ كي خَزَف ميشكند بازارش)

وە ناتوانىٰ خۆي تَسَلّاي خۆي بدا، جەنابي حەق دلي ئەداتەوە ئەفەرموىٰ (تۆ مَحزون مەبە) ﴿فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ﴾ گەرچى ظاهراً نسبەتي كِذب بۆ تۆ ئەدەن ﴿وَلَٰكِنَّ الظَّالِمِينَ﴾ لە حقيقەت دا ئەو ظالمە متجاوزەكاني لە حَدْ ﴿بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾﴾ إنكاري اياتي خوا ئەكەن، تۆ اياتي خوا ئەكەن، تۆ اياتي كَونيّەيان بۆ شَرح وإيضاح ئەكەي، هيچى آلەَيان كە في نفس الأمر بَديهيە، لە مواقعي حاجەت بۆيان تصوير ئەكەي، ئەوان إعتبار بە اياتي تَوحيد ناكەن. ﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ﴾ زۆرو گەورە گەورە ﴿مِّن قَبْلِكَ﴾ لە پێش تۆ ﴿فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا﴾ فتوريان نەهێنا بۆ دەعوەت أهميەتيان نەدا تكذيبي ئەزيەت دران تَحمُّليان كرد ﴿حَتَّىٰ أَتَاهُمْ نَصْرُنَا﴾ هەتا يارمەتي مەيان بۆ هات ﴿وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ﴾ كەس نيە بتوانىٰ حكمي خوا بگۆرىٰ ببێتە حائِل لە بهيني خواو حُكمي، نەيەلىٰ بێتە جىٰ. أما حضرەتي كبريائي خۆي حكم ئەگۆرىٰ، وەممكنە مقصد ئەو أحكامە بىٰ كە گۆراني ممكن نەبىٰ. مادام جەنابي حەق حكمي كرديەبە نَصري رُسُل، تۆش لەو زمرەي، يەقين بزانە بە سەرت ئەخا ﴿وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ ﴿٣٤﴾﴾ نەختىٰ لە إخباري پێغەمبەرانت بۆ هاتوە، كەوابىٰ دل ساكِن بە كلمەي خوا بۆ تۆش دێتە جىٰ، بە حالي حاضِرە مأيوس مەبە ﴿وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ﴾ گەورەوگران بوو لەسەر تو ﴿إِعْرَاضُهُمْ﴾ روو وەرگێران ومەيل ورەغبەت كردنيان لە ايمان، چونكي مُقتَرحاتيان نەهاتە جىٰ. ﴿فَإِنِ اسْتَطَعْتَ﴾ ئەتواني لە قُدرەت ومُكْنَت وطَوعت

داهەيە ﴿أَن تَبۡتَغِيَ نَفَقٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ طلب بكەي لەغمێ كونێكى لە أرضي أسرار وعجايباتي جَوفي أرضيان بۆ كَشف كەي ﴿أَوۡ سُلَّمٗا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ قادرمە بە ئاسمانەوە خەي غرائباتي ئاسمانيان ببێنيە بەر نَظَر ﴿فَتَأۡتِيَهُم بِـَٔايَةٖۚ﴾ هەر ايەتێ ياله اياتي مُقتَرَحي وان. (وعلى الفضل والتقدير) هەر ايەتێ بۆيان بێنى، ايمان ناهێنن، وەكي بَني إسرائيلي ئەڵێن (أرنا الله جهْرَةً). ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ﴾ (على فرض المحال) ﴿لَجَمَعَهُمۡ عَلَى ٱلۡهُدَىٰۚ﴾ ئەو جمعه چۆن ئەبێ؟ ئەبينن جمادات ونباتات وأشجار وحيوانات نەك بە أجناس وأنواع، بە صنوف وأشخاص، مُتَفاوتن. أفكاري بَشَري أطماعي بَشَري ميولى بَشَري بە نوعێ مختلفە، گرد بونەوەيان لەسەر دەستورێ مَعاشي يا مَعادي لەگەڵ ئەو حالە، محاڵە. هەر كەسێ لە پێغەمبەراني عِظام لە ملوكي ذَوي الأحتشام لە مُصلِحاني كِرام لە سياسيّوني أنام، فكري تَوحيدي بَشَر بكا، في الحقيقة خَيالي خاوە، بە شێوەيەكە بە غَيري (فاطِر) چارە بەكەسى تر ناكرێ. هەرگاه بَشَر لە فِطرەت مُتساوي يا متقارب بوون، ئەو وەقتە گردبوونەوەيان لەسەر شَرعێ لەسەر دَستورێ، قابِلە. لكن تفاوتيان لە فِطرەت گردبونەوەيان لەسەر هِدايەتێ دينێ، محاڵە. كەسێ أدنى شعورێكى هەبێ ئەو تَمَنّايە ناكا ﴿فَلَا تَكُونَنَّ﴾ ئەي سەرداري عُقَلا ﴿مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ٣٥﴾ واقعاً جاهِلْ بە خَيالي جاهلانەى خۆي هيچى لە نَظَر دوور نيە، إختلافي شَرايع وتَغيير وتَخصيص وتَقييد ونسخي أحكام، تابعي إختلافي تَغيّر وتَبَدُّلي ظروف وأحوالي بَشَرە.

حاصِلي شَريعەت لى إتحاد وإختلافي، تابعي طبيعەتە، كەسێ طبيعەت بكاتە تابعي شَريعەت، حَقّاً جاهِلەو تابعي خَيال وأوهامي فاسِدەيە (نعوذُ بالله أن نكون من الجاهلين).

﴿إِنَّمَا يَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسۡمَعُونَۘ﴾ ئەوانەي ببێن، هەر ئەوان مُهَيّانە بۆ قبولي

دەعوەت وە بەجێ هێنانی ﴿وَٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ بێ هۆش وگۆش ﴿يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ﴾ وەکی حوشترو مەرو بزن لە مۆلگە هەڵیان ئەستێنێ بۆ (مَرعى) بلەوەڕێن، وظیفەی ئەوانە، وظیفەی حیواناتە لە دونیای پاڵ کەون وبلەوەڕێن بقرێنێ ﴿ثُمَّ إِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ٣٦﴾ کەوابێ مُراد لە (بَعث) بَعثی لُغَویە ﴿وَقَالُواْ﴾ ئەو بێ گوێ یانە ﴿لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ﴾ (ﷺ) ﴿ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ﴾ لە مُقترحاتیان ﴿قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةٗ﴾ لە مُقترح وفوقی مقترحیان ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٣٧﴾ وازەعم ئەبەن نەناردنی لە بێ قُدرەتیە ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ إستقرارو ثبوتی قَدمَی هەبێ لە أرضی، یعنی حَیواناتی راقیە ﴿وَلَا طَٰٓئِرٖ﴾ ئەویش راقیە مُرادە، بۆیە ئەفەرموێ ﴿يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ﴾ نیە نَوعێ لە أنواعی حیواناتی راقیە ﴿إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ﴾ (أیُّها الناس) لە حواسی ظاهری لە مشاعری دەماغی لە دەورانی دَمْ لە قَلب لە جگەر، یعنی أعضای رأیسیە لە قوای عاملە حتّی مُصَوِّرە ومُوَلِّدە، وەکی ئێوەن وەلە عَناصِرێ کە ئێوەی لێ مُرکبّن، ئەوانیش مُرکبّن، بزانن فَرق لە بە ینی ئێوە بەچیە، بە عَقلە کە مُدرکە بۆ دقائق وە أسراری کائنات ناظمی قواعدە مَبدأی تَفَنُّنی أعمالی بَشَریە، ئەگەر ئێوە إهمالی عَقل بکەن لە ایات تأمُّل نەکەن، فەرقتان چیە لەگەڵ حَیوانات؟ کەوابێ بزانن ایەت لەوە گەورەتر نابێ.

لاشَك زانینی ئەو ایەتە تەرەقی ئەدا بە بَشَر وەکی ئێمە ئەی بینین عُلمای حیوانات چ نَوعە تَرَقیان کردیە، خاصَّةً ئەوانەی واقِف بن بە عِلمی (تَشریحُ الأبدان)، أمّا مُعجزات دێ و دەڕوا وەك بروسکە گەرچی عجایبە، لکِنْ ایەتی کَونیَّە، کەلێ فَوقیُ مُعجِزاتە وە زۆر زۆر أنفَعە. فلان کەس بەسەر ئاودا ڕۆی، پردێکی لەسەر بکرێ چاکترە، هەمومان خێری لێ ئەبینین. فری بەهەوادا طَیّارە باشترە. طَيُّ الأرضی بۆ بوو، قطار (شەمەندەفەر)و سَیّارە أنفعە. ئایاتی

كَونيه كه قرآن عَطفي نظري ئێمەي بۆ ئەكا، مادَّةً ومعنىً، قياس ناكرێ لە اياتي بێ قَرارو ناپايەدار.

گەرچی بعضێ لە حَيواناي (دون) وەكي ميش ئەنگوينە ومێروو صُنعي عجيب وورد ئەكا، أمّا بە غَريزيّەو محدودە، لەو زياتر نازانێ! گەلێ جار ديومە كەوتوتە حَوض نەيزانيە بەلا ديوارا بێ وبڕوا گەلێكيشي لێ نێزيك بووە چەرخ وخولي دايە تاخنكايە. ناظرێ أدْنى فَهمي هەبێ، يَقين ئەكا، مَقْصَد لەو مثليەت ومانەندي وەك يَكى، فِطريە، أحكامي نيە، تابلێين ئەوانيش رُسُل وأنبياو وَحي وشرايعيان هەيە!

لە شَريعەتي طبيعي زياتر بۆ وان نيە، أما بعضێ لە سەرامەداني تَصَوُّف ئەو قسەي كرديە، لَعَلَّهُ لە جُملە ي شَطَحاتە، مَعَ الأسَف نقل لە (إبن عباس) ئەكەن فەرموويەتي: (هەرچی لە طَوائفي حَيواناتە لە ئێمەدا هەيە وبالعكس، حَتّا إبنُ عَبّاسی وەكي منيان تيا هەيە). ئەبێ ئەوانيش حِبْرُ الأُمَّە إبنِ عَمْ الرسول ترجماني قرآنيان ببي! نقل لە (إبن عباس) بێ أصلە، لە اياتي قُرآني وأكواني دەرئەكەوێ: (حَيوانات داخلي هيچ قەيدي حُكمي تشريعي وتَكليفي نين)!.

رەجا ئەكەم خۆتان تەماشاي أحوالي كائِنات بكەن، بە قسەي ئەم وئەو، ولَوْ زۆر إعتقادتان پێ ببێ، لەو نَوعە مَقامە هەڵمەخەڵتێن! ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ﴾ تقصيرمان نەكرديە لە قرآن ياكتابي أكوان أدْنى تَقصيري، ياخود تەركمان نەكرديە (في الكتابَين) هيچ شت! تفسيري كتاب بە (لَوح المَحفوظ) يابە علمي إلاهي، لام لێرە خۆش نيە، يعني جەنابي حەق لە عالەمي حَيَواني (مِنْ حَيْثُ الخَلق والأتْقانِ والحِكَمِ والدَّقايق) هيچ كەمي نيە! هيچ تەرك نەكرديە! (أعْطى كُلَّ شَيءٍ خَلَقَهُ ثُمَّ هَدى) حَقاً خَلْقيَ مُحَيرُ العقولە! ذەرەيەك ئەكاتە انسانێ عَظيمُ الشَّأن، هێلكەێ ئەكاتە طاوسێ عجيبُ الألوان قازو قورنگێ غَريبُ الطَّيران. وە لە قرآني كريم ئەوەي لازمي إنسانە بۆ إرشادو

هدايەت، بەبَيانىَ واضِح تقريري فەرموه. أمّا قُرآن هەمو شتي تيانيە. وەكي بعضىَ خَيال ئەكەن لە (مِلِّيون) كتابي سَماويان محيطە بە هەمو شت، پێغەمبەريان هەمو شت ئەزانىَ، وانيە. پێغەمبەري لە قَضا ناخوازىَ علمي مُحيط، كُتبي إرشاد لازم نيە حاوي بىَ بەسەر أحوالي هەمو كائنات، تابلێن ئەگەر وانەبىَ، كِتابي إلاهي نيە. بەلىَ بعضىَ بە دَلالات وإلتزاماتي دوور دوور نوعامًا إحاطەكي بۆ پەيا ئەكا، لكِنْ ئەمە هيچە. كەسىَ (مەلا) بىَ ئەتوانىَ كائنات له (قامَ زَيْدٌ ضَرَبَ عمرو) دەرج كات، أوّل قضاياي أوَّلِيَّه (الشَّيْءُ إما أن يَكونَ وإمّا أنْ لا يَكونَ) كە مندال ئەيزانىَ حاويە بەسەر هەمو موجود حتّا واجب الوجود بەسەر هەمو معدومات حتّا ممتنع. عُلماي إجتهاد بەصەد ئەولاو ئەملا دَلالَةُ الأيماء وَدَلالَةُ الأشارة وەقياس رَبطي بعضىَ أحكام دەدەن بە اياتي قُرآن، وَمَعَ هذا مجبورن هەندىَ أحكام بە (حَديث) إثبات ئەكەن. (صوفيّە) لەو واديە لە جَوَلان دان، ئەلێن: (شێخى عَرَبي لە كەر ئەكەوىَ ئەچن هەري گرنەوە، ئەلىَ ڕاوەستن تا كەوتني خۆم لە سورەي فاتحە إستخراج ئەكەم). (ئەگەر ڕاست بىَ، ديارە من جاهلم بە قرآن). (سَيّدي آلوسي) نقل لە بعضىَ أربابي كشف ئەكا: (أحوال ووقايعي ملوكي آلي عثماني له سورەي فاتحە أخذ كرديە، ئەلىَ تا قيامەت ئەمێنن، تَركي سَلْطَنەت بۆ مهدي ئەكەن، پاش وەفاتي مَهدي باز دێنەوە سەر سَريري إدارەي مُلك وسلطنەت). أمّا ئەوانە هەموي بۆ (بۆفه) غلط دەرچوون إنقراضيان بوو، حكومەتي تورك بو بە جمهوريەت، مَهدي نيه. باوەڕ ناكەم (سيّدي آلوسي) ئەوەندە بسيط بىَ، لكِنْ ئيشي بە سلطني عثماني هەبو، بۆ وەلآمى كاري ئەو نَوعە قسەي لە تَفسير نوسي، بەلآم كەلكي نەگرت ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ٣٨﴾ لە إبن عباسي خۆمان نَقل ئەكەن حَشري بَهائم عبارەتە لە مردنيان، وە گەلىَ ئەفەرمون زيندي ئەكرێنەوە حسابيان دەديترىَ پاشان دەبنەوە خۆل. خودا عالمە چيان لىَ ئەكا چيان بەسەر دێنىَ. ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا صُمّٞ وَبُكۡمٞ فِي ٱلظُّلُمَٰتِۗ﴾ لآلن كەڕن لەناو

أنواعي تاريكي دان، چۆن تەماشاي أحوالي ئەو عالەمە ئەكەن؟ چى تىٚ ئەگەن؟ بە چ وجە إجابەي دەعوەتت بكەن؟ ﴿مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ﴾ با وجودي هەمو آلات ئەدەواتي تێ گەيشتني هەيە، أما سبَب بە ظُلماتي أوهامي فاسدە أخلاقي سيّئە وإنغماسي في الشهوات، قوەي إنتباهيان نيە ﴿وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾﴾ إدارکي حقايق ئەكا، بەرێى راستا ئەڕوا، دين ناكاتە وَسيلەي دونيا، علم وعرفان ناكاتە داوي حيلەو تَزوير، (بەخوا ئەمانە زۆر كەمن) بۆ هِدايەتي راستی دوو شتي ئەوێ، قوەي إنتباه مەيلى سَليم، لاشَك ئەوانەش لە مَواهِبي الاهينە، وتأويل بە إضلال وهدايەت لە رێگە بۆ بردني بەهەشت لە قيامەت، بە ضلال حسابە، چ مناسبەي لەگەڵ مَقام نيە. وەكَيْفيەتى هِدايەت دان وإضلالي إلاهي بۆ عبادي خۆي لە آياتي قُرآني وأكواني دا، ديارە، حاجەت بەو جوورە جوور نيە ﴿قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ﴾ سُبحان الله نايەتە خەيالم لەو كَلِمە كردبێ، حَتّى ئەلێى قَط لە قُرآن دا نەم ديوە. دوو خِطاب يەكێ مُفرد يەكێ جَمع مخاطب جودا. أكثر لە أئِمّەی لُغەت وتفسير ئەفەرمون بە مَعْنى (أخبروني)يە، مادام لە لُغەت ثابِت بوو ئەو كَلِمە لەو مَعنايە يابۆ ئەو مَعنايە إستعمال ئەكرێ؛ ئيتر چەلاو چوون بۆچى؟ بۆچى پێ ناوێ! خودا ئەفەرموێ تۆ بلێ يا محمدي مُرسَل بەو مخاطباتي خۆت كە بە ايات ايمان نايەنن، خەبەرم دەنێ. ﴿إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ﴾ مِثلي عذابي أقوامي رابردوو ﴿أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ﴾ كُبرى ياصُغرى ﴿أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ﴾ لەو هەنگامەدا لە وجداني خۆتان جوابم دەن بە جەوابێ راست ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾﴾ ئەگەر شاءُ شێوەي راستيتان هەيە؟ لاشَك غَيري خوا هاوار ناكەنە بەر كەس ﴿بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ﴾ هەر هاوار ئەكەنە بەر ئەو كە قورتارتان بكا ﴿فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ﴾ لا ئەدا ئەوەي بۆ لاداني ئەپارێنەوە، مُطلقا! نا.

﴿إِن شَآءَ﴾ مجبوریەتـي نیـە بـۆ إزالـەي، ئەگـەر بیکـا بـە إختیـار ئـەیکا.
﴿وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ ﴿٤١﴾﴾ شُرکایەکانتان لەبیر ئەکـەن، بەخیالیشـتان داناێ.
مادام لە طَرزە أهواله بە خالِصي توجە بۆ دەرگای کبریـائي ئەکـەن لـەوەقـتي هیماي وفراوانیشدا بـێ شـائبهي شِـرك، هـەر ڕوو لـەو بکـەن، ئـەوجا فـەریادي تەنگناي کەلکتان ئـەگرێ، وەك لـە حـدیثي قُدسیّەدا ئەفـەرموێ (أذکروني في الرَّخاءِ أذکرکم في الشِدَّةِ) ئەوە حالي مشرکانە لە زەمـانـي پێغەمبـەر. أمـا لـە زەمـانـي ئێمـە شِـرك ئەوەنـدەي تـەرەقـي کردیـە، لـە شِـدَّەت ورَخـاء، ئـەوەي فەرامۆشـي کـەن، هـەر خودایـە. نـاوي خـواي بـە غَـیري سویندي بـە درۆ پـێ خواردن لەسەر زوباتاندا نەماوە. حکایەت هەلّ ئەبەستن بۆ عَوامي قوڕ بەسـەر تـا لـە ایمانیـان بکەنـە دەر. کـوڕە فلاحـێ هاتـەوە مـالّ بـاوکـي ووتـي ڕۆلـە گاجوتەکانت چي لێ کرد، ووتي لە پـاوان بـەجێم هیشت بلـەوەڕێن، ووتـي بـە کێت سوپارد؟ ووتي بە غَوثي گەیلاني، ووتي باشە.

سبەینێ کەچوو دێـتي ولاّغـەکان صـاغ وسَلیم تێرو پڕپـال کـەوتون کاوێـژ ئەکەن. ئەو ئێوارەش چۆوە، ووتي ولاّغەکانت تسلیم کێ کرد؟ ووتي بە شاهي نَقشبندم سـوپارد، ووتـي باشـە، بـاز وولاّغـەکان بـە صِحَت وسَـلامـەت مـان. ئێوارەي سێ یەم ووتي تسلیمي کێت کرد؟ ووتـي تسلیمي خـوام کـرد، ووتـي ئەها ولاّغەکانمان چوون. سبەي تەماشایان کرد گاجوتەکان شەق وپەق کراین. کوڕە ووتي بابە ئەوە چیە؟ ووتـي ڕۆلـە غَـوثي گـەیلانـي وشـاهـي نقشبند بـە غیرەتن ئەوەي تسلیمیان بکرێ ئاگـاداري ئەکـەن، أمـا خـوا بـێ بـاکـە ئـەوەي أمانەتي بکرێ بمێنێ نەمێنێ پەکي پێ ناکەوێ.

ئەڵێن خوا مُقَدَّسە، ئێوە مُنَجَّسن، نابي بانگی ئەو بکەن. جاران هەر نەیسە ناوي ذاتێ وەك (غَوث) و (شاه) هەبوو، ئێستا لەبەر جرو جاموشتان. ئەوانیش ناویان گوم بووز لام وایە ئەو شِرکە علاجي ناکرێ تاهاي وهوي طریق داران لـە ناومان دا بمێنێ پەنا بە خـوا. ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ﴾ إسـرائیلي غـیرە

إسرائيلي تورك وهند وكورد وسائري أقوام لە طرف خوا پێغەمبەریان بۆ هەناردراوە، گەلێكیان ایمانیان نەهێناوە. ﴿فَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾ بە مَشقەت وشِدَّەتي فَقرو شەڕ وشۆر بەدەردو بەلاي بەدەنیمان گرتن ﴿لَعَلَّهُمۡ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾﴾ بپارێنەوە لەبەر خوا يَعْني ئەو ضَرِبەیە ضَربەیَ تَأْديبي بوو. كەسێ أدنى قابلیەتي هەبێ بۆ چاكە، كە توشي ئەو حالّەتە بوو، ئەگەڕێتەوە، بۆ چی تووش بوو؟ بە چی نَجاتي ئەبێ؟ تفكري لێ ئەكا، مهما أمكن سعي بۆ نجات ئەكا. ﴿فَلَوۡلَآ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَا تَضَرَّعُواْ﴾ بۆچی لەو هەنگامە كە بَأس وشِدَّەتي خوایان بۆدێ، ناپارێنەوە، مع أنە حەق وابو ایمان بێنن لە فِسق وفجور دەست هەلگرن تَوبە بكەن لەبەر خوا بپارێنەوە ﴿وَلَٰكِن﴾ نەگەڕانەوە، نەپارانەوە چونكي ﴿قَسَتۡ قُلُوبُهُمۡ﴾ دلّیان ڕەق بوبو، قابل نەبو إیمان نفوذي تیا بكات. ﴿وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ إنسي جِنّي، بەخوا شیطاني إنسي بۆ إنسان خراپترە ﴿مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾﴾ واي بۆ زینەت دابون أصلاً ناشیریني أعمالي خۆیان حِس نەدەكرد، هەردوو نَوعە إبلیس بە قوەیَ شاعِرانە واثارایشي قبایح وسیِّئات ئەدەن كە إنسان عاشِق ومفتوني بێ، وَمَعَ هذا مەیلي بَشَر بۆ لَزائزو شَهوات ئەچێ ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ﴾ واڕووچوون لە شَهوات، ئەو شدائد بەلاي دیبویان لە فكریان كرد، ئەو ووەقتە ﴿فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ﴾ لە حظوظی مَلاذ وشهواتي دونیا بە گوێرەي زەماني خۆیان دەرگەیان لێ كراوە مَوانع نەما بە هاساني پێی دا دەهاتن ودەچون ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ﴾ كیف خۆش بون بەوەي درایان نێ لە أسبابي تَرَف وطَرَبْ. أوخەي چا نەبو ئێمە تَبعهي ئەو پیاوەمان نەكرد، لەو نِعَمَە مَحروم نەبوین. لاشَك لەنسیاني ماضي فَرَح ومَرَح بەحال بالكُلِّیە إنسان محروم ئەكا لە

نظـر بـه إسـتقبال. ﴿أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً﴾ ناكـاو ﴿فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾﴾ سـاكت ومحزون ومات ومبهوت، مُتَحَيّرو لێ گۆڕاو، مأيوس له خَير، دَليل بڕاو. (حَقيقَةُ أبْلَسَتِ الناقةُ إذا لَمْ تَرغُ من شِدَّةِ شَهْوَةِ الفَحْلِ) لەگەڵ ئەو قومە كە مەيليان زۆر ئەبێ بۆ إستلاي قـومي أجنَبي بەسايقـي بعضـي أوهـام وخيـالاتـي خـاو، زۆر مُناسبە، حَتّى لەبەر شِدّەتي مەيلي فَحل غلدە غلديش ناكا هەر خوا خوايەتـي لێي بێ، كەسێ تەماشاي حالي شخص وقَوم بكات ئەزانێ ئەو ئايەتە هيچ شـك وشُبهەي تێ دانيە، ئەبيني عادەتي خواي واجاريە كەسێ مەيلـي بَدي بكـا لـه أولەوە چەند شەقازيلەيك تَأْديب ئـەخوا، ئەگـەر نەگـەڕاوە إصـراري كـرد خـوا بەڕەلاّى ئەكا بەكامي خۆى سَيِّئاتي بۆڕێك ئەكەوێ بۆس وشَقا لە فِكر ئەكا، بە فِسق فجوري خۆي، كَيف خۆش ومغرور ئەبێ، تاله نگـاوێ ئـەبيني سـەرەنگى ئەبێ خۆشي نازانێ چى بەسەردێ.

پاشـي (گرانـي) تـأريخ ١٣٣٦ هجري وەإسـتلاي إنكليـز أُميدەكـەم بـو بـە إنتباهي قَوم بۆ إقتصاد خصوص طَرَفِي إستهلاك وە أمَلَكم بو اتفـاق وإتحـاد بـۆ منعي تجاوزي ذِلّ وإضطهاد، مع الأسف گهانتم نەهاتەجێ، ئەو إسراف وتَبذيري پاش (گراني) بوو، نايەتە عقل وخيال، ئەوەي بەصد گيانە هاري ومەرگە مەلـه لە (گراني) قورتار بوو ئەمڕۆ لە هـەمو كـەس مُسـرِف تـرە، وەئـەو إتحـادي لـه بەيني بعضە أشخاص بوو ئەمڕۆ ئەويش نەماوە.

﴿فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟﴾ پاش ئەو أخذي ناگهانـي دواي ئـەو قـومـەي كە تجاوزيان لە حَدْ كـرد، بـرا. ﴿وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾﴾ ئێـوەش ئەگـەر ايمان نەهێنن أمين بن دوايتان ئەبڕێ ئەفەوتێن. وەشُبهەم نيە ئەگەر مسلّمانان لەسەر حالي ئێستا بمێنن، خَلاص ئەبن دواييان دێت. لـەو ڕۆژي كـە مسـلّمان لـە (أنـدلوس) طـرد كـران، تائـەمڕۆ ضَـرَباتي متواليـەيان بەسـەرداديت، حـالاً نايەنەوە هۆش، بەڵكو ئەمڕۆ فسق وفجـور وتبـذير لـە عالـەمـي إسـلامي دا زۆر أفزونە شَراب خواردنەوە تائەمڕۆ لەناو كـوردان بـە كُفـر حسـاب بـو ئـەمڕۆ مـع

الاسف نێزیکه له سُفَهاي غربي تقدم بکەن، لەسەر ئەو فَقرو فاقه قومار تَعَمُّمي کردیه زۆر ئەترسم معاذ الله ئەو جاره ضَربەیەکي قاطِعیَان لیٚ بدریٚ، خوانەکا یاخوا، رجا ئەکەین، وەکي خیَّام ئەلیٚ:

بَرْ موجبي عقل زیندەگاني کَردَن خواهي کَردَن وَلي نَداني کَردَن.
أُستاذي توروزگاي چاپُك دەستت چندان بَسَرت زَندکي داني کَردَن.

مسلْمانان چاره سازي خۆیان بکەن ﴿قُلْ﴾ یامُحَمَّد (ﷺ) بەو مشرکانەي کۆرو کەرِو بیٚ فَهم وتیٚ نەگەیشتن له اياتي بیّناتي إلاهي له أحکام وخَواصي واجب وممکن له معناو مزایاي رسالەت ﴿أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَـٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم﴾ گویٚ وچاوو عقلیٚ که في الجملة پێی ئەبێن وئەدینن بۆ مَعیشهتي ظاهري پێی تیٚ ئەگەن. جەنابي حەق بەجاریٚ ئەو قوایانەتان لیٚ بستێنیٚ هیچ نەبێن هیچ نەبیستن هیچ نەزانن مۆر له دلْتان بدا إدراك نفوذي تیانەکا ﴿مَّنْ إِلَـٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ۗ﴾ کیٚ یه خوا غیري حضرەتي کبریائی؟ ئەو مَأخوذەتان بۆ دێنیٚ وچارەتان ئەکا، بوت وأصنامەکانتان که خۆیان اساساً مُنحطن محرومن لەهەموو قواي عاملەو مدرکە؟ باریٚ هیچ نەبیٚ بەوەندە ترسۆکە، بیستنو دیتنو زانینەکەتانه تیٚ فکرن، نسبەتي خۆتان لەگەڵ إلهەکانتان بزانن، لَکن ئێوه خۆتان کەرِو کۆرو کەر کردیه، نازانن بەصد هەزار دەرەجه ئێوه له فَوقي وانن حَتّی بۆ تِمثالي إلهەي خَیالیتان ئێوه گەلیٚ لەوانه نێزیك ترن. ﴿ٱنظُرْ﴾ یامحمد یاصاحِب نَظر ﴿كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَـٰتِ﴾ چۆن دَلائِل وبیِّناتیان بۆ تَنویع ئەکەین! ئەیان هێنینه صورەي ئاشکرا به نَوعیٚ ئەوەي أدْني شعورێکی هەبیٚ، تیٚ یان ئەگات.

﴿ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾﴾ إعراض ئەنێن به إعراضیٚ شَدید، رِووي تیٚ ناکەن. قومیٚ أصنام دروست کەن له نان وله خورما بی پەرستن تَوَسّلیان پیٚ بکەن، لەوەقتي غَلاو برسیایەیەتي بیان خۆن، ئەبیٚ أمَلي چیان لیٚ بکریٚ؟ دەرەجەي

فهم وادراكيان ئەبێ چ بێ؟ ﴿قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً﴾ بێ مُقدّمەو علامەت ﴿أَوْ جَهْرَةً﴾ بە عَلامەت ومقدمەي ظاهِرە ﴿هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾﴾ مُراد لە عَذابي خودا عَذابي مخصوصە ئەي تێرێ بۆ سەر قَومێ مُعارضەو مُعانەدەيان كرديە لەگەڵ پێغەمبەري عَصري خۆيان وەكي بَعضە تَفصيل لەمەودوا دێ. زاتاً ئەو ايەتە وەك مقدمەيە بۆ تفصيلاتي اتي، وەإلاّ مُؤمِن بە ايمان لە بەلاّو مَصائبي دَهر دەرناچێ ونجاتي نابێ. بەلّكو لە بَعضە أوقات وەك عصري ئێمە بەلاي عام بەزۆري بەسەر أهلي ايمان دادێ. مُلحدەكان كشفي مفتاحي وَباو طاعون وتيفوس وگەلێ أمراضي عامەيان كرد، لەبەر ئەوە توانيان مكافحەيان بكەن. ئێستاكەش مسلّمانان بەو علّەتانە وەك گەلاّی داري پايزان بەرئەبنەوە، سَبهبي ئەوەش لە حَقيقەت دا ظلم وتجاوزي مسلّمانان بو لە حدودي طَبيعەت رسوخيان بو لە مَعنويات، قوەي (حَدْس) و (إنتباه)يان نەما يانەبوو. خُلاصە بەهەر نَوعێ بێ ظالم توشي هلاكەت ئەبێ. ﴿وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ وَظيفەي رَسول ئەوەندەيە. تَصرُّف لە مُلك ومَلَكوت وهَدمي قواعدي طبيعي بەوان ناكرێ، لەگەلێ خصوص خۆيان وەك سائري بَشَر نَواميسي طبيعيان بەسەردا إجرا ئەكرێ، ئەخۆن وئەخۆنەوە وەئەنون وئەصاغ ئەبن وئەمرن وئەكوژرێن.

﴿فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ﴾ ايماني بەڕاستي بەخوا گەلێ عذابي قَلبي لە دلّی مؤمن زائِلْ ئەكا، ئەندێشەو ترس وهەراسي لە غَيري خوا، نامێنێ. وەچەند خۆشە ئاوا إصلاحي حالي خۆی بكا فِتنەو ئاشوب هەلّ نەئايسێنێ، لەگەلّێ مَفاسِدو شرور أمين وتأْمينە. قَومێ لەو نَوعە أشخاصە تَشَكُّلْ بكا زۆر ئاسودە ئەبن ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾﴾ ترس وحُزن إستلايان بەسەردا ناكا صَبرو ثبات ئەكەن تدبيرو چارە بۆ نَجات ئەدۆزنەوە، خصوص لە قيامەت أمين ونائِلي ڕەحمەتي إلاهي ئەبن، لە غايەتي سرور صبور، عَذاب ناچێژن ﴿وَٱلَّذِينَ

﴿كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا﴾ طَبيعي وشرعي ﴿يَمَسُّهُمُ ٱلۡعَذَابُ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿٤٩﴾﴾ گەلێ جار ووتومانە واضعي قواعدي شريعەت، خالقي نَواميسي طبيعەت، خوايە، فائدەي شريعەت، تَعديلي طبيعەتە. حەق وابو مسڵمانان رعايەتي هەردوو شَريعەت بكەن، نەوەك شَرع وطَبع بە مُباين ومُنافر بزانن، ئەگەر لەو بەينە بەرێ دا ڕۆيشتبان، ئەبونە سەر تاجي أُمَمْ لە عذابي اخرەت لە گەلێ عذابي دونيا نجاتيان ئەبو، خَسِرَ الدنيا والآخِرة) ئەو فاسقەيە كە لە إطاعەي هەردووشَرع بچێتەدەر. هەرچەندە ئێمە بەرعايەتي قَواعدي شَريعەت أُميدي نَجاتمان لە عَذابي آخرەت هەيە، أمّا سَبَب بە عصيان لە أوامر ونَواهي طبيعەت، لە دونيا گرفتار بوين بەژێر كەوتين، لەبەر ئەوە ئەوا بەتەواوي مخالفەي أوامر ونواهي شريعەت ئەكەين، وائەزانين لەبەر موافقەی شَريعەت بوينە ژێر دەست؟ ئەمە غَلَطە، أمّا مَنشأي ئەو غلطە، ئەمڕۆ نيە، لە مێژە، لە إنكاري حقايقە، لە إنكاري مشاهدات ومُجَرَّباتە، گوێمان لە خِطابي تكويني نيە، أُموري ثابت ومحقق ومقرر ئەگۆرين، ئەيكەينە تابعي إعتقادمان. ئەي لەو فِسقە ! لەو خَطأە ! بە خيالات وأوهام وميولي فاسِدە نَقدي شَريعَتمان مغشوش كرد، بە مليون إلهەمان هەيە، گەرچی پێ يان نالێن إلهە، أمّا لاي گەلێ فَوق الألِهن، ئەوەي نِسبەت بەوان ئەدەن، نە لە شرعى تكليفي نە لە شرعى تكويني خواي دانيە. ئەمڕۆ عذابمان زۆر گەورەيە، أمّا بەنج كراوين، دەركي ألَم ناكەين، نهايەت هەم وأعضامان لەپالێ يەك دێنەدەر هيلاك ئەبين ئەفەوتێين، هاوار خوايە ! ربّي رەحمي! إنتباهێ! ﴿قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ﴾ نالێم أمرم بە أمري، كُنْ، فَكانَ، نالێم مُدبِّري أرض وئاسمان منم، نالێم لەگەڵ ذرراتي عالەم تێكەڵم، نالێم لە عەرش تاقورش كائنات لە ژێر أمر وإرادەي منە، نالێم رزقي عالەم من ئەيدەم، خَزينەو دەفينەي مادّي ومَعنوي خواي، لاي منە، حاشا ثُمَّ حاشا ﴿وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ﴾ (حينَ هوَ غَيبٌ)) غَيب نازانم چونكي زانيني غَيب مِفتاحي ئەوێ، مِفتاحي غيب هەر لاي خوايە. وەكي عن قَريب دێ وەلەوێ

تفصیلاتیٚ چاك عَرض ئەکریٚ ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ﴾ ناخۆم وناخۆمەوە، له أسواق ناگەڕێم، ئەتوانم چیایان هەرقەنم، شاران ژێر بەرەو ژوور بکەم، کلاّ ثُمّ کلاّ من ئەوە نالّێم. لام وایه ئێرە جێی مَعرکەي تَفضیلي مَلَك لەسەر رسول، رسول لەسەر ملك، نیه. مع أنَّه نزاعیان لفظیه نَفي وإثبات ڕوو ناکاته یەك جیٚ، هَدَفیان جودایه. حقیقةً ثَوابي عبادەتي بَشَر، قیاس ناکریٚ له مَلَك. شەویٚ وەك ئەمشەو سەرما، مسلّمانێك ڕووت لەسەر پارچە حەسیریٚ ئەخەویٚ، لێفە شریٚ بەخۆی دا دەدا، خۆی وێك دێنیٚ هەناسەي ئەباتەوە بەر خۆي، بەصەد تەقەلا خۆی نەختیٚ گەرم ئەکا، لەناکاو (الصلاة خیر من النوم) بانگ دەکریٚ دێتە گوێی لَبَیْك إجابەي داعي خوا ئەکا، بە ئاوي سارد دەست نوێژ ئەشوا، بەلەرزە لەرزو چەقو هۆڕي ددانی، دوو رکعەت فریضة بەجیٚ ئەگەیێنی، حَقَّ الإنصاف ملیونێك نوێژي (جبریل) دێنیٚ. عبودیّت وعبادەتي بَشَر، خاصه له زەمانی ئێمە قیاس له إطاعهي ملك ناکریٚ. وعجاییاتي صنعي بَشَري بەدەرەجەیەکە ڕەنگه ملائکەت تێی مُتَحَیرین، لام وایه مادّي ومَعنوي تَفضیلي بَشَر لەسەر مَلَك، باشترە ڕێی تەرەقي بَشَري توسیع ئەکا، وەبۆ إیقاظي عُبّادی أرواحي لَطیفه وەئەوانەي ئەلّێن ملائکه (بنات الله)ن، گەلیٚ أوفقه.

خلاصه حضرەتی محمد (ﷺ) دەعواي شتیٚ واناکا، ئێوە حەقیکتان بەپێی بڕوا نەکردن، هەبیٚ. ئەوەندە ئەفەرمویٚ من پێغەمبەرم وەکي سائري پێغەمبەراني دي، له طرف جنابي حەق وەحیم بۆ دێت، إتباعي ئەکەم. ﴿إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ﴾ دواي چیتر ناکەوم، وحي الاهي تبلیغ ئەکەم، ئەوەي حَظّ وسعادەتەکي هەبیٚ، ایمان دێنیٚ، بەدەرەجەي إستعداد إستفادە له ایەتي خوا ئەکا. لەو مَقامەدا دەفەرمویٚ: (اللهُ المُعطي وأنا القاسِمُ) وەك إمام المحدثین (شێخی بُخاري) وەرئەگیریٚ. وانەزانن خودا رزقي عالەم دەدا، پێغەمبەر تَقسیمي ئەکا، جەنابي رسولي کبریاء لەو نَوعه إدّعایه، دوورە.

بەلام بعضیٚ له أتباعي صوەري دەعواي گەلیٚ گەورەتریان هەیە،

بڕواشیان پێ ئەکەن، نەك جهَلە، گەلێ لە علماي عِظام نافذُ الكَلمەش فَضل لـە تصديق، تأيديان ئەکەن (سبحان الله) ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ﴾ كوێرو چاو صاغ چۆن وەك يەك ئەبن؟ وَمِن العجائب (أشاعره)ي خۆمان ئەڵێن: (يجوز أنْ يرى أعْمى العيْني بَقّةَ أندلُس) مع أنـە چـاو صـاغ نـايبينێ. كەسێ بـەجَهـل وتقليد كوێر نەبوبێ، چۆن ئەو إدّعايە ئەكا؟ چۆن ئەو نَوعە إدّعايـە بـڕوا ئـەكا؟ بەڵێ كوێر پەل ئەوەشێنێ هەرچۆنێ هاتەپێش، پياي ئەدا.

﴿أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ۝٥٠﴾ فَرق وتميز بكەن بە عَقلي خۆتان، حەق وباطـل لێك كەنەوە، بەسيەي تاكەي باب وباپيرمـان وابـوين وا ڕۆيشـتين، ئێمـەش وەدواي وان ئەكەوين. فلان مەلا فلانِ شێخ واي ووتيـە، بـەڵێ وايـە، چـۆن ئـەو مەلايـە گەورەيە ئەو شێخە عَظيمە قُطبي زەمان عارِفي بالله مُطّلِع لەسەر خَزانـەي غَيـب ناظِري في اللّوح، بە غَلَط ئەچێ؟ خِلافي حەق وحَقيقـەت ئـەڵێ؟ واي وەي، وەي وەي ئەم كُفرە! ئەوەي ئەو هَذَيانانە نەكا مُلحِدە، زەنديقە، بڕواي بە أوليايـان نيە، كەس تنقيديان ناكا بۆيە مەيـدانـي درۆو دەعـواي باطِلـە تَوسُّعي كرديـە. تۆوخوا بە تفكر تەماشاي ئەو ايەتە بكەن تێى بگەن، ئەوجا مُقايَسەي أحوالـي تابِع لەگەڵ مَتبوع بكەن، ئەوجا حكمێ بكەن مُنصِفانە... بَعضـێ بـە حَصـرێ مُستفاد لە ايەتي (إن أَتَبِعُ الخ...) إستدلاليان كرديـە لەسـەر مَنعـي اجتهـاد بـۆ پێغەمبەر وَمَنعي أُمَّەت بە عَمَل بە قياس، چۆن ئەو هەر حُكمـي بـە (مـا أوحـي اليه)يە ئێمەش ئەبێ هەر حُكم بەو بكەين. مرحوم (سيّد رشيد) جواي دايتەوە: (ئەو سورەتە لە أوائلي إسلام نـازل بـووە، ئـەو وەقتـە أصـول وقواعـد تقـرري نەكردبو، مسائلي فروعيّە هەندە نەبو قياسي بعضە شت لە بَعضە شت بكـرێ، دواێ إجتهاديشي كرد، عملي بە قياسيش فەرمو). في الحقيقة جوابێ زۆر جـوان ومَحْكَمـە. ﴿وَأَنذِرْ بِهِ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوا إِلَىٰ رَبِّهِمْ﴾ بترسـێنە ئەوانـەي ايمانيان بە غَيب هەيە، ئەترسن لە ڕۆژي وايەسين ڕۆژي حساب ولِقـاي خـوا. ج بالفِعل ايمانيان بە تۆ هێنابێ يامُهَيّا بن دڵيان بە زيغي كفرو ضَلال ڕەق نەبوبێ

زاتاً ئەوانە إستفادە لە إنذار ئەكەن ﴿لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ﴾ ئەزانن هەر خوا مالكي يوم الدينە هەر ئەو صاحب وناصرو مُعينە، بىێ اذنـي ئـەو تكـا نيە. ايماني صحيح بە ڕۆژي جزا ئەبێ وابێ، ئەو ايمانە سَوقي مؤمن ئـەكا بـۆ عَملي چاك. ئەوەي إعتمادي لەسەر شفيع وفِديە بێ لە عمل زۆر فەرقـي لەگـەڵ مُنكري قيامەت نيە. گەرچی جەنابي حەق ئەفـەرموێ ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ۝٥١﴾ أمـا رجاي كبريائي واقعيە. حقيقة ئەوانە چ گەورە بن چ گچكە، چ شاە بن چ گـەدا، چ وَضيع بن چ شَريف، چ پۆشتە بن چ ڕووت.

﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾ زينهـار ئەوانــەي سـبەينەو ئێوارە أي على الدوام لەبەر خـوا ئەپاڕێنـەوە قـرآن ئـەخوێنن نوێـژي سـبەينێ وئێوارێ ئەكەن، دەريان نەكەي لە مجلسي خۆت. هەرچـەند عَظَمـەت وجَبروت ولووت بلّندي أعاظمي قُريش قبـول ناكـەن لەگـەڵ ڕووت وبـووتێ وەك (سُـهَيب وعَمار وخَباب) لە مجلسێ دانيشن ئەو ضُعفايانە وەك (هِرقل) بە (أبو سـفياني) ووت: (أتباعي رُسُلن) كِبرو أنانيەتيان نيە ببێتە مانع لە ايمان وإطاعة.

﴿يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ﴾ قَصديان بە دوعاو عبادەت لاي خوا، رەضامەنـدي ويـە. چ وَجهي ديكـەيان مقصـود نيـە، بـەخياليان دا نـاێ ئـەمڕۆ ياسـبەي ئـەبن بـە صاحِب جاە. لەوەتي مكاتب ومدارسي ڕەسميە دامەزراوە تائەمڕۆ على الأكثـر حتّى لە صەدا نـەوەدوپێنج (٩٥٪) أولادي فُقَرا نجاحيـان ئـەبێ نمـرەي عـالي وأعلى وعَلّيُ الأعلى وەرئەگرن، أولادي أغنياو أقويـا ياڕاسـب ئـەمێنن ياإكمـالن يابەيەك دوو نومرەي ياد دەرئەچن، ئەوەش ممكنە لە ڕووي رياو رعايەت بێ.

سبَبَيان لە من پرسي ووتم أولادي فقراء كە إذن بون هيچ نيە پێـی مشـغول بن بە غَيري دەور تەماشاي كتێب ودەرسي خۆيان بۆيە لە خارجي مكتب سعي ئەكەن، أما أولادي أغنياء هەزار شتيان هەيە لە أسبابـي لـەزەت وتُـرَفْ تيـاي ڕوو ئەچن ئاگاشيان لە كتێب ودەفتەرو قلمي خۆيـان نيـە. ديـني فِطـري ئـەبێ لەگەڵ فِطرەت بـڕوا شـان بـە شـان ئـەو ضَعيفانە فِطرةً قابـل تـرن بـۆ ايمـان

وإهتداء، أقوياء على الأكثر فطرەتيان تێك چووە، وەرسالەت ودينى عام ئەبێ وابێ، نەوەك سياسەت هەر بەلاي قَوي دا بتراشێ ضُعفا بكاتە بەردەبازو كێسكى بەر پێ يان. ﴿مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ﴾ هيچ حساب وكتابي وان لەسەرتۆ نيە ﴿وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ﴾ هيچ حەق وحسابي تۆ لەسەر وان نيە، يَعني نە لە جِهەت تۆلە سەروان نە لە جِهەت وان لەسەرتۆ، سَببي طرد وتبعيديان نيە. ﴿فَتَطْرُدَهُمْ﴾ مادام وابێ چۆن طَرديان ئەكەي؟ ئەگەر طرديان كەي بێ موجب ﴿فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ ۝٥٢﴾ خۆ ظلم لە تۆ ناوشێتەوە. حقيقة رَأي وفكري صاحب رسالەت بۆ إستجلابي گەورە گەورەكاني قُرَيش زۆر صَواب بو ئەگەر ئەوان مسلمان بوبان كۆسپەي زەلام زەلام لەرێى إنتشاري إسلام لادەچو، لكن عَلاّمُ الغيوب ئاگاداري (ماڤي النفوس)ە ئەيزاني ئەوانە ايمان نايەنن هەر اقتراحێ ئەيكەن لە عِنادە، ئەگەر مقترحاتيان بێتە جێ پەلەي گەورەتر ئەكەن وەپێى گەورەتر ئەگرن. وەتازە خوا ئەمري كردە پێغەمبەر كە بلێ من غَيب نازانم. ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ﴾ بەو نوعە إمتحانە بعضێ إنسان بە بعضێ إختبارو تجربەمان كردوە، تاكو قەلّپ وصاغ بەدەركەوێ. ﴿لِّيَقُولُوا أَهَٰؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا﴾ نتيجەي ئەو تجربە، ئەوەيە، أقويايەكان لەرووي استهزاوە ئەلّێن ئايا ئەوانەنە خواي تعالان لە بەينيمە زياد لە ئێمە مِنَّهتي هِدايەت داني داناوە لەسەر شاني وان؟ ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ۝٥٣﴾ ئايا خواي تعالى عالم تر نيە لەوان ولەتووش بە وانەي كە شكري نعمەت ئەكەن؟ ايمان وعلم بە نعمەت ئەزانن شكري خواي لەسەر ئەكەن كفرو جَهل بە نَقمەت حساب ئەكەن خۆيانى لێ ئەپارێزن، طبيعي كێ قدري نعمەت ئەزانێ، خوا إنعام لەگەلّ ئەو ئەكا، ئەوەي قدري نعمەت نەزانێ، لە دەستي ئەڕوا، جارێ تر بۆي نايێتەوە. مع الاسف مسلّمانان قدري اتحادي كلمە وعِزّي سيادەتي خۆيان نەگرت لەجێگەي شكراني

نعمەت ومحافظهي، طاغي وياغي بوون. هەر قَومە بۆ لاي خۆی ئەکێشا بەیەك مشغول بون، آخري ئەو نعمەتە عُظمایەیان لە قیس چوو، بڕواناکەم بێتەوە دەستیان، مەگر بە عنایەتي ربّاني وەرعایەتي حَمَداني ﴿وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئەوانەي ایمان بە اياتي خوا دێنن (مِنْ بَعد) جوستە جوستە دێنە لاي تۆ ﴿فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ﴾ سلامی خواتان لێ بێ ﴿كَتَبَ رَبُّكُمۡ﴾ نوسیتی ثَبتي كرديە ربّي ئێوە ﴿عَلَىٰ نَفۡسِهِ﴾ لەسەر خۆی ﴿ٱلرَّحۡمَةَۖ﴾ لەڕووي مَرحَمەت ڕەحمەتي لەسەر خۆي لازم كرديە، لەو ڕوو وە هیچ جَبري لەسەر نیە، من جملەي ڕەحمەتي ﴿أَنَّهُۥ مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ سُوٓءَۢا بِجَهَٰلَةٖ﴾ لە زەماني كُفري بە هەڵ خەڵەتاندني مُعاندەكان یا مَیْلي شَدید كە ئاگاتان لەخۆ نەبوە، تَأمُّل بكەن لە قُبح ومَضَرەت ومَذَلّەتي ﴿ثُمَّ تَابَ﴾ بە ایمان بە پەشێماني ﴿مِنۢ بَعۡدِهِۦ﴾ دواي ئەو خراپە كردنە ﴿وَأَصۡلَحَ﴾ چاكە بكا ﴿فَأَنَّهُۥ﴾ خواي تَعالى ﴿غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٤﴾ تجاوز لە ماسَلَف ئەكا ئەوەي ڕۆي ڕۆی پێی مؤاخَذ نابن، بە ایمان وعملي صالح أثري سیّئات لە نفستان دا نامێنێ ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ ئاوا ئاياتي مُنَزّلە دەربارەي ئەوانەي إهتِدا ئەكەن وەئەوانەي لەسەر عِناد ئەمێنن، ایضاح وئاشكرا ئەكەین كە گرێی نامێنێ ﴿وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٥٥﴾ كەكەس شكي نەمێنێ ئەوە ڕێگاي گوناه كارانە، لەبەر مە يلي فِسق وفجور پێی دا ئەڕۆن، نایەنە سەر ڕێی ڕاست. ایضاحي طريقي هِدايەت مُستَلزِمە بۆ ئاشكرابوني طَريقي ضَلال. ﴿قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ﴾ لە طَرَف خوا لە طَرَف وِجدان وضَمیر لە طرف فِطرەت مَنع كراوم لەهەمو جِهەت طَبيعي وشَرعي ﴿أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۚ﴾ أصنام وهياكل وتماثِل وأرواح وإلاهي مَوهومە مخَیَّلە غَيري ذاتي واحِد واجب الوجود

خالقي أكوان غالِب فوقَ الكُل، چى دي ناپەرستم ﴿قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهْوَآءَكُمْ﴾ دواي هەوا و هەوەسي ئێوە ناكەوم، ئەوانەي غَيري خوا ئەيان پەرستن هاواريان ئەيەنە بەر، لە موجوداتي محققە نين، حُجَّەت وبرهان لەسەر وجودي وانە نيە، مَوهومات وخَيالاتن، عبادەتي ئێوە بۆ وان، مَحضي إتّباعي هەوايە، مەيلي دەنّي ودونّي ونَفسيە، من دواي ئەو ميول وأوهام وخَيالاتي خسيسەي فاسدەي باطِلە، ناكەوم، حَتّى بۆ إستجلابي خاطري ئێوە موافقەي ميولتان ناكەم.
﴿قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا﴾ ئەگەر دواي هەواو هەوەسي ئێوە بكەوم من گومراە ئەبم ﴿وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ۝٥٦﴾ لەو وەقتەدا لەو حالەدا ئەبیّ من ڕێم بە حەق نەبردبێ. ﴿قُلْ إِنِّى عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى﴾ من لەسەر ايات وحُجج ودَليل وبُرهاني، واضح وئاشكرام، خالِصْ لە شائبەي مەيل ووەهم وخَيالي فاسِدە. ئەو بَيّنەي بَيّنە لە طَرَف خواي خۆم بۆم بووە. وحي وعَقل واياتي بَراهِني أنفس وافاق، من سَوق ئەكا بۆ عبادەتي خوایّ واحد وبيّ شَريك ونَظير وضدوند.

﴿وَكَذَّبْتُم بِهِۦ﴾ ئێوە تكذيبي (ما أنا عليە)ئەكەن لە وَحي وسائري اياتي بَيِّنات، تكذيبي عقل ئەكەن، بە مُقتَضاي وَحي إنذارتان ئەكەم لە جياتي بترسن خۆتان بپارێزن، لە ڕووي تكذيب، إستعجالي پيّ ئەكەن، مَعَ أنَّه ﴿مَا عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ﴾ ئەو عَذابەي ئێوە تالوكەي پيّ ئەكەن ئەلّێن كوا؟ دەبا بيّ، لاي من نيە، بەدەست من نيە. ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ حكمي قضاو قَدَر تصرف لە شئوني عباد هەر بۆ خودايە. گوێتان ليّ بيّ خوا پەرستينە بەسيە چيتر إيمان وكفر تێكەلاّو مەكەن، بە إتباعي هەوا حكمي تدبير وتصرف لە أمم لەعالەم مەدەنە غَيري خوا، الهەكانتان ناگەن بەپێغەمبەر ﴿يَقُصُّ ٱلْحَقَّ﴾ قطع بە حەق دادێنیّ تتبعي حەق ئەكا، ئەوەي بۆ رسُلان بفەرمويّ، حەقە بيّ شُبهەيە، ئەوەي بۆيان ئاشكرا بكا لە غَيب ڕابردو و ئاتي

مُطابقي نفس الأمره، وەك حكايەتي قَصّاصان نيـه. ﴿وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰصِلِينَ ٥٧﴾ منازعه ئەبڕێتەوه تفريقي حەق وباطل ئەكا كەس وەكي وي نيه له هەمو كەس چاكتره. جەنابي حەق ئەگەر چی قَطعي دابري ئەو نوعه ظالمانه ئەكا، أمّا تـا بەحەق مُستَحَق نەبن، نايكا، حَتّا ئەگـەر بزانـێ لـه نَسـليان أهلـي إيمـان پەيـدا ئەبن، ناين فەوتێنێ، له غايەتي صَبرو علم وحِكمەته، له نِهايەتي رؤفي وڕەحمي دايـه، كـەسـي تـر وايـه؟ ﴿قُل لَّوۡ أَنَّ عِندِي مَا تَسۡتَعۡجِلُونَ بِهِۦ﴾ ممكـني بـا بەدەستم با ﴿لَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۗ﴾ كاری بـەیـني مـن ونێـوه تـەواو بوبوو، من كەي ئەوەنده تحملم هەيه؟ چۆن ئەزانم له ئێوه مسلّمان پەيا ئـەبێ يان نا؟ ئەو علمي غَيبه، بۆ من نيه. ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ٥٨﴾ كێ كفرو ضلالي وا له دلّ ودەماغ وخوێنی راسخ بووه، تأثيري كرديه به نَوعي كه قابلي إيمان نەبێ ئەوەي لێی پاش ئەكەوێ به حكمي وراثي فاجرو كـافر ئـەبێ؟ كـێ لەوه كەمتره؟ پاش سَعي بۆ إرشادي إيمان دێنێ؟ حاصلي دەرەجاتي شِدّەتي ظلم وكفر هەر خوا ئەيزانێ به تـەواوي بـێ إشتبا، (كيـف لا؟) (چـۆن وانيـه؟) ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ﴾ هـەر نَـوعـه غيبـه كليلێكـی هەيـه ئەوەي كليلەكەي لابێ وەبيزانێ دەرگاي غَيبي بۆ ئەكرێتەوه، غَيب ئەزانێ.

ئەوەي لاي نەبێ يالاي بـێ وەنـەيزانێ، غَيبـەكـه نـازانـێ. ئـەبيني تلغـرافي بە(شوفره) ئەوي مفاتحي ئەزانێ، نايزانێ مع أنّـه ئـەي بـينێ، ئەيخوێنێتـەوه، بەوگوێره نوسراوه. ئەو غَيبي كليلي لاي خوا بێ، غَيري خوا، كليلەكـه نـازانـێ، غَيري خوا كەس ئەو غَيبه نازانێ بۆي كشف نابێ. غَيب مُقابلي شهود إستعمال ئەكرێ، كه عبارەته لەأموري مَعَنوي عقلي غَيره محسوس به حَواسـي حَيـواني نازاندرێ، وەمقابلي حضوريش ئەگوترێ، كه عبارەته لەومحسوساته حِسّي پێ ڕاناگات، أما قابله حِسّي بكاتێ وەبزاندرێ. وەگەلێ لەمانه بۆ كەسێ غَيبـه بـۆ كەسێ تر حضوره. ئەو أموري غيره حاضره بعضێ بوين بعضێ نـەبوين، أمـا

ئەبن، لکن ئەمڕۆ لە دائرەی إمکانی إستعدادی وإستقبالین. جەنابی حەق بۆ زاناندنی بعضیّ غیوب سیّ مفتاحی دانایە بۆ إنسان: عقل، خیال، حَدس.

بە (عقل) أموری کُلیّە جُزئیاتی ما فوق الطبیعة ئەزانیّ وأساساً بَشَر علمی بە وجودی خوا بە واسِطەی عَقله، بە (خیال) أموری محسوسەی غیره حاضری ئەزانیّ بە نَوعیّ کأنّه (قد رأى وقد سمع) أکثری سائلی علمی هَیْأت بە (خیال) زاندراوە مثلا أنکاە نسبەتی بەینی شمس وأرض ی زاناند لە وەضعیان فکری أحوالی أقالیم بە گوێرەی ئەو نسبەتە ئەزانیّ وە(کذا) زانینی خسوف وکسوف پاش ظبطی حرکە بۆی ئەبیّ لە خَطی إستوا تا ژێر قطب ئەوەی علمای (فلك) بەخیال ووتیان سَیّاحان طبق الفعل بالفِعل مشاهدەیان کرد بۆیە علمای هَیْأت لە أکثری تعلیقات أم بە (تَخَیُّل) ئەکەن، بە (حَدس) ئەو محسوساتەی کە لە مەیانی محسوساتان گوم بووە حِس نایگریّ إنسانی ذی الحَدس إنتباهی بۆ ئەبیّ ئەیزانیّ ئاشکرای ئەکات وەك مسألەی (نورُ القمر مستفاد من الشمس) عالەم تبدلاتی قَمَری ئەدیت دوورو نێزیکی لە شمسی مشاهدە ئەکرد أمّا نەیان ئەزانی (قَمَر) جرمێکە وەکی أرض بیّ نورو صقَلە عکسی نور ئەداتەوە ئەو حکم وسببەیان نەدەزانی (حَدس) قوّەیّ زۆر عظیم ونافِعە أما (مِلّیون) سَبَب بە بعضە إعتقادیاتیان لێی مَحرومن (طبیعیون) بەو قووەیە ممتازن. وەبعضیّ محسوسات لەبەر غایەتی صِغَری حِسّی پیّ ناکەویّ بە آثار صاحبی قووەی حَدسیە انتباهی بۆ ئەبیّ آلات وأدوات إبرازی ئەکا وەکی (مِکروب) وەیاخود حجابیّ لە بەینا هەیە حِس نفوذی تیّ ناکا ئەگەر بکا ئەیزانیّ وەکی ناو دەرونی بَشَر أرحام وغیر أرحام ئەویش ئەمڕۆ بەزگ درین وتَبّاری (ڕوتکین) پەردەی لەسەر هەردەگیریّ، ئەو نَوعە غَیبی تەواو نین، مَستورن، گەرچی إزالەی ئەو سەترە لە نَظَری (ملّیون) مُستبعد یا محال بو، أمّا لەلای سەرامەدانی علم نێزیك وواقعە، ئەو نَوعە باناوی لیّ نێین بە غَیبی إضافی، ماوەتەوە ئەو أمورەی بوین چۆن بوین؟ یعنی بَدأی فطرەت ئاسمان وأرض وڕۆژو مانگ چۆن تکوینیان کردیە؟ لەکەیەوە ئەو أرضە بویتە مَقَرّی بشر؟ حَیات چیە؟ لە

کوێوە هاتیە؟ ماوەتەوە (تطوري أُمَم) (تَبَدّلي نَظمي عالەم) ئەبیٚ؟ کەي؟ چۆن؟ مفتاحیان لاي خوایەو بەس. هەرچەندە بَشَر سعي بکا لە (ظَن) زیاتري چەنگ ناکەویٚ. بەچی ئەتواني جَزم بێنی أرض لە رۆژ مانگ لە أرض جودا بویتەوە؟ بەچی ئەتواني یقین بکەي إنسان ومەیمون لە أصلیٚ پەیا بوین؟ عُمري أرض ئەوەندە ملیون سالە؟ بَشَر ئەوندە ملیون سالەیە لەسەر أرض ئەژي؟ بەغَیري خرس وتخمیني چیتر چەنگ ناکەویٚ. منظومەي شمسي کەي تێك ئەچیٚ؟ بەلیٚ ئەگەر إیقانٍ بکەین بە قوەتي جاذِبە ودافعە لە بەیني شمس وسیارات وأقمار (وَیوماً فیوماً) چەندي لیٚ کەم ئەبیٚ ئەتوانین بلێین بەئەوەندە سالە ئەو قووەیە ضعیف ئەبیٚ شمس وقمر گرد ئەبنەوە کواکب إنتشاري ئەبیٚ بەو شَرطە بزانینِ ئیتر إمداد لە هیچ طَرَف نایٚ، ئەو مفتاحە بۆ بَشَر چۆن معلوم ئەبیٚ؟ خصوصاً (ملّیون) چۆن ئەزانن فلان رۆژ فلان سالٚ و ارادەي إلاهي تَعَلّق بە تێك داني ئەکا (هَیْهاتَ) چەند سالٚ لەمەو پێش علماي تقویمي (ایران) بەنامي نامەي حضرەتی صاحب الزّمان (تقویمیان) إستخراج ئەکرد بەحسابیٚ چروك وتوررەهات إعلانیان ئەکرد لە تأریخي ١٣٥٢ هجري (مهدي أفندي) ظهور ئەکا، گەلي سَبُك مَغزاني ئێمە بڕوایان پیٚ ئەکردن ئەوە سالي ١٣٥٤ هجریە نە خبر هەیە لە مَهدي نە أثَر، ئەو وەختە ووتم ئەگەر خوا بمان ژێنیٚ درۆیان دەرئەکەویٚ. (شێخ أبو علي) بۆ تصدیقي فرمایشي رسولي أکرَم (کذب المنجمون) ئەفەرمویٚ: کەسیٚ ئەتوانیٚ جَزم بە حادثەیە بدات کە علمي بە عِلّەتي تامّەي ئەو شتە ببیٚ بە حصولي شرائط و رَفعي موانِع. ئایا ئەو علمە بۆ کیٚ ئەبیٚ؟ وەکەسیٚ لە أمارەت و عَلامەت جَزم بکا خَبَر بدا، درۆ دەکا. خُلاصە مفتاحي حوادثاتي اتیە، عِلّەتي تامّەیە، کەسیٚ عِلّەتي تامّەي ئەو شتە بزانیٚ وەبزانیٚ کەي ئەبیٚ، ئەزانی ئەو مَعلولە لەو وەقتەدا ئەبیٚ، بەلاّم ئەو علمە بۆ غَیري عَلاّم الغیوب (جَلَّ جَلالُهُ) نیە، أما وحي وإلهام ئەوانە مفتاح نین، شتیٚ لە طرف خوا ئەکەویتە قلب ذاتیٚ ئەڵیٚ وائەبیٚ، عِلّەتي چیە؟ نازانم خوا ئەیزانیٚ. ئیتر با لێرە بەس بیٚ إنشا الله لە آخري سورەي (لقمان) هەندیٚ تَفصیلاتي تر

عرض ئەكرێ. پاش ئەوە ماجَرايەكم هاتەوە خاطر حەز ئەكەم لێرە بينوسم، مامۆستا (مەلا ئەحمەدي تۆمەر گومبەتي) زاتێ زۆر گەورە بوو ئەتوانم بلێم بە حەق (وَلي) بوو عمرێ زۆري لە شرع وتقوا ڕابوارد بعضێ أشعاري (مَهدي نامهي) لەبەر بوو گەلێ جار ئەوانەي ئەخوێندەوە:

بەحەفتي دي دەجالي شئوم
بەهەشتي دي مَهدي يَقوم
قَط دەرناچێ لەو مُدَّەتێ.

وەهەمو جارێ زەلزەلەي دەكەوتە جَسَدي، ڕۆژێ عرضم كرد مامۆستا! چەند ساڵە ئەو شعرانەت لەبەرە؟ نەختێ تَأَمُّلي كرد ووتي يارَبِّي خوا خێرت بنوسێ ترست لە دڵ بردمە دەر، من پەنجا ساڵ زياترە ئەوانەم لەبەرە وەگەلێ پێش وەلادەتي من ئەو (مهدي نامە) داندراوە. خودا دەرەجەي عالي كا بەبەرەكەتي وي لەمەش خۆش بێ.

﴿وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ﴾ ناشكري نەبێ كوردي نە علمي بەرري هەيە نە علمي بَحر، نازانم بە كوردي بلێم چي؟ چيايان هەيە، ڕەن وشيوە دۆل وبانوو باسك ونەرمان چەركان وڕەقين و چەقێنی چۆڵ، جۆگەو ڕوبارو زێ يان هەيە، جار جار مُقابلي بَحرو ايشكاني ئەڵێن ئەوەي لە بەررو بحر بێ خوا ئەيزانێ لێ گوم نابێ.

﴿وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا﴾ بەرنابێتەوە هيچ گەڵاێ لەهەر دارێ لەهەر جێی بێ إلا ئەيزانێ ئاگاي لە بەربونەوەي هەيە وە ئەزانێ چۆن إنحلال ئەبێ وئەبنەوە، عناصري سابقي. خۆ معلومە گەڵای داران بە مليارو كاترليون لە إنسان زياترە، كەوابێ بە طريق الأولى هياكلي ساقطي بَشَري، لێ بزرنابێ.

﴿وَلَا حَبَّةٍ﴾ دانە ﴿فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ﴾ كە ئەو حبّاتە منشأي حَياتە لەبن خۆلی كێلگەو قەڵشتو كون وكازێركي ﴿وَلَا رَطۡبٍ﴾ تەڕ ﴿وَلَا يَابِسٍ﴾ هيشك. هەرچی لە عالەمي طَبيعي دابێ يان تەڕە يان هيشك، گەرم وساردیش بەر

ئەکەوێ، حارّ ورَطب، حارّ و یابِس، باردو رَطب، بـارِد ویـابِس، هەرچـی بـبیّ إلا خوا ئەیزانیّ ئاگاداره بەسەري، إلاّ أنّهُ له بَدَل ئەو عبارەتە ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ۝٥٩﴾ (لَوْحَ المحفوظ) یا علمي خوا به صَفایحي گون ومکـان. علمـي خـوا وەکـي حکمـا ئەفـەرمون حضـوریه، وینـەي علمـي بَشَـر نیـه. بـیّ چـاپ وحصولي صورەت بیّ عَقل وذِهن، صورەي موجودات، صـورەتـي علمـي ویـه. خۆیان خۆیاني بۆ ئەنوێنن حاجەت بەدارنیني صورەت نیه.

کتاب ومافي الکتاب بۆوي ئاشکرایه. فلکیّـونـي سـابق وتویانـه فلك نەتـەرە نەهیشکه نەسارده نەگەرمه نەخفیفه نەثقیله، ئەو غلطه، هەرچـی لـه عالـەمـي وَضع وتَمَیُّز دابیّ، یارطبه یا یابِسه. وەهَیأتي جدیدیش لەسەر ئەو فکرەیه.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ﴾ وامـەزانن تـاریکـي شـەو ئێـوه لـەخوا بـزر ئەکا، ئازانیّ چ ئەکەن، ئەنون بەخەبەر ئەبن لەکاتي بەخەبەري بەچي مشغول ئەبن لَهو لَعب یاعبادەتُ وطاعەت یامصالحي أُمَّەت یامفاسِدي عـام، بەتـەواوي حسـابتان ئـەبینیّ ﴿وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ﴾ ئـەوەي لـه ڕۆژدا کردوتانـه ئـەیزانیّ ﴿ثُمَّ﴾ پـاش شـەو ﴿يَبْعَثُكُمْ فِيهِ﴾ لـه ڕۆژیّ دا بلاّوتـان ئـەکا هەریەك بەدواي ئیشـیّ دا وەك حیوانـات لـه هـۆلّ و مۆرگی سَـوق ئـەکرێن بـۆ لەوەڕ ﴿لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى﴾ ئەو أجَل ي معلومه لاي خوا، بی جیّ بیّ وتـەواو کـریّ ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ﴾ پـاش مـردن گەڕانـەوەتان بـۆلاي خوایـه، یـاجێی گەڕانەوەتان لەلاي خوایه ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۝٦٠﴾ لەشەو ڕۆژدا. له تـأریخیّ لـه بغـدا بـوم لەسـەین وبـەیـني تصدیق ورفضـي مُعاهَـده، شِـدّەتـي مذاکرەي مجلس، لەسەر مسألەي هامّه، شەویّ تەماشام کرد له مَقرّي عسـکري إنگلیز به ضیاء مخابرەیان ئەکرد حروفاتـي نوریـني لـه جَـوّي سَـماء ترقیمـي ئـەکرد، وه جمـاعَتي لـه أهلـي بغـدا دەورەیـان دابـوو لـه (أسـتاذ إبـراهیم طمبورەچی) بەزم و ڕەزمیان ئەکرد، تابوبه بـەیان مـن لـەجێی خـۆم نەخـەوتم

تەماشاي حال وضَعیەتم ئەكرد دەبینی ئێمە بەچی مَشغولین؟ ئەوانیش بەچی خەریكن؟ مَعَ أَنَّهُ دەعواي استقلالیەتمان ئەكردن بەو حالە بچینە مَصالِي دوهلي راقیە؟

تَنبیە:- لَوْحَ المَحفوظ چیە؟ بە چ نَوعە خەتێك شتی تیا ئەنوسرێ؟ حَقیقەتي (لَوْح) بەراستي مَجهولە بە رأي نازانـدرێ خەبەرێكی مقطوع بِە لە طرف حضرەتي رسالەت پەناە بە ئێمە نەگەیشتوە. أصحابي كشف دائِماً لَوْحَ المحفوظیان لەبەر چاوە واگومان ئەبەن ئەوەي تیایەتي بەخەتي عەرەبي نوسراوە، ئەوە، (نەي مَعلوم). كتیب ولَوْح وقَلَمي إلاهي وەكي ئێمە نیە، بنۆڕنە قەواني (گرامەفۆن) ئەو خطوطي بە نوكي دەرزیلە لێی نوسراوە چۆنە؟ چۆن ئەخوێندرێتەوە؟ ئەو إهتزازي هەوا كە لە قسەي بَشَري پەیا ئەبێ چ لە هەوا چ لە صَمّاخي گوێ دان چ لە إسطوانەي (گرامەفۆن) چ نەقشێ ترسیم ئەكا؟ ئایا ناظري لَوْح المَحفوظ ئەگەر تەماشایان كردبا بێ وەي كە بۆیان لێ بدرێ، (مالي فُتِنْتُ)ي (أمّ كلثوم)یان چۆن ئەخوێندەوە؟ ئەو هەمو علوم وعبارەتە لە ذِهني إنسانێ چۆن ئەنوسرێ؟ چۆن ئەخوێندرێتەوە؟ اي واهەبو قَریبي ملیۆنەكي أشعار لەبەر بوە، لەچی خَزّانەیەك داندراوە؟ كو حِفظ كراوە؟ (جَلّ الخالِق وعندَهُ مفاتِحُ الغیب لا یعلم اِلاّ هو) ﴿وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ﴾ غالبە ﴿فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ﴾ فوق الكُلِّ ي في الكُلّه)ە بە قوەت وبە قدرەت وبە علم وَهكَذا ئەتوانێ هەرچی پێتان بكا، پێتان بكا، أمّا ئەو قَهر وغلبەي إلاهي بۆ تَدمیر وتخریب نیە. لەسەر ئەو حالي خۆیو حالي ئێوە ﴿وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً﴾ (مَعَ أَنَّهُ) حەقي بو لەسەر ئەو شِرك وضَلالە پارچە پارچە هەلا هەلاتان بكا. (حَفظَة) لە طَرَف هەمو مُفَسّرینان بە ملائكە تَفسیر كراوەتەوە، حَتّی (سیّد رشید)ي مَرحومیش وارۆیشتیە، لام وایە ترساوە. لە زەماني سابق ئەو نَوعە كلماتە بە (مَلَك) تفسیر نەكرابا فَهم نەدەكرا، باوجودي هَیكلە لي إنسان چ قلعەێ پڕە لە ذَخائري حرب وطَرَبْ، هەر نەدەهاتە آذان وأذهان، لكن حَفَظَهي ڕاستي بە أمرو

تدبيري إلاهي، قواي مُدافعەو ممانَعەيە، ئەو قوايە لە طَرَف حضرەتي باري ئەنێردرێتە ناو بەدەني إنساني محافظە ومُدافعەی أمراض وعوارضي خارجی پیٚ ئەكا، بەدەنی إنساني عادةً جێی مَعركەو مەيداني حَربە لە بەينی جيشي صحەت وحياه لە بەيني لەشكري نەصاغي ومردن (والحربُ سِجالٌ) ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ﴾ هەتا سوپاهي ژيان مَغلوب ئەبیٚ، ئەو كەسە ئەمریٚ، ئەو وەقتە ﴿تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا﴾ ملائكە روحي وەرئەگرن بۆ مَقَرّي كە خوا ئەفەرمویٚ ئەيبەن. عمومي (ملّيّون) حكماي إلاهيّون مُتَّفِقن روح بە خراپ بوني بەدەن نافەوتیٚ، پاش مُفارَقە ئەمێنیٚ، لەو بەينە تا حشري جِسماني چی ئەكەن؟ لە كویٚ ئەبن؟ چيان بەسەر دیٚ؟ غَيري خوا بەڕاستی وڕاستی كەس نايزانیٚ، زێرا مِفتاحي ئەو مَعلوماتي غَيْبيە لاي بَشَر بەڵكو لاي مَلَك نيە، وە شرح وإيضاحي لە طَرَف حەق بۆ رُسُلي كِرام لە لوازِماتي رسالەت نيە. (حَفَظە) هەرچی هەبیٚ ﻙ مردن هات، چيان پیٚ ناكرێن نَبَردیٚ وايە (مَلَك) ناتواني لە پێشی ڕاوەستیٚ. مردن بەكەس چارەي ناكریٚ غَيري خوا، ئەويش ئەوا جاریٚ نايكات.

هەرچەندە حكماي عَصر سَعي ئەكەن بۆ إدامەي حَيات، بیٚ فائِدەيە، چارەيان پیٚ ناكریٚ، مع الأسف بە أكثريەت ئەوان لە خەلكي دي زووتر ئەمرن، هەرچەند بۆ تمديدي حَيات (سيگورتە) ئەكەن أمّا مُقابِل بە طوارِئي خارجي چی ئەكەن؟ غيبیٚ بیٚ مِفتاحە (وَعِندهُ مفاتِحُ الغيبِ إلاّ هو).

﴿وَهُمْ﴾ رُسُلي إلاهي ﴿لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾﴾ قصور ناكەن تجاوز لە حَد ناكەن. ئەو كلمەيە بە دوو وَجە خوێندراوەتەوە لە إفراط لە تفريط وەرگيراوە، زاتاً ژياندن ومراندن عائدي خوايە نە بە تَقصير نە بە تَجاوَز، دەخلي كەسي تيا نيە. ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ﴾ مؤمن ئەزانیٚ مَرَدّ ومَرجِعي بۆ لاي خوايە، أمّا ئەو مُشرِكانە بە غَيْري خوا بە زەعمي خۆيان مَرَدّ ومرجعيان هەيە، لكن دواي مردن بۆيان بەدەر ئەكەویٚ كە مَرَدّ ومَرجع بۆلاي مَولاي حَقيقيە كە

خوداوەندیٚ واحِد وقَهّارە. عاجز نیە تا إتخاذي شُرکاء بکا. أَوْلَى ئەفەرمویٚ (عِباد) پاشان (علیکم) دوایٚ (أَحَدَهُم) ثُمَّ إلى رُدُّوا بە (جَمع). ئەو تَلوینىاتە بە گوێرەي فَنّي بَلاغەت مرحوم (سیّد رشید) تَفصیلاتیٚ زۆري فەرموە نوکتەي جوان جواني إظهار کردوه (رەحمەتي خواي لیٚ بیٚ). بَعضي لام وایە لەبەر (مَولاهم) ضمیري (رُدُّوا)یان بۆ (رُسُل) إعادە کردیە، لکن الحَقّ (مَولاهُمُ الحقّ) تَرجیحي رجوعي ضَمیر بۆ مُشرِکان ئەکا (فافهم). ﴿أَلَا﴾ پێش مردن ئاگادار بن ﴿لَهُ ٱلْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَـٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾﴾ ناشکري نەبیٚ چونکي کورد (حکمیان) نەبوە لە زوباني کوردي هەرچەند ئەکەم کلمەیە نادۆزمەوە ئەو مَعنایە بگەێنیٚ. تَفسیري قُراني واپان وبەرین بەزوباني کوردي تەسك وکورت حَقّ الإنصاف زۆر گران وزەحمەتە. حُکم هەر بۆ خوایە لەهەمو ژمێران لە ژمارە تیژترە لەسەر هیچ دانامێنیٚ، کەوابیٚ شریك وشَفیعي بۆ چیە؟ نەوەك فێري لیٚ کەن؟ لە محاسبە شتیٚ نەزانیٚ پێي بلێن؟ چەراکەکەي لە دەست قوتار کەن؟ حاشا مَعاذَ الله لەو أوهامە. ﴿قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَـٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ کیٚ نَجاتتان ئەدا لە شَدائد وأَهوالي بَرّي وبَحري کە دونیاتان لەبەر چاو تەنگ و تاریك ئەکا بە تاریکي باووباران فرتەنەي شەو؟ ئایا الِهەکاني خۆتان لەو نَوعە تەنگانە بە دلّ دادێت کە نجاتتان بدا؟ یَعني کەسیٚ نەتوانیٚ لە أَهوالي دنیا نجاتتان بدان ناتوانیٚ لە قیامەت نجاتتان بدا.

﴿تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً﴾ سەرزارەکي نا! بە عُمقي دلّ. ﴿لَّئِنْ أَنجَىٰنَا﴾ ئەگەر خوا نجاتمان بدا ﴿مِنْ هَـٰذِهِۦ﴾ لەو تەنگانە ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾﴾ ئەبین بە شاکِر داخلي زومرەي شاکران ئەبین. چ جایٚ کُفري شِرك وجحودي، کُفراني نِعمەتیش ناکەین. ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا﴾ لەو شِدّەت وأهوال تاریکیە ﴿وَمِن كُلِّ كَرْبٍ﴾ لەهەمو غەمان غەمیٚ کە دلّ ئەکێلیٚ سست ئەبیٚ، أَنَّهُ لەبار یەك دێتەدەریٚ، وەك زەوي بکێلدریٚ ﴿ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾﴾ لەو وەقتەدا ئەزانن

ئەگەر نجاتتان ببێ، هەر ئەو ئەیدا، وتَصَمُّم ئەکەن لەسەر ئەو ایمانە بمێنن، وَمَعَ هذا ئێوە إستمرار لەسەر شرك ئەکەن، وەقتێ کە شدّەتتان لەیاد نەما، وەوەفا بە سوێندو عهدەکە ناکەن. ئەو ساڵە کە بۆردومان کراین أوّل رۆژ لە کۆیە یوم أهوال وشَدائدم مُشاهدە کرد أوّل نەوبە هەڵ ئەهاتین لە هەیوان بۆ ژێر کۆشك. یەکێ ئەي ووت یاغَوث ویاغَوْث وغاري ئەدا، من وتم یاغَوث ویاغَوث ي چی پێ ئەوێ؟ ئەمرۆ خۆشی لەگەڵمان با هەڵ ئەهات بۆ کونێ خۆي ئەشاردەوە. دوایێ ئەو قسە گەیشتبۆوە (سیّد شێخ محي الدین) خودا عَفوي بکا فەرموي فلان زۆر بێ مُبالاتە چۆن ئەو نَوعە قسە دەربارەي (غَوْث) ئەکاە؟ ئەویش لە گوندي (ناصر آغا)ي ئەشکەوتێ هەبو سبەینەو ئێوارە کە طیّارة بۆ سەر (کۆیە) ئەهات لەو ئەشکەوتە خۆي ئەشاردەوە، پاشي بەینێك مُلاقاتمان کرد پێم ووت: (تۆش محي الدین لە عیني خانەداني بۆچی لە ئەشکەوتي پشیلان خۆت ئەشاردەوە؟ پێغەمبەر لەبەر قورەیشیان هەلآت لە (غار) خۆي شاردەوە مَعَ أنَّهُ نە طَیّارەیان هەبو نە بۆمبار، ئایا تۆ غَوْث لە پێغەمبەر بە زیاتر ئەزاني؟ بە بەردێ بریندارو دداني شکا، غَوث بەر بۆمبا بکەوێ زەرەري پێ ناگا). وەي وەي لەو جهلە! لاشَك لە جهەتي إعتقاد بەخوا مشرکي ئەو زەماني لەمشرکي ئەم زەمانەي ئەهوەن تربوین. ﴿قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ﴾ هەر ئەو ئەتوانێ دەسەلآتي هەیە، نەك إلاهەکانتان ﴿عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابًا﴾ بنێرێتە سەر ئێوە عَذابێ خوا خۆي ئەزانێ چیە ﴿مِّن فَوۡقِكُمۡ﴾ لەلاي سەرەوەتان ﴿أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ﴾ یالەژێر پێتان. ئەگەر عذاب لە خوارەوەش بێ هەر بەسەردا هاتنە. خوا ئەتوانێ بۆن بارانتان کا طوّفانتان بنێرێتە سەر غَرق بن بە جارێ بە بلەرزە دارو دیارتان تێك دا بەعارددا رۆچن. لە (إبن عباس) نقل ئەکەن مُراد لە (فَوق) أئیمّەیە یَعني روأساي خراپ، (تَحت) خدمەتکارە، ئەگەر ئەو مناسب بێ قابِلە تَفسیري (عَذابي مِن فَوق بە بۆردمانمان عَذابي من تَحت لە لَغمي پڕ لە مَوادي ناریّە کە ئاگر گرێ عالەمێ

بەرەو هەوا ژێرو بەر ئەكان بكەين). ئێوە لە هیچ جهەت لە دەست خوا قوتار نابن، ئەمجار نجاتي دان ئەمێنن، جارێ تر تووشي شَدائد وأهْوال وظلمات، نەبنەوە. ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا﴾ هەرچەند ئێوە ئەمڕۆ لەسەر عَداوەتي پێغەمبەر مُتَّفِقن، أمّا خوا ئەتوانێ تێكەڵ وپێكەڵ تان كا إختلافتان بخاتە بەينێ بتان كاتە فِرَقي مخْتَلِفە ﴿وَيُذِيقَ﴾ بەواوي عَطف لەسەر (يَبْعَثَ) يا (يَلْبِسَ)ە ئەمە نێزيك ترە أنَّهُ عَطفە تَفسيرە ﴿بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ﴾ شِدَّەت وقوەتي يەكترتان پێ بچێژێ ﴿انظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الْآيَاتِ﴾ اياتي قُراني بە گوێرەي تَحَوّلات وتَبدّلاتي أحوالات تَحويل ئەكەين لە نَوعێ بۆ نَوعێ مُتفاوِت لە مراتِبي ظهور ﴿لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾﴾ تێ بگەن فهم بكەن تەماشاي تبدلاتي عالەمي كَوْن وفَساد كەن.

﴿وَكَذَّبَ بِهِ﴾ بە قُران بە تَصريف وتَنويعي ايات، چونكي غافلن لە تَصَرُّف وتَحَوّلي أحوال ﴿قَوْمُكَ﴾ (مَعَ أنَّهُ) ئەبايە ئەوان سَبقەت كەن لە خەلكي تر ئەناسن شارەزاي أطوارو أحوالتن ﴿وَهُوَ الْحَقُّ﴾ ئەوەي ئەوان تكذيبيان پێ كرديە، حەقێ بە ڕاستيە. ﴿قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾﴾ وكيلي خوانيم، ئيشي ئێوە نەدرايتە دەستي من، لەسەر ئێوە تَسَلّطم نيە، تَصَرُّفتان تێ دا بكەم، دلّتان بێنمە سەر هِدايەت جزاي أعمالتان بدەم. ﴿لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ﴾ بۆ هەر خەبەرێ وەختێ ئەبێ كە قَرار گیربێ تياى وەتَحَقّق بكا، قەشمەري وإستعجال مەكەن. ﴿وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾﴾ رأي العَين ئەي بينن ئەيزانن بە تحقيق، أمّا چ سوود؟ لە (زَجّاج) نقل ئەكەن مُراد لە (لَسْتُ عَلَيْكُمْ بِوَكِيلٍ) ئەمرم نەكراوەتێ بە حَرب ومَنعتان لە تكذيب. ظاهر وايە لاي (إبن عباس)يش معناي ئەو جملەيە وابێ بۆيە ئەلێ ئەوە منسوخە لە ايەتي قِتال. (سَيِّدي آلوسي) ئەفەرموێ: (ئەمە دوور نيە بِنا لەسەر مَعناى ثاني). أمّا (إمام فخر الدين الرازي) ئەفەرموێ

دووره. مَرحوم (سَیِّد رشید) تأیدي قولي (إمام) ئەکا ئەفەرموێ: (جەنابي رَسول با ئەمري کرابیتێ بە قِتال، هەر پێغەمبەرە، شَریك ووکیل نیە). من نازانم (زَجّاج) چۆن ئەو معنایەي لەو ایەتە داوەتەوە؟ في الحقیقة لە أکثر مواقعِ کە ئەڵێن مَنسوخە، بەگوێرەي فهمي خۆیانە، لاشَك تا نَسخ کەمتر بێ، باشترە بۆ شَأني قُرآن ومَنزِّلي قرآني (لایَخفَیّ). ئەو ایەتە هەرچەندە خِطاب بە مُشرکانە، أما ئەبایە مسڵمانان چاك گوێی لێ ڕاگرن ولە گوێی گرن، وەیزانن إختلافي کلمە تَحَزُّب وتَفَرقە، یەکێکە لە عذابي خوا لە أثري غَضَبي إلاهي. هەر قَوم ومِلَتي عَداوەتیان کەوتە بەین، ضەربەیان لێکتر چێشت، بەیەك مشغول ئەبن، تاکو ضَعیف ومَلول ئەبن، دوژمن لەلاڕا بەسەریان دا غالب ئەبێ. وَفي الحقیقة بۆیە لەبەر ئەوي گوێ یان نەدا أمثالي ئەو ایەتە ئەو أُمَّەتە (یَوماً فَیَوْماً) إختلافیان زیاد ئەکا، ئەمڕۆ بێ هەراهەراي (بَهائيّ) و (قادیانيّ) و (سَلَفيّ) و (خَلَفي) جەنگ وجِدالي إجتهاد وتقلید، لە إشتعال دایە، خاصَّةً لە (موصل الحدباء)، وە علماي ئێمە مع الاسف مُباحثەیان لە دائرەي أدەب نیە، تَهَور وتحقیرو جوین وتکفیرە، زاتاً مُباحثەێ لەسەر ئەوەبێ، بۆگەنی ئەبێ. بعضێ ئەڵێن ئەمە إرادة الله یە ئەبێ هەر وابێ، سبحان الله العظیم خودا إرادە دەکا کافر متفق بن مسلّمان مختلِف بن؟ بعضێ ئەڵێن مادام پێغەمبەر خەبەري دایە، دەبێ وابێ، تاببێتە معجزەي پێغەمبەر. سبحان الله دیني إسلام زەلیل ببێ بێتە إنقراض ومەحو بۆ تحقیقي معجزەیەکي پێغەمبەري، مع أنَّهُ دائماً نَهي لە إختلاف ئەفەرموێ، یاربّنا ألآنیش ئەڵێن (إختلافُ أُمَّتي رَحْمَةٌ) حدیثە، مع أنَّهُ مُحَدِثي ئەو حَدیثهي نقل نەکردوە. خُلاصە لاشَك ئەو خطابە خِطابە لەگەڵ مُشرِکان أمّا لازمە مسڵمانان عِبرەت وەرگرن أمین نەبن لە عَذاب، لکن گوێ یان نەداێن تفرقەیان کرد بون بە دوشمني یەك، مغلوب وزەلیل بون، (ألآن کان کما کان) هەر فرقەیە لەسەر فکری خۆیەتی ڕوویان لە إتفاق ودۆستي نیە. (سَیِّد رشید) جَنَّة مکاني بێ لێرە تفصیلاتێ باشي هەیە نەمتواني بە تەواوي ترجمەي بکەم وبینوسم.

﴿وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ﴾ له أهلي شِرك وعِناد ﴿يَخُوضُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا﴾ گەمەو گاڵتەي پێ ئەكەن (مع أنَّهُ) دەبوايە پاش إستماعي ئەو ايەته عبرەت وەربگرن بترسن إيمان بێنن ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ ڕوويان لێ وەرگێرە مُجادەلەو مُخاصمەيان لەگەڵ مەكە بادرێژي نەدەنێ قسەي ناشيرين تر نەكەن ﴿حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ﴾ هەتا ئەچنە ناو قسەێ دي ئەگەر مجادلەيان لەگەڵ نەكەي زولادەدەن، وەإلاَّ تَمادي دەكەن له خَوضي في الباطِل. لاشَك حضرتي رسالەت زۆر ئارەزوي ئەكرد ئەوانە إلزام وإفحاميان بكا بە نوعێ زوبانيان ببەستێ نەتوانن ئەو جۆرە هَذَيانانه بكەن لەو دەمي ممكن بو، بۆ شَيطان إلقا آتي بكا، جەنابي حەق بەربەستي ئەكا ﴿وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ القاي قلبي رسول بكا تۆ پێغەمبەري چۆن قبول ئەكەي ئەوانه گەمه به اياتي خوا بكەن؟ برۆ مُجادەله ومُجاهَدَە بكه به قوەي بَلاغەت به إمدادي الاهي إسكاتيان بكه. خودا ئەفەرموێ بە قسەي هەڵ مەخەڵەتێ ﴿فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ﴾ پاش بەبير كەوتنەوەي ئەو أمري نَهيه. ﴿مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٦٨﴾ ئەوانه (حيدودن) مُتجاوز لە حَدْ دا دەبن دڵ ڕەقن قين له زگن إعتراف به حەق ناكەن، تا مناظرەيان لەگەڵ بكەي، خراپتر ئەڵێن. لێرە تفصيلاتيان هەيە دائر به نِسيان وإنساني شَيطان بۆ حضرەتي پێغەمبەر مراجعەي تفسيري (سَيِّد رشيد) بكەن شُبْهَ له عروضي نسيان نيه بۆ پێغەمبەرو سائري رُسُلي عِظام قسه له إنساي شَيطانه ئەويشمان إشاره بۆ كرد كه هيچ نَقصي تيا نيه بۆ حضرەتي رسول. حَقير لاي وايه وَسوەسەي شَيطان بۆ پێغەمبەران له جِهەت خَيرەوەيە. ﴿وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ رَسول وأتباعي. ﴿مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ﴾ چيان لەسەر نيه بالەو ڕووەوه شَيطان تحريكيان بكا: (ئێوه أهلي إيمانن أمر به مَعروف نَهي له منكر خاصَّةً ئەو نَوعە مُنكَرە لەسەر ئێوه واجبه ئێوه مُدافَعه نەكەن لەسەر اياتي خواكێ ئەيكا؟). خۆتان ئەزانن ئەمڕۆ ئێوه بێ دەسەڵاتن بەقوەتي بازو تاقەتي مُقابلەتان نيه،

بەزوبان مُقابَلە خراپترە، بەدتر ئەبێن، بناءً علیە زۆر حاجەت نەبو جەنابي حەق نَهیتان بکا. ﴿وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ﴾ وَعظ ونصیحەتیٚ بوو لە طَرَف إلاهي ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾﴾ لەڕووي خێرەوە هەلّ ئەخەلّەتێن، خۆیان بپارێزن لەوجِهەتە، توشي گوناە نەبن، نەبنە باعث ﴿وَذَرِ الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِ﴾ بە قرآن. وَظیفەی تۆ تذکیرە! لەسەر وەظیفەی خۆت دەوام بکە! بیان ترسێنە! پێ یان ڕابگەێنە! ﴿أَن تُبْسَلَ نَفْسٌ بِمَا كَسَبَتْ﴾ هیچ کەس خۆی نەداتە هلاکي خۆي بە عملي خۆی، بە ئومێدی کەس مەبن، غَیري خوا! ﴿لَيْسَ لَهَا﴾ بۆ هیچ نَفسي ﴿مِن دُونِ اللَّهِ﴾ هەرچی بێ ﴿وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ﴾ ناصریان نیە تکا کاریان نیە ﴿وَإِن تَعْدِلْ﴾ نفسیك ﴿كُلَّ عَدْلٍ﴾ هەر فیدیەیێ بدا، هەرچی بکاتە مقابلي خۆی بۆ نجات ﴿لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَا﴾ لێی وەرناگیرێ، قبول ناکرێ، هەزار فِدیەی وەك (عیسی) و (بوذا) وأمثالیان بە فلسێ قبولّ ناکرێ.

﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ أُبْسِلُوا بِمَا كَسَبُوا﴾ خۆیان کردە رەهنی أعمالي سَیِّئەی خۆیان ﴿لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ﴾ لە ئاوێ زۆر گەرم ﴿وَعَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ گەلێ بە ئێش ﴿بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾﴾ ئەوەي سەرمەستي بادەي غرور بێ، ئەبێ بەو شَراب وعَذابە، مُقابَلە بکرێ ﴿قُلْ﴾ یارَسول الله ﴿أَنَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا﴾ بێ قُدرەت نە نفعمان پێ ئەگەنێن نە زەرەر. ئەو قُومە بە کوفرو عِنادو گەمە بە ایەت کِفایەتیان نەکردوە. دەعوەتی موسلّمانان ئەکەن بۆ شِرك بۆ وەرگەڕان لە دینی حەق، خوا ئەفەرموێ بلێ یا رسول الله ئایا ئێمە تجاوز بکەین لە خوایێ قادِرو نافِع و ضار مَیْل و رَغْبْ بکەین بۆ شتێ بێ کەلّك و وَجە؟ ﴿وَنُرَدُّ عَلَىٰ أَعْقَابِنَا﴾ وەرگێڕینە دواوە ﴿بَعْدَ إِذْ هَدَانَا اللَّهُ﴾ ئەمە چۆن؟

حَقاً ایمان كه له دلّدا جێی گرت به هەمو و قوەتی دونیا ناچێته دەر. صاحِبي ئەو ایمانـه روح ئـەدا ایمـان نـادا ﴿كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ﴾ وەك ئەو كەسەي شَیطان هۆش و گۆشی بردبێ له وادي و بیاباني أرضـي گـوم بوبێ بەسەر گەرداني بخولێتەوه، ئێمه وەكي ئەو كەسه بین؟ قابِله؟ حاشا...

له نیو كوردان به مێردە زنۆكه، لەناو عەرەبان بـه (غـول) مَشـهوره، گۆیـا دەعبایێ (كریهُ المَنَظر) بانگی انسان ئـەكا، دواي ئەكـەوێ لـه ئـاوەدانـي دوری ئەخاتەوه بزری ئەكا، ئەمه له حَقیقـەت دا حـەق و حَقیقـەتـی نیـه، لـه أمـوري وَهمیه و خیالیّه یه. پێغەمبەر ئەفەرموێ (غول) نیه.

إمامي عمر ئـەڵێ: (كـەس نـاتوانێ خـۆي بگـۆرێ لـەو صـورەتـي كـه خـوا لەسەري لەگەڵي خَلق كردیه، أجِنّه سِحریان هەیه وەك سِحري ئێوه، یَعني بـه شَعْبَذَة و نەیرەنگ شتێ نیشاني انساني ئەدەن ئەگەر ئێوه شتێكی واتان چـاو پێ كەوت، بانگ بدەن، یعني دڵ بدەنه خوا هۆشتان ببەنەوه بەر خۆ ئەو شَبَح و مەبەحە نامێنی) رِضواني خوا له حضرەتي عمر بێ.

له أوائلی منداڵی من باسي مێردە زنۆكـه زۆر بـوو، أمّـا مـن سـعیم كـرد بـۆ رَفعي ئەو نَوعه خَرافاته، شكر ئێستا له (كۆیه) هیچ ناوو نیشاني نیـه، وه ئـەو حكایەت و خَرافاتـه أكثـر لـه لاي شـێخ و مێخـان بـلاو ئـەبۆوه. وه حكایـەتـي (خضر) و (ألیاس)یش وەكو حكایـەتـي (غـول) و (دێـو) شـكر للـه ئێسـتا بـزر بووه. زاتاً تا عَقل زیاد كا خَرافات كەمتر ئەبێ. له خوا ئەخوازم أُمَّـتي محمـدي رۆژ به رۆژ عقل و علم و هۆش وإدراكیان زیاد بێ (بِالَمرَّه) لـه قیـودي أوهـام و خَیـالاتي فاسـده دەرچـن ﴿لَهُۥٓ﴾ هەیـه بـۆ ئـەو كەسـه ﴿أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا﴾ ئەوجا زێتر مُتحیر و متردد دەبێ، نازانێ روو له كێندەرێ بكـا. ئێمه خوا بۆ رێی راست بانگمان ئەكا، ﴿قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ﴾ كەوابێ ئێمه دەست لـه هیدایـەتی خـوا هـەڵناگرین و دوای ضَـلالـەتـي ئێـوه ناكـەوین

﴿وَأُمِرۡنَا لِنُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٧١﴾ أمري خوا لەسەر سەر لەسەر چاو بە دڵ و جان قبولي ئەكەین تسلیم ئەبین ﴿وَأَنۡ أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُۚ﴾ أمرمان پێ كراوە بە اقامەتی نوێژ بە زەریفي بە تەمیزی لەگەڵ خشوع تأثیر لە نفسمان بكا، نەك عادةً بڵندبون و نوي بون، وأمرمان كراوەتێ بە خۆ پاراستن لە مُخالفەی فەرمایشي خوا، ئەو وەقتە زەكات و ڕۆژو وحَج واجب نەكرابو، موسڵمانان لە غایەتی فقرو مُضایقە دابون. ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٧٢﴾ بۆلاي كەسی ترنا.

كەوابێ غیري ئەو كێ بپەرستین؟ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ﴾ مبدأي وجود ئەوە، مرجع ئەوە، خلقی أرض و ئاسمان خۆڕاي نیە، دەورو دۆلابي ئاسمان و أرض هەروا بێ و بچێ چێن چێن إنسان ببن و بمرن، إحیا نەبێ، مكافات و مجازات نەبێ، ئەو خَلقە خَلقي باطلە كەمەیە.

﴿وَيَوۡمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُۚ﴾ لەو ڕۆژەي خلق و إیجادی أصول وفروع وبَسائِط مُركَبّات كرد ﴿قَوۡلُهُ ٱلۡحَقُّۚ﴾ كەس قَولي نیە.

كەس ناتوانێ مِكرۆبێ پێشكەێ ایجاد بكا، ئەو قَولە لە هەواو هەوەس نیە، لە عِلم و حِكمەت وتَدبیر وتقدیرە. ﴿وَلَهُ ٱلۡمُلۡكُ﴾ خاصّةً. ﴿يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِۚ﴾ انسان زیندو وائەكرێتەوە، كەس چی بەدەست نیە. زیندو بوونەوەي ئێمە وەك عَسكَرێ مُطیع كە (جَمْ بَدریسي) لێ درا هەموي حاضر ئەبێ گرد ئەبنەوە مُنتظري أمر ئەبن، با هیچ بۆق و كەڕەنا، لە مەیاندا نەبێ.

﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۚ﴾ علمي بەهەمو چشت دا ئەگات، أجزاي بەدەن بەهەر گوێرەێ بێ، ئەیزانێ ﴿وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ٧٣﴾ بە حكمەت و

ئاگاداري خۆي خرپان ئەکاتەوە لە مواقعی خۆیان دادەنێ. خُلاصە اعادە لاي خوا زۆر ئاسانە وەبە نَظَر بعضێ أهلي نَظَر زۆر گران و دوورە بەڵكو مُستَحیل بێ.

﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ﴾ بۆ ئەو قَومە مُعانِدە کە خۆیان بە أولادي إبراهیم حساب ئەکەن ئەڵێن ئێمە لەسەر دیني ئەوین (حَنیفین) ذِکر بکە قِصَّەی إبراهیم لەگەڵ باوکي کە ناوي (آزَر) بووە بەبابی دەگوت ﴿أَتَتَّخِذُ أَصۡنَامًا ءَالِهَةً﴾ بۆ خۆت و قومی خۆت بوتان ئەگرن بەخوا ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوۡمَكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٧٤﴾ دیارە ئێوەش لە عَیني ضَلال دان مناسَبەی دینیتان لەگەڵ إبراهیم نیە. ئێوە دوای هەواي آباي خۆتان ئەکەون، إبراهیم چی بەبابی خۆي ئەگوت؟ إبراهیم بە مَعنی (أبو الجمهور)ە کە خودا موژدەي دایێ بەکثرەتي ذوریەت ناوي بە (إبراهیم) نرا. لە أوَّلەوە (إبرام) ناوي بوو. ئەڵێن (أبو العُلی) لە شاري (آور) کە بَلدەی بو لە بلادي (کلداني) بە وَلَد بوبو، (آور) بە معنا (نور) یا (نار)ە، بعضێ ئەڵێن ئەو شارە (أورفا) بووە.

سَوادي أعظم لایان وایە لە داخلي جزیرەي عِراق (بینَ النهرین) تَوَلُّدي بووە، وَلَوْ اختلافیان هەیە لە موقِعي مُعَیَّن. وە ئەڵێن لە زەمانی (حَمورابي) بووە، عَرَب ئەڵێن ئەویش (عەرەب) بووە. قاعِدەیە کُلّي مِلَّتي لە زەماني إنحطاطي نسبەتي پیاوي گەورەي تأریخی بۆ عنصري خۆي ئەدا، وەك قومي کوردي ئێمە گەلێ إدِعّا ئەکەن (إبراهیم) کورد بووە. آیەتی قران چەند أحادیثي صحیح دلّالەت ئەکەن بە صَراحەت کە (آزَر) بابی حضرەتی إبراهیم بووە لەسەر کُفر مردووە. أما بَعضێ لە صاحِبي میول ئەمەیان لا گرانە بابي إبراهیم یا کەسێ لە عمودي نَسَبي حَبیبي أکرَم بێ کافرو مُخَلّدي في النّار بێ. تأویلي بێ مَعنا بێ معنایان کردوە بۆ ئەو ایەت وأحادیثە، لێرە دەلێن (أبْ) بە مَعنا (عَم)ە یَعني (مام)، وەکَذا لە حَدیثي (انَّ أبي وأباكَ في النار) کە لە جَوابي سائِلیکي فەرمووە کە عَرضي کرد (أینَ أبي؟) ئەڵێن بە معنا مامە مَقصودي

(أبو طالبة). شێخی (سیوطي) لەو مَلَكە حاپولي عَجايبي هەيە. شێخی (إبنُ حَجَرْ) لە كتێبی (فتح المكيه) ئەڵێ: (مقصودي جنابي رسالەت دلّدانەوەی سائِل بووە وە إلاّ باوكي ناجي يە لە ئاگردا نيە). جَدّي أعلام (مەلا عبد الرحمني جەلي) لە حاشيەي (فَتح) رَدّي لێ ئەدا ئەڵێ: (سابقاً مختاري شێخ ئەوەيە كە پێغەمبەر لە گوناهي صغيرە و كبيرە وعَمد وسَهو مَعصومە، كەوابێ بۆ تَطبيب ي خاطر چۆن رَسولي كبرياء ئەو درۆيە ئەكا؟). خُلاصە لەبەر إفراطي مَيل و مَحبَّەت هۆشيان كەم بووە. لە صَريحي ايات وصَحيحي حَديث لايان داوە. جَنَّةُ مَكان (سيّد رشيد) تَفصيلي زۆر باش و فائِدەی هەيە (بابۆ مُحَشّيان بێ...).

باپیر (مەلا عبد الله)شم زۆر مُبالَغەی فەرمووە لە إيماني آباي حضرەتي رسالەت، لكِنْ شئوناتي حەق بە قسەي ئەم و ئەو ناگۆڕێ (يخرج الحي من الميت ويخرج الميت من الحي).

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ لە أجلاي بَديهيّاتە كە ئەو بوت و أصنامانە شاياني عيبادەت نين، پێشكەیێ گێركەیێ ناتەوان لە فَوقي وانە، چ جاي إنسان، أما مەيلی بَشَري زۆر عَجايبە وەعادات و تقاليدی قَوم، زۆر مؤَثِرە. بۆيە جەنابي حەق ئەفەرموێ بەو نَوعە كە ضَلالي قَومماں نيشان إبراهيم دا ايات وعظمتي ئاسمانان عەردی نيشان ئەدەين. لاشَك حضرەتي إبراهيم لە أولي عُمري تا ئەو ڕۆژە كە ئەم گفتوگۆيەی كرد لەگەڵ بابي، گەلي جار ڕۆژو مانگ و ئەستێرەي ديبو، أمّا بەچاوي إعتبار تەماشاي نە فەرمو بوو، زێرا أموري مَألوفە وەقتي نَظَر، دِقَتي نَظَر جَلب ناكەن. وادەرئەكەوێ باوكي لە جَواب وتويەتي ئێمە ئەو أصنامانە ناپەرستين، بەلّكو أجرامي نَيِّرە وعَلوِيّە ئەپەرستين، ئەوانە تمثالن بۆ ئەو أجرامي مُدبِّرە، بۆيە ئەفەرموێ ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗا﴾ كەشەوي بەسەردا هات ئەستێرەيەكی ديت (مُشتري) يا (زُهرة) لەو كواكبانەي صاحبي

هَیْکَل مَعْبَد ﴿قَالَ هَٰذَا رَبِّي﴾ ئەمە خوای منە. لە وەقتی سبرو سلوکی نَظَری إعتراف بەو جۆرە حُکمە هیچ نَقصی تیانیە. دیارە لەو وەقتە إبراهیم بۆ خۆی کە خوای خۆی بە نَظَرو فِکر بدۆزێتەوە تەماشای مَلَکوتی سَمای کردوە تاکو یَقین پەیدا بکا لە شك وتَردید دەرچێ کَأَنَّهُ دەرەجەی جَزمی ثابت وراسخە.

﴿فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ٧٦﴾ کە ئاوا بوو وتی: (ئەوی ئاوابێ خۆشم ناوێ). ئەمە فِطرەتی زۆر پاکە. ئەوانەی بوت پەرست بە أدْنی جلدەی مەیلی شَدیدیان لێ پەیا ئەبێ، خۆناگرن ئەکەونە رکوع و سَجدە. حضرەتی إبراهیم بە أدْنی تَغیرێ دڵی نەچوە سەر، بەڵکو لەو جِهەتە نَفرەتی لێ کرد.

﴿فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا﴾ طلوعی کرد لە أفق بەدەرکەوت تاریکی بەنوری خۆی شەق کرد ﴿قَالَ هَٰذَا رَبِّي﴾ بە (زاغ) چونکە نَوعە ظهورێکی تیایە نەی کرد بە دەلیل، (غروب) گوم بوونە نَقصی زیاترە.

﴿فَلَمَّآ أَفَلَ﴾ حاجەت نیە بڵێ (لا أحب الآفلین) چونکی لە پێشدا بەبەرکەوت، بەڵکو ﴿قَالَ﴾ فەرمووی ﴿لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي﴾ رێم بۆ نەکاتەوە ئەو کەسە کە لە حەقیقەت دا خوای منە ﴿لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ٧٧﴾ هەنگامی حَرَکاتی فِکر وەقتی ناسکە بێ جُبرانە (نَعوذ بالله) ناظِر تەلەزگەی بکا ئەڕوا گوم ئەبێ، یارمەتی لە طَرَف جەنابی حەق پێی ئەوێ کە (جِهَةُ الدلالَة)ی نیشان دا ﴿فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي﴾ إشارە بۆ جَرمی شَمسە. کلمەی شمس لە عبارەتی إبراهیم دا نیە تا بڵێ (هذِه) ﴿هَٰذَآ أَكۡبَرُ﴾ لە هەموان گەورەترە ﴿فَلَمَّآ أَفَلَتۡ﴾ ڕۆژ ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ٧٨﴾ لەو أجرامی نَیِّرە (فَکَیف) بە (جمادات)، یا لە شِرکتان.

(خَیّام) ئەڵێ:

أجرام کي ساکِناني اِنْ أیوانَنْد أسبابي ترددي خِراد مَنْدانَنْد

هاتا سَرْرِشْتَي خِردگم نَكُني كانانكيِ مُدَبِّرِنَد سَرْگَردانَند

﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾﴾ ئـەمن ڕووم كـردە ئـەو كەسـە ئاسمانـان و أرضـي ايجـاد كرديە، مائِلم لە ضَلال خواري وحَوادِث بە غَيري ئەوەى (مِنْ حَيْثُ كَوْنِها آلِهةً) وە مؤمن لە مُشرِكان نيم لە شرك ومـا بِـهِ الشِّـركُ مُشْرِكان، بەريمـە. نَظَـر لـە مَلَكـوتي سمـاوات وأرض زۆر باشــە، مَسْـلكَي ظَريفـە، پێغەمبـەران پێــى دا ڕۆيشتين، خوا پێـى راضيه؟ نـازانم بـۆ چ بَعضـي اِنكـاري نَظَـر ئەكـەن، لاشَـك غَرَضي سۆيان هەيە. ڕەحمەتى خواى لە علماي (طبيعت) و (فَلَك) بێت حَقايقي أكثَـري موجوداتيـان بـۆ ئێمـە دەرخسـتوە، ئـەزانين (زهـره) و (مُشـتري) و (عطارد) و (شمس) و (قَمر) وەك (أرضي) ئێمەن، أرض لـە چ معـادنێ مُرَكَبـە، ئەوانيش وان.

(شَمس) بەو هەموو عَظمە تە لەگەڵێ ئەستێرەى دى گچكەترە، ئـەو شَـوقي هەيەتى لە (اِيدروجين) هەلايسايە، ئەگەر ئەو علومانـە زووتـر لـەناو بَشَـر پـەيا بووبا، گەلێ كەمتر تووشـي شِـرك ئـەبون، هَياكِل و معابِـد بـۆ ئـەو ئەسـتێرانە دروست نەدەكرا.

كەسێ حەز بكا بزانێ لە تَفصيلي أقوامي غـابِره چيان دروسـت كـردوە بـۆ ئەم ئەستێرانە، اعتقاديان لە حەقيان چ بوە چۆنيان پەرسـتينە تەماشـاي ئـەو كتێبانەكا كە لە آثاري كۆنە وەرگيراون. وە (سَيِّد رشيد)ى جَنَّـة مكـان نـەختێ لەو خصوصە دواوە ﴿وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ﴾ لام وايە حضرەتي إبراهيم دواي ئەوەي بۆ خۆي تەماشاي مَلَكوتي سَماوات وأرضي فەرمو، بۆ قَومەكەشـي اِظهـار كـرد وە ارشـادي كـردن، ئـەوانيش لـە بَـدلاً ئـەوە تێـى بگـەن لـەو ڕێگـەوە دواى حضرەتي إبراهيم كەون، مجادڵەيان لەگەڵ دەكرد. ﴿قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ﴾ ئايا وا ئەنوێنن كە بە دەليل لەسەر من غالب ئەبن لە جهەت ايمان بە

وَحدانیەت وتَقَدُّسی کبریائی؟ حالیش وایە ئەو خۆی رێی نیشانی من دایە مُطّلِع بویم لەسەر خَواصی ألوهیەت ﴿وَلَآ أَخَافُ مَا تُشۡرِكُونَ بِهِۦٓ﴾ رێی تَخوین دیارە قَدیمە، وەکی مشایخەکانی ئێمەو پاپا و أتباعیان، بە ترساندن لە غَضَبی خواو سَلبی إیمان خەڵکی ئەکەنە مُطیع و فەرمان بەردار ئەوی مُسلمان بێ، ئەبێ وەك حضرەتی إبراهیم لەلاف و گەزافی ئەوانە نەترسێ. ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيۡـٔٗاۗ﴾ خۆدیارە خوا ئەو مَشیّتە ناکا، یاخود مقصدی بەربەستی قسەیانە، انسان هەرچی بێ مَعرضی بەلایە، ئەگەر شتێکی هاتە سەر نەڵێن ئەوە کاری إلاهی ئێمەیە، هەرچی ببێ لە طَرَف خودایە، جَهَلەکانی ئێمەش وان شتێکت هاتە سەر ئەڵێن ئەوە لە طَرَف شێخە هِمّەتی ئەوگرتی، با وجودی شێخەکانیان گەلی بەربەلا ترن، أما ئەڵێن ئەوە بە هەوەسی خۆیانە. جاهلی هەرزە گۆ هەرچی هاتە سەر زوبانی ئەیڵێ، أما ئێمە لله الحمد تابعی (خلیل الرحمن)ین ئەوەی ببێ لە خوای ئەزانین، ئەوانە جمادن بێ علم وإدراکن چ ئاگایان لە ئێمە نیە، کەوابێ کو لێ یان ئەترسم؟ بە خَیالی خۆتان ئەڵێن ئەمە إلا هی حَرْبە، ئەوە إلاهی شەرە دوشمنان پارچە پارچە ئەکا، ئەویتریان إلاهی (طَرَب)ە وەهکذا... ﴿وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ﴾ ئەوەی فاطری سماوات وأرض بێ، ئەبێ علمی بەهەموو شت دا بکات ﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ۝٨٠﴾ کە ئەوە شَأنی ألوهیّەتە. ئەو أجرامانە دورن لە عِلم مُسَخَّرن مُتَحَیِّرن دێن و دەچن. ﴿وَكَيۡفَ أَخَافُ مَآ أَشۡرَكۡتُمۡ﴾ لە شُرکای ئێوە چۆن ئەترسم؟ ﴿وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمۡ أَشۡرَكۡتُم بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗاۚ﴾ وَالحال ئێوە ناترسێن؟ با وجودی ئەوانەی کە ئێوە ئەیان کەن بە شَریك ی خوا، خوا بە واسِطەی وان نەی نادریتە سەر ئێوە هیچ حُجَّەت وبُرهان نە لەسەر ألوهیەتیان نە لەسەر ربوبیەتیان نەلەسەر وَساطَت وشَفاعەتیان.

جماداتێ بێ عِلم وقوەت وقُدرەت وإرادە، ئێوە لەم خِصوصە، گەلێ لە فَوقي وانن. انسان زۆر سەیرە خۆي و ستارەي خۆي دائماً لە ژێرەوە ئەبینێ، مَعَ أنَّهُ خۆي فوق الكلّە وەستارەشي هەندە (دون) نیە، وەك عرضم كردن عُلماي هَیْأت، خصوصی جَدیدەي، پەردەیان لاداوە. ﴿فَأَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ﴾ لە موَحِّد ومُشرِك. تا ئەو وەقتە، فِرقەي مُوحِّد، زاتي إبراهیم تَمثیلي كردوە.

﴿أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ﴾ من یا ئێوە !، من لە خواي ئێوە، ئێوە لە خواي من. من آمینم إلاهي ئێوە چیان پێ ناكرێ، نەزەرەر نە نفع دان.

أمّا ئێوە حەق نیە لە خوا أمین بن، تجاوزتان لە حەقي إلاهي حَقیقي كردوە. لاشَك ئەوەي مؤمِن بێ ئەزانێ هەندي دەردوبەلا هەیە، كەس لێی نَجاتي نابێ، نە پێغەمبەر بە رسالەت، نەوَلي بە وِیلایەت، نەمەلا بەمەلایەتي، نەپادشا بەحَشْمَت وجاە، نەگەدا بەپەریشان حال وتەباە. وەك (حاجي قادر) ئەڵێ:

أمین مەبە لە سبەیني كە چت بەسەر دێني
حَوادثاتي زەمانەكە نایەتە تَخمیني
ئەم أرضە كۆنە هەوارە خَلایقیش كۆچە
أُمێدي سودي نەبێ كەس لە ژێرچادري شیني

أمّا ئەوەي مؤمِني راستە لە غَضَبي إلاهي أمینە، هەر بەلایەكي بێتە سەري بە لُوطفي ئەزانێ بَصر بەڵكو بە شُكُر تَلَقّي ئەكا ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨١﴾﴾ ئەگەر ئێوە لە أهلي علم وبصیرەت و تێ گەیشتن بێ ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ إیماني دروست بەخوا ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾ بە شِرك وشائبە. نەڵێن ئێمە ایمانمان هەیە، كەوابێ چي بیكەین ئەیكەین، لە أولادي پێغەمبەرانین ناترسین شَفاعَتمان بۆ ئەكەن، خوا أرْحَمُ الراحمینە چی پەكي كەوتوە لەسەر عَذاب داني ئێمە. ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾﴾ لكن مع الأسف شِرك لە ناو

(ملیّون) ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادەیە.

سَوادي أعظَم بوت پەرستن، غایەتي إلاهیان گۆڕاوە. هەنجەت هەر ئەو هەنجەتە، وَساطت وشَفاعَتي مُقَرّبانة. لەهەموو شت عجایب تر ئەمەیە: (بعضێ ئەبنە زاواي شێخی خۆیان کە ئەچنە ماڵەوە خضع الرّقاب، نواکس الأبصار، گەردەن کەچ، چاو لەبەر خۆ، دەست لەسەر دەست بە کَمالي خضوع وخشوع ڕائەوەستێ، بێ أمري خاتون ناتوانێ پێ لەبەر پێ دانێ، توخوا ئەمە زۆر سەیر نیە؟ لەپاش ئەمە اِنسان تەڵەو ڕیویاني لەگەڵ ژني خۆي کرد، ئەو سَطوەت وحَشمەت و جَلال وکبریائیە چۆن لە دڵدا دەمێنێ؟ یاخود لەگەڵ ئەو هەموو إحتشام وهَیْبتە چۆن لەگەڵي دروست ئەبێ ئەو مَیلە ئەکا؟ أما ئەوان ئەڵێن ((إنْ عِلمي حالَت تونَمي داني)).

﴿وَتِلْكَ﴾ ئەوي ذکر کرا خاصَّةً (وَلا أخاف) هەتا آخري. ﴿حُجَّتُنَآ﴾ دەلیل وبرهاني ئێمەیە ﴿ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ﴾ زێدە لە باب وبرا، سائري قَوْمي خۆشي. ﴿نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ﴾ هەر دەرەجەیە خوا ئەزانێ چەند واسعە، ﴿مَّن نَّشَآءُ﴾ دیارە خوا بەحەق ئەزانێ کێ لایەقي ئەو بڵند کردنەیە. کەسێ تەماشاي (سِیَرْ) بکا ئەزانی ئەو سەر ئەندام و ذەواتي عِظام دیني و دونیَوي فِطْرَةَ إمتیازێکیان هەیە، لە أوائلي منداڵیان تا پێ ئەگەن زۆر عجایب نشأو نوما ئەکەن بەگوێرەي مَسلکي خۆیان زۆر بە پاکي وخاوێنی وجِدّي گەورە ئەبن. مُرسِلُ الرُّسُلُ وفاطر یەك زاتە، تَفاوتي مَطلوب لە بیني مَفطوراتي خۆي، هەر ئەو ئەیزانێ.

(نە هَرکي بە قامَتْ مِهْتَرْ بە قیمتْ بِهْتَرْ) وەك لە گوڵستان (سَعدي) حکایەتي پادشاه زادەکان ئەکا:

أسپی لاغِرمَیانْ بَکار آیَدْ ڕۆژی مَیدان نەگا وپرواري

نابینی خودا ئەفەرموێ ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٨٣﴾﴾ ئەوی حَکیم وعلیم بێ بە گوێرەی حِکمت وعلم کاران ئەکا، نەك مَشیئەتێ کَیفی وسەرسەری. لاشك ئەوی خوا إمتیازی فِطری وهبی پێ کَرَم کا،! إمتیازی سَعی وکَسبی پێ اِحسان ئەکا. لەو خصوصە (اِبْنَ الجَوْزي) شەهیر لە (صَیْدُ الخاطر)دا فَصلی جوانی هەیە، ئەمە خۆیەتی. گەرچی أكثر وائەزانی مَشیئەتی إلاهی هەر چۆنێ بێ تَعَلُّق ئەکا، لِکنْ ئەمە خلافِی حەق وحَقیقەتە. ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ اِسحاقی وَلَدی صُلبی، یَعقوبی کورەزای. ﴿كُلًّا﴾ لە اِسحاق، وە لە یَعقوب. ﴿هَدَيْنَا﴾ بە وَحی ونَظَر وفِکر خوارێی نیشان داون، وەکی باوکیانی هدایەت دا. ﴿وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ﴾ پێش إبراهیم ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ﴾ (أي) نوح یان إبراهیم. لام وایە أوّل راحەت ترە، گەرچی أصلی قسە لە حضرەتی إبراهیم هەلّ ئەستێ. ﴿دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ﴾ دوو مَلِك ورسولی بَنی اِسرائیل. ﴿وَأَيُّوبَ﴾ دەولّەمەندێ مُبْتلاو نجات دراو ﴿وَيُوسُفَ﴾ مُفَصَّلاً لە سورەتی خۆی باسی لێ دەکرێ ﴿وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ جوتە برای ساعی بۆ نجاتی قَوم، نارەحەت لە دەستی بنی اِسرائیلی.

﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾﴾ ئەوانە هەمویان لە طرف خوا هِدایەت درابون، لەگەلّێ فِتنەو مصائب قورتار کرابون.

﴿وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾﴾ ئەمە بۆ خاطری حضرەتی عیسی... ئەوانە لە زومرەی پیاوچاکان بوین. ﴿وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا﴾ أولیان کوری إبراهیم آخریان برازای. لە حەق ئەوانە ئەفەرموێ: ﴿وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾﴾ جو (إسماعیلیان) لا مُحَقَّرە چونکی لە جاریەیە، قسەیَ زۆر خراپیش نسبەت بە (لوط) ئەدەن، (یونسیش)

ئەگەر چی بێ صَبري کرد أما تَوبەي کرد وە خوا لێی قبول کرد بلند بوە، (أليسع)یش زۆر زۆر بەناو نیە. جەنابي حەق لەو سێ آیەتە چواردە پێغەمبەري عظامي ذکر فەرموە بێ تَرتیبي تَأریخي وگەورەي وەهەم إختلافي فَواصلي آیات بەوجۆرە وَجهي چیە؟ گەورە گەورەکاني وەك (بَیضاوي) گوێ نادەنە ئەو وردە وردەلانە، (سَیِّدي آلوسي) خوا خێري بنوسی ئەفەرموێ: (سِرّم بۆ معلوم نەبوە)، (سَیِّد رشَید) ئەفەرموێ: (قرآن ناردراوە بۆ وَعظ وهدایەت، کتێبێ تأریخي نیە وەهەم کتێبی مناقِب و مَدایح نیە، تارعایەتی ترتیبي أفضل وفاضل بکا). أما ئەو قسە لاي من هیچ نیە، ئەگەر ئەوانە بە تَرتیبي زەمان وفضل ذِکر بکرێن چ زەرەر بە هِدایەت ووَعظ وتذکار وإعتباري قُرآن ناگەیەنێ. قُرآن وەك (شاهنامە) بۆ مَدح دانەنراوە ، أما سەراپا مَدحە، فَقط بۆ هِدایەت بۆ إعتبار وتَذکرە.

دوایێ (سیِّد رشید) ئەفەرموێ: ئەوانەي گێڕاوە بە سێ قِسم لە آیەتی أوَّل (داود، سلیمان، أیوب، یوسف، موسی، هارون)ي ذِکر فەرموە لەبەر معنایەکي جامِع لە بەیني ئەو شەش زاتە، ئەوانە جەنابي حەق مُلك و أمارە وحکم وسیادەتي داونێ لەگەڵ نبوەت ورسالەت، داود وسلیماني لە پێشەوە ذکر کردیە چونکي مَلك بوین و صاحبي دەوڵەت و تَنَعُّم. دواي وان أیوب ویوسف، أیوب أمیرێکی دەوڵەمەند و گەورە ومُحْسِن بوە، یوسف وەزیرێ گەورەو حاکمێ صاحِب تَصَرُّف بوە، وە هەردووکیان مُبْتَلا بون بە بەلا صَبریان گرت وەلەسەر نِعمەت شکریان کرد نظر بە نِعَمي دونیا تەرقیە لە أعْلی نَظَر بە مقامي رسالەت تەرەقی بۆ أعْلی، بۆ ئەوانە ئەفەرموێ (کذلك نجري المحسنین) یعني بە جَمع لە بەیني دونیاو رآسەتي بِالحق وەهیدایەتي دین و إرشادي خَلق، ئەوە جزاێ خاصّە بە مُقابلي إحسانێ خاص. قسمي ثاني: (زکریا، یحیی عیسی، الیاس) ئەوانەش ممتازن بە زهد، بۆیە وەصفی کردین بە صالح. قسمي ثالث (اسماعیل، ألیسع، یونس، لوط) ئەوانەش وَسَطن، نەوەك ئەوانەي پێشی بە ملك وحکم بوین، نەوەك ئەواني ثاني بە شِدّتي زُهْدْ بوین، وەئەوانەش وەکي سائري رُسُل وأنبیاء لەسەر

قَومي خۆيان مُفضَّلن).

ئيتر تەماشای کە لام وایە بە قەدەر حال شتێکی لێ هەڵکراندوە، أمّا بە تەواوي نا. ئێمە عن قريب قسەي لێ ئەکەین ﴿وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ﴾ إي ئەو رِجالە عُظمايانە ﴿وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ﴾ لازم نيە بۆ كُلّ واحِد واحِد لەمانە، ئەوانەیان هەبێ. ئەوانەشمان تفضيل داوە ﴿وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ﴾ هەڵمان بژاردینە ﴿وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾﴾ بێ خوارەکەو پێچەکە ﴿ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ﴾ ئيتر، هيچە. ﴿يَهْدِي بِهِۦ﴾ بۆ کەسبیان دەخلێ هەیە ﴿مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ کە خۆی ئەزانێ، لایەقي ئەو هیدایەتە بن. ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا۟﴾ بالفرض والتقدير ﴿لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾﴾ مایە پوچ دێنە دەر، کردەوەیان بەرئەبێتەوە قیمەتی نامێنێ ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانەي ذکر کران مُعَيَّنُ وغيرە مُعَيَّن ﴿ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ﴾ حکمي تشريعي یاقضاءي. وَمِنَ العَجايب بَعضي مجهول ئەڵێن: (يوسفي بني يعقوب رسول نەبوە، ئەو یوسفي پێشدان ذِکر کراوە، يوسفي بن إبراهيم بن يوسف بن يعقوب بووە). (سَيِّد آلوسي) ئەفەرموێ: (ئەوە قسەي غَريبە) وە أغرب تر ئەمەیە ئەڵێن: (يوسف لە جنۆکان بووە بۆ مِصر ناردراوە) رەنگە قائلي ئەو قَولە جنۆکەي لەسەر بووبێ. لە (أحمد بنِ حَيدري صَفوي) نَقل ئەکەن (داود) رسَول نەبوە، گەرچی کتابیشی هەبوە، ئەفەرموێ: (چ نَصّم لەوە نەدیوە).

بەڵێ ئەو زاتە (صَفوي) بوە، ئەتوانێ حکم بکا حَتّا لەسەر زاتێ وەکي (داود). ئەگەر انسان تەماشای قيلَ قيلي مەلایان بکا پێغەمبەرەکانیشي لێ تێك ئەچێ. ﴿فَإِن يَكْفُرْ بِهَا﴾ بە نُبوەتی مُطلَق ﴿هَٰٓؤُلَآءِ﴾ أهلي حاضِري (مكه) ﴿فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا﴾ أمرمان کردوە بە رعایەت وإیمان وقیام بە حقوقي نبوەت

﴿قَوۡمٗا﴾ أمّا چ قەوم؟ ﴿لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ٨٩﴾ دائم الإیمانن، ئەو قەومە أصحابي گورزنێ نَبوین، گەرچی ئەمڕۆ ضَعیفن، أما قُدرەت مکنەتیان بۆ حفظي شأن وشَرَفي نبوەت بەدەرئەکەوێ ئەمڕۆنا سبەي. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ﴾ ئەو (أولئك)ی رابردو ئەو کەسانەن کە ﴿هَدَى ٱللَّهُۖ﴾ خودا رێیی نیشان داون، مَلَکوتي سماوات وأرضي بۆ دەرخستون بە فکري صائب و نَظَري ثاقبْ فاطِری سَماوات وأرض وعُلويات وسُفلياتيان دۆزیوەتەوە، دوایێ خوا إختیاری کردینە بۆ رِسالەت، ئەوانیش بەحەق إدارەي وَظیفەیان کردیه. ﴿فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ﴾ تۆش بە هِدايەتي وان اقتدا بکە، لەو مسلکە پێ رەوي وان بکە. ئەو آیەتە گۆیا لەسەر شاني مەلایان تَفسیري گران هاتیه، خاتم الرسل سَیّدُ الکُلْ چۆن ئەو أمرەي پێ ئەکرێ؟ لکن ئەمە سهله، ئەگەر لە أوائلي رسالەت بێ قسەي تیانیه لاشَك خاتم الرسل لە أوَّلي رسالەتي تا آخري هەزار دەرەجە من کُلِّ الوجوه تَرَقّي کردیه. جەنابي حەق (جَلَّ وَعَلی) بە مناسبەي مَقام اِفتتاحي بەناوي حضرتي إبراهیم فەرمو، دوايَ اتماماً لِلنِعمَةِ اِسحاق ويَعقوبي ناوبرد، دەربارەي ئەو دوو زاتي محترم اِکتفاي کرد بە هدايەت دان، زاتاً مقصد لێرە ئەوەیە، واِطراو مبالغەي يَهود لە حەق ئەو دووانە مَعلومە.

دوایێ بە يَميني فعِل ناوي أبو البَشَري ثاني حضرەتي (نوح)ي هێنا جُهد وسَعي وي لەگەلێ بوت پەرستان معلومە. ثُمَّ شەش زاتي مُحتَرَمي لە ایەتێ ذِکر فەرمو، لە مُقَدِّمە داود وسلیماني ذکر کرد. تَفَأُلاً بالخیر، کە حضرەتي خاتَم بەو حالەي کەتیایەتي مَأیوس نەبێ عن قَریب نَجاتي ئەبێ تشکیلي ملك وسلطنتي إلاهي ئەکا، وەکو أیوب ويوسف پاش ئەو هەموو دەردو بەلایەو ذِلت وأسارەتە لەو آیامی نحوسەت و خواري گەیشتن بە أیامي سروري و سەرداري، وکَذا کَلیمُ الله وبراي چ دەردوبەلایان دیت لە دەست فِرعَون! بە چ آلَم و آزاري قَومي خۆیان لە چەنگ ئەو ظالمە قورتار کرد، تۆش قَومي عەرەب وغَیرە عەرەب لە دەیت فراعنەی عَصر نجات ئەدەي. بۆ ئەوانە اِشارەي فەرمو کە (مُحسِن)ن،

يعني لەهەموو أطواري مُتخالفەي سَرّاء ضَرّا عِزّت وذِلّەت، نەگۆڕاون، ئەوي چاك و موافقي حَقيقەت بو وايان كردوە، وكَذا (زكَريّا) (يَحيى)ي جگەر گۆشي (عيسى)ي روحُ الله (إلياس)يش بەو حالەي كە تياي بون كوژران ودەربەدەر بون باز لە مَسْلَكي خۆيان لە صَلاح وتَقوا دەستيان هەڵنەگرت، عَذابي ئەوانە لە دەست أمة وقَومي خۆيان بوو صَبريان گرت بە مشار شەق كران سەريان بڕا قَصدي اِعدام وصَلبيان كرا، ذەررەيەك مُخالَفەی أمري اِلاهيان نەكرد لە صَلاح لايان نەدا، وەإفراطي جووديانان لەحەق ئەوانە معلومە.

وە إسماعيل كە جگەرگۆشی إبراهيمە لەگەڵ ياراني كە لە ايەتي سێيەمين ذِكر كران، لاي بَني اِسرائيلي بە خراپە ناو ئەبردران، جەنابي حەق بۆ ئەوانە مَنقَبە ی زۆر عالي ذِكر كرد.

كەوابێ تۆش ئەي خاتم الرسل! بەو نَوعە صَبرو ثباتَ، كە ئەگەر بوي بە مَليكێ وەك داود و سليمان يا بەبێ دەسەلاتی وەك زكريا واِخواني با هەزار جار ناوت بە بەدي بێنن قسەي سوكت لە حەق بكەن، اِنحراف لە مَسْلَك مەكە دەعوەتي قَوم بكە ئەو وَظيفَەی خۆت بەحەق بەجێ بێنە.

وەممكنيشە بلێين ئەو أمرە جِهەتێ قاطعە لەسەر بَراءَتي ئەو ذەواتي كِرامە لەهەر هَذەياناتێ كەجو دەرحەقيان ئەڵێن، زێرا ئەوانە ذواتێ ئەوتۆن كە خاتم الرسل سەروەري عالەم أمري پێ كراوە پەيڕەويان بكا، كەوابێ چۆن تَصَوَر ئەكرێ مَنْقَصەێ غَيرە مُناسبێ لەگەڵ ئەو مَقامە ساميە لەوانە صدوري كردبێ؟

وەممكنە بلێين مَقصَد لەو أمرە تَعريضە بۆ ئەو قَومە كە بە پێڕەوي أباي خۆيان گومڕاە بوين، بە بوت پەرستن، وە ئەشلێن ئێمە لە زوريەتی پێغەمبەرانين، بۆچی اِقتِدا بە گومڕاهان ئەكەن؟ بۆ اِقتِدا بە زەواتي عِظامي أعلام ناكەن؟ ئەگەر بەبراهين بێ ئەوە براهين!!! ئەگەر بە پەيڕەوی بێ، ئەو زەواتانە أحقّن بە پەيڕەوي، لام وايە ئەو قسە لەگەڵ ﴿قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ

﴿أَجۡرًاۖ﴾ زۆر مُناسبه.

بۆچی بەقسەم ناکەن؟ به چم اِتهام ئەکەن؟ به دَعوای ملك وسَلْطَنت وتَرأُس و طلبي ثَروت و سامان؟ وەهەم مُقابلی ئەو أرشادە هیچتان لیّ ناخوازم! ! !

﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ٩٠﴾ قُرآن یا ئەوي ذکر کرا، إرشاد ومَوعظەیه بۆ هەموو عالەم، نەتەنها بۆ ئێوه. باجوودیان نەڵێن ئێمه اِحتیاجیمان نیه به اِرشادي رسَولي عەرەب. ئەگەر کەسیّ بلّیّ ئەوانه اِنکاري أصلي نُبوّەت ئەکەن، ئەڵێن خوا لەوە گەورەترە بَشَر بکا به پێغەمبەرو وەحی و کتابی بۆ بنێریّ، له جَوابا ئەفەرمویّ ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ﴾ ئەوانه قەدري خوایان بەحەق نەگرتوه. حَقیقَةً نَظَر به غِناي زاتي مُستَغْنیة له عالەم فَضل له بَعْثي رُسُلْ، أما له رووي لُطف وکَرَم ایجاب ئەکا بۆ هیدایەتی بَشَر، رُسُلْ بنێریّ، أمّا ئەوانه ئەگەر به تەواوي حورمەتي خوایان گرتبا، بەس تەماشاي یەك جهەت له صِفاتي ویان نەدەکرد. دیاره ئەوانه کەم مَعرِفەتن حەقي ألوهیەت وربوبیەت نازانن ﴿إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ قطعاً ﴿عَلَىٰ بَشَرٖ﴾ فەردێك لەوان ﴿مِّن شَيۡءٖۗ﴾ له هیچ دائر نه هیچ له اِعتقادیات نه أحکام نه اِجتماعیات، ئەو گروهه خاص نیه به عەرەب واِسرائیلي، له هەمو فِرقەیّ هەن.

جمعیّ تریش ئەڵێن عَقل کافیه بۆ هِدایەت، مُغنیه له رِسالەت، حَتّا ئەڵێن خوا غَني یه له عبادەتي ئێمه هەردوو طائفه له زیفەوه ئەو قسه ئەکەن مقصودیان حەق نیه، دەرچوونه له اداب ومَحاسِني شرائِع، اِتّباعي هەواو گوناه کردنه، بیّ عَذابي وِجداني. ﴿قُلۡ﴾ لەروویان مُشافَهَةً یا غیابًا. ﴿مَنۡ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورٗا وَهُدٗى لِّلنَّاسِۖ﴾ لەبەر ئەو جَوابه مُفَسِّرین مُضطَرین ئەگەر سؤال و جواب لەگەڵ مُشْرِکي عەرەبه، ئەمه نابێته جواب، ئەگەر لەگەڵ یَهودە باسي یهودان لێره نیه، أوّل وآخر گفتوگۆ لەو سورەته لەگەڵ مُشرکیني عەرەبه وه اِسرائیلي اِنکاري أصلي نبوّەت ناکەن.

بَعضیٚ ئەفەرمون ئەو ایەتە مُستثنی یە لە (مَدینە) نازل بووە، بۆیە ئەفەرمویٚ ﴿تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا﴾ بە (تا)ی خِطاب. لە قرائەتی تریش هەیە بە (یا)ي غائب، ئەوەش مُشَوَّشي کردینە. (سَیِّد رشَید) احتمالي زۆر عجایب إظهار ئەفەرمویٚ ئەڵیٚ: (قابِلە لە مَکە (یُخْفون)ە بیٚ بە ضَمیری غائِب راجِعي جولەکەکان بیٚ، کە حضرەت هجرەتي کرد لەگەڵ جوان گفتوگۆی فەرموو وەبەدەرکەوت کە زۆر شت لە أحکامي تَوْراتْ بزر ئەکەن وەك ایەتی رَجم بەشارەت بە ظهوري خاتَمُ الرّسل، ئەو وەقتە بە خِطاب فەرمویەتي ئێوە تَوْراتي ئەگێڕن بە کتێب لە کاغەز ئەینوسنەوە ئاشکراي ئەکەن وەگەلێکیشی بزر ئەکەن).

أمَّا لە حقیقەت دا إحتمالی دوورە، مەگەر إثبات بکا لە مَکەً بە خِطاب نەخوێندرابێتەوە، (وأنّی بِه) ئێمەش ئەڵێین قسە لەگەڵ مشرکیني عەرەبە. قسمیٚ لەوان تَنَصُّریان کردبو وەك (وَرقە بنِ نَوفَل) (أُبَیَّە بن أبي الصَّلت) وە أمثالیان، ئەو گروهە لەوانیان ئەبیست ئەیان زانی (تَورات) کِتابیٚ منزَّلە لە طَرَف خوا، أمَّا بۆ بَني اِسرائیلیە بۆ بَني اِسماعیلي نیە، بۆیە اِتِّباعیان نەدەکرد، وە ئەو مُشرِکانە پاش (بَعث)ي رسولي أکرَم أو أوصالِ وي کە بیستبویان لە بَني اخواني خۆیان گومیان ئەکرد. حال وحِکایەتی (إبنُ أبي الصَّلت) مَشهورە، لەبەر ئەو وَجْهَ (یُخْفونَ) بیٚ چ (تُخْفونَ) بیٚ حساب یەکە، قسە لەگەڵ عەرەبانە، وە مُلزَم ئەبن بەو جَوابەي ئەگەر بە قسەي ئێمە راضي ني، مُراجعەی تفسیري (سَیِّد آلوسي) و (سَیِّد رشید)ي بکە بزانە چت بە چەنك ئەکەوی؟ ﴿وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ﴾ لە طَرَف رُسُلانەوە وەك اِسماعیل وإبراهیم ئەو تۆزە زانیني هەتانە لەمەڕ وانە، وە لە تَوراتیش استفادەتان کردیە (سبحان الله) بشر وائەزانیٚ خۆی لە خۆڕا فێربووە نازانیٚ أَصلی تَعلیم وتَربیە لە رُسُل وەگیراوە، ئەگەر ئەوان نەبان ئەو بَشَرە وەکي گاوسەگ پەرستان ئەمرۆ بیٚ هۆش و گۆش وادراك ئەبوو، أما انسان بیٚ نمەکە.

ئەمڕۆش تا لە نبوّەت نێزیکن چاکن، تادوور ئەکەونەوە، بەد تر ئەبن، چی وانازانن کەبۆ بَشَرّیەت کەڵك بگریّ، لەبەر بێ تربیەي وبێ أخلاقی علمەکەیان ئەبێ بەمایەي شەرر وفَساد.

بۆ انسان عَقل زۆر عجايبە زوو هەڵناخەڵەتێ وەك ئەو شێتەي ئەڵێن مندالآن دواي کەوتبون بەردەبارانیان ئەکرد ووتي منداڵینە لەماڵی فلانی مولودە أنواعي أطعمە وشَکَریات ئەبەشنەوە منداڵەکان بۆ ئەو ماڵە غاریان دا ئەویش بەغار بەدویان کەوت ووتیان ماڵ خراپ ئەتو بۆ؟ ووتي بەڵکو راست بێ. وەك (روجتاف لوبون) ئەڵێ عَقل لەبەر لافاوي مَیل خۆي ناگرێ. (مُعتَزِل)یش هەرچەند ئەڵێن (عَقل لە رِسالەت مُغنی نیە بەڵکو عقل اِرسالي رُسُل واجب ئەکا لەسەر خوا)، أما لە إعتماد دان بەسەر عَقل زۆر بە غَلَط چوین، بەڵێ پاش تَربیەي رِسالەت تربیەی پاك عَقل مُحکَم ئەبێ بەسەر قُرَناي خۆي غَلَبە ئەکا. ﴿قُلِ﴾ یامحمد (ﷺ) لە جوابي (مَنْ أَنزَلَ) ﴿اللَّهُ﴾ خواي تعالان تَوراتي نازل کردیە چونکی ئەم جوابە ناتوانن أنکاری بکەن، لەگەڵێ جێ اِعتمادیان دەدا سەر قسەي (أحبار). یَهود ئەیان زانی کِتابي إلاهیان لایە. مِن العجایبي بَعضێ لەوانەي کە ئەڵێن تەنیا کَلمەی (حَلالة) ذکرە اِستدلال بە (قل الله) ئەکەن.

(إبن تَیمیّە) تغلیطیان ئەکا ئەڵێ: (ئاگایان لە ما قَبل ي نیە، ئاگادارنین کە جوابە بۆ سؤالي پێشی). ﴿ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ۝٩١﴾ لێ یان گەڕێ لەناو باطِلي خۆیان گەمە بکەن. ئەو قسەي مُشرِکان وانیە لە نَظَرو تَدقیقاتي علمیەبێ، وە اِلاّ چۆن خوا تَقْدیس ئەکەن لە إنزالي کُتُب وإرسالي بَشَرْ وە شَریکي بۆ پەیا ئەکەن؟ چۆن شَریکي؟ جمادات و حَیوانات! ! !

ئایا ئەمە تَنقیص نیە ئەو نَوعە أجسامە لاي خوا تکا کاربێ؟ بعضێ ئەفەرمون ئەو ایەتە مَنسوخە بە ایەتي (سَیف).

للهِ الحَمد لە زەماني وان طوپ وطَیارە نەبوو وە إلاّ بەجارێ بۆمباردوماني

قُرآنیان ئەکرد ئاداریان لەسەر پاداری نەدەهێشت.

(اِمامي رازي) خوالێی راضي بیّ ئەڵێ: (مَنسوخ نیە چونکی مَقصود لەم ایەتە تَهدیدە بە سَیف تَقویە ئەکریّ). ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ﴾ ئەو قُرانە کتێبێکە أمّا چ عظیم القدر چ عالي ئێمە ناردومانەتە خوار بەسەر خاتم الرسل ﴿مُبَارَكٌ﴾ بەرەکەتدارە واسِعُ الخَیرە بەزێدە نِمایە ﴿مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ لە کُتُبي مُنَزَّلە، خواي وغَیرە خواي، لێك ئەکاتەوە خێرو بەرەکەت لەمە زیاتر نابیّ، وە إلاّ کەس لە أهلي عَقل نەیدەتوانی بڵێ ئەو کُتُبانە سَماوینە. ئەوەندە خَرافات و مزخرفاتیان تێکەڵاو کردینە، بە وَحي نەبیّ، خاوێن ناکرێتەوە، ئەگەرچی بَعضەکی زۆر دیارە کە إلاهي نیە، مُلحقاتە. ئەوي تەماشاي قانونی (بَرحْ)ي بکا لە تَوْرات مُحقق ئەزانیّ ئەو قانونە لە (کولێنانیان) وەرگیرایە. ﴿وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ﴾ (مکّە) یعني أهلي خاص وعام دوورو نێزیك ﴿وَمَنْ حَوْلَهَا﴾ لە أهلي شَرْق وغَرب وشِمال وجنوبي (إلى أقصی الغرب والشرق والشمال والجنوب)ی. ئەوسیّ فائدە گەورەیە بۆ قرانە مُبارەکە ئەوی ایماني پیّ بێنیّ إقتداي پیّ بکا لە سعادەتی دونیاو قیامەتی زیاد ئەکا، کُتُبی سماوی خاوێن ئەکا، إنذاري عالەمي بَشَریەتی پیّ ئەکریّ ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ بە نَوعیّ کە خوا ئەفەرمویّ لە قُران دا.

﴿يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ لەگەڵ عَمَل پیّ کردن. ئەوي ایماني بە قیامەت نەبیّ یا ایماني مُزَخْرَف بیّ بە قیامەت اعتماد بداتە سەر نَسَب وفِدیە وتکا، ایمان بە قران ناهێنیّ وەهەم ئەوەي ایماني بە قُران نەبیّ وەیا بڵێ ایمانم پیّ هەیە أما بەکیفي خۆشی هەرچی سَیِّئاتە بیکات، ایماني بە قیامەت نیە، إیمان دار بە قیامەت فَضل لە ایمان بە قُران ئەبیّ بِلا قید وشرط مُداوِم بیّ لەسەر أعمالي چاکە. ﴿وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ۝٩٢﴾ نالێن خوا اِحتیاجي بە عبادەتي ئێمە

نيه، ئێمه چين عبادەتي خوا بكەين؟ ئەوانەش بەس بۆ خاطري اِتِّباعي شَهَواتي دونيّه وا ئەڵێن.

ئەوي ايماني هەبێ پشتي خۆي بۆ خوا دووتا ئەكا سەرفرود ئەبێ. ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ ئەوانەي ئەڵێن خوا هيچي بۆ كەس نەناردوە، وەك (سَيِّدي آلوسي) ئەفەرموێ.

﴿أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ﴾ له طَرَف خوا وحي م بۆ هاتيه. ﴿وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ﴾ بەدرۆ بلّێ ئەمن پێغەمبەرم. ئەو نَوعه كەسانه زۆر بون. عەرەب پێش (بَعث)ي حضرەتي خاتَم غافلّ بوون له نبُّوەت، كه ئەو (بَعْثە تي) بۆبوو دەركەيان كردەوه حَتّا به پياوان إكتفايان نەكرد ژنيش ئەو دەعوايەيان كرد وەگەلێ كەس ايمانيان پێ هێنا. ئەوانە بەر طَرَف كران تا چەند عَصْرێ. باش له هەراهەراي درۆزنان ئاسودە بوبوين، أمّا (غُلام أحمدي قادياني) دەركەي كردەوه، ئەمجا واي بۆ حالي أمّەت. وەپێش (قاديالي) (باب) و (بَهائى) ايراني دەعواي رسالەتيان كرد ئەيان گوت: (ديني اسلام ناقِصه بعضي أحكامي وەحشيانه، له اِسلاميەت كەسێ نەبو ئەمانه به آيەتي سَيف نَسخ بكا).

مەلا برسيەكاني دووپوو گەلێ كەوتنه دووي تَرويجيان دا ناوو نانێكيان پەيا كرد. بەخۆڕاي نيه حضرەتي رسَولي أكرم ئەفەرموێ: (اللهم اِني أعوذُ بِك مِن الكُفرِ والفَقْر) ياربيّ يا رَبيّ له كُفر و فَقرمان بپارێزى ﴿وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ ئەتوانين مُعارَضەى بكەين، ئەوە قەولي بَشَره أساطيري أوّلينه، زوو ئەتوانين مثلي وي دانێين. كەوابێ تَعبير به (ما أنْزَلَ الله) له طَرَف وان بۆ تَهَكُمه. وەپاش زەماني رسالەت بعضي له أُدَبا وبُلَغا تَصَدّي ومُعارَضەى قُرآنيان كرد، أمّا نەيان تواني، زوباني خۆيان بەست، قەڵەمي خۆيان شكاند، (جواب دياره بۆ (لَوْ)، بۆيه نەگوتراوه بەم قَوْله ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ فَكَيْفَ بالأظلم؟

﴿فِي غَمَرَٰتِ ٱلۡمَوۡتِ﴾ لە گێژاوی مردن دا. لای حَقیر ئەمە لە ڕۆژی (حَشْرە) ئەوانە لە حالّی دان وەك حالي سەرە مەرگ، أمّا نامرن ﴿وَٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ﴾ دەستیان بۆ لایان درێژ ئەکەن بەلێدان و کوتان وتَعذیب وە پێ یان ئەلێن ﴿أَخۡرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُۖ﴾ روحي خۆتان دەرکەن تا لە عَذاب دەرچن راحەت بن، أما دیارە پێ یان ناکرێ.

چۆن لە دونیا روحي ایمانتان لە خۆتان وە لە خەلّكي ئەكێشا، ئەمڕۆش روحي خۆتان بكێشن ﴿ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ﴾ ئەوانەی أهلي كِبر وتَعَظُّم بن لایەقي وان عَذابي تَحقیر امێزو زەلیل ورەزیل کردنە. ﴿بِمَا كُنتُمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ﴾ ئەو قسانەي کە سابِقاً ذِکر کران ﴿وَكُنتُمۡ عَنۡ ءَايَـٰتِهِۦ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٩٣﴾﴾ دەعیەتان نەدێنا تەماشاي اياتي إلاهي کەن چ مُنَزَّلْ و مُكَوَّنْ، ئەگەر ئەمە ببیني، شتێ زۆر گەورەو هائِل دەبیني. ﴿وَلَقَدۡ جِئۡتُمُونَا فُرَٰدَىٰ﴾ بێ مُعین وخَدَم وحَشَم رووت و قووت. ﴿كَمَا خَلَقۡنَـٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾ سورە سەقطەیێ بێ دەسەلات، ئەوجا چی ئەکەن؟ ﴿وَتَرَكۡتُم مَّا خَوَّلۡنَـٰكُمۡ﴾ ئەوەي بە ئەوانمان عَطا کردبوو لە مالّ و لە وَلَد و ئەوشتانەي پێی باغر بوبون ﴿وَرَآءَ ظُهُورِكُمۡۖ﴾ لە پاشتان بەجێ ما، لە پێشی خۆتان چتان نە هەنارد بۆ ئەوڕۆ، وەئەوڕۆ مالّ ومنالّ کەلّكتان ناگرێ، فِدیەیە ﴿وَمَا نَرَىٰ﴾ دیارە شتێ خوا نەیبینێ، نیە. ﴿مَعَكُمۡ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ أَنَّهُمۡ فِيكُمۡ شُرَكَـٰٓؤُاْۚ﴾ شَفیع وشَریك ئەبێ نوعە خێرێکیان هەبێ، یَعني شُفَعاي ئەوتۆ کە خوا لە قسەیان نەچێتە دەر ﴿لَقَد تَّقَطَّعَ بَيۡنَكُمۡ﴾ بەینتان برا، یا ئەوەي لە بەینتان دابوو پسا. زاتاً غَیري أوهام وخَیالاتي فاسِدە چیتر نەبوو. هیچی أوهام وخَیالاّتیان ئەو ڕۆژە لێ

معلـوم نـەبێ ﴿وَضَلَّ عَنكُم﴾ لێتـان گـوم بـوو ﴿مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾﴾ گومانتان يا ئەوەي گومانتان ئەبردێ، نەمان. هەرچي اعتمادي بدەيە سەرێ ئەو رۆژە، لەگەڵ (بوت) فەرقي نيە. في الحقيقة ئەوەی ئێمە ئەمرۆ لەگەڵێ كەس ئەبينيني، عَيني بوت پەرستيە، وەزَعم ئەو زَەعمە غايەتي بعضێ (بوت) حَياتەكيان هەيە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ﴾ لە اياتی بَيِّناتي مَلَكوتي سَماوات وأرضە مُنْفَرِداً ومُجْتَمِعاً، شين بووني دەنگ و ناوكي دانەوێرەو ميوەجات. اياتي ئەوتۆيە صاحِيي هۆش و گۆش نابێ اِستكبار لە زانانـدني بكا، حضرەتي إبراهيم هەرچەند مَلَكوتي سَماوات وأرضي بۆ نواندرا، لِكنْ بَيانا إقتصار كرا لەسەر آياتي سَماوات لێرە بەو نَوعە كە اِشارەتمان كرد چەند آياتي سَماويّ وأرضيّ تَفصيل ئەفەرموێ.

لێك بوونەوەي دانەو ناوك زۆر عَجايبە، حَيات لەناو ئەو قەپێلكە حِفظ ئەكرێ، كە معادي شين بوني هات ئەو چەقەلە نەرمە چۆن ئەو پێستە رەقە (خاصَّةً ناوكي خۆخ و قەيسی و باوي) شەق ئەكا؟ لە أرضيش ناوەستێ دێتە دەرێ، ديارە شەختەو بەستەرەكی پێ ناوێ وە إلاّ لە دياري گەرميان ئەبا خۆخ و هەڵوچكەو قەيسی شين نەبان، ديارە هەر خودايە بەو وَضع ونِظامە كە خۆي داينايە، دانەو دەنگ لێك ئەكاتەوە ئەيان روێنێ ﴿يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ﴾ نباتات وأشجار مُركَّبن، لە مَوادي حَيّ وغَيره حَيّ تێكەڵاون. جەنابي حەق بە حِكمەت و قدرەتي خۆي، مَوادي حَيٌّ لە ميانی مَوادي جامِدە دەهێنێتەدەر، مَوادي جامِدە لە ميانی مَوادي حَيَّە دەرئەخا، هەريەكێ بۆ عضو موقِعي لايەقي خۆي ئەنێري نماي پێ ئەدا، تَكرار دانەو ميوەو ناوك ئەداتەوە وە هكَذا إلى ما شآالله تعالى. ئەو دەمارە باريكەلانە كلۆرن بە آثاري شَعريَّە مَوادي غذائيە وەرئەگرن بە نَوعي مُحَيِّر العقول ئەچێ بۆ أصلي گياو دارو بەرگ وباري. في الحقيقة ئێمە قوەي غازِيَّە ناميە جاذِبە ماسِكە

هاضِمه دافعه مُمَثِّله مُصَوِّره، انکار ناکەین، لەگەڵ عُلماي طبیعَت موافقین، لکِن حَقُّ الأنصاف بنۆڕنێ تەرتیبي ئەو قواي عاملە دامەزراندنیان لەناو هەیکەلی نَبات وشَجَر بە نَظم وإنسجامي عَجیب وغَریب لە طَبیعەتێ بێ شعور صادِر ئەبێ؟ کەسێ ئەمە تجویز بکا، حَقّاً اِنکاري عَقل ئەکا. عقل بالبَداهَه أثري علم و بێ علمي فَرق ئەکا أمَّا طَبیعیوّن تەنیا تەماشاي مِعْمَل وعَمَلە ئەکەن ناتۆڕنە صانِع ومُدَبِّر ومُدیري مِعْمَل وعَمَلە، ئەمەش کارە لە إنصاف؟ ئەواني ئێمەش کە بِالكُلّي اِنکاري عَمَلي طبیعت ئەکەن، غَدر ئەکەن، تەنیا تەماشای مُرَتِّب ئەکەن، ناتۆڕنە مِعْمَل وعَمَلە. مَوادي (حیَّە) لە هەیکەلی أحیاء دائِماً صَرف ئەبێ، احتیاجي بە تجدید هەیە، بۆیە لە هي أوَّل (یُخْرِجُ) بە فِعلي مُضارع ئەفەرموێ، أمَّا موادي (غیر حَیَّه) دەمێنێ صرف ناکرێ بەڵکو حِفظي مَوادي حَیَّه ئەکات کە بە ئەندازە صَرف کرێ، بۆیە لە جملەی ثاني (مُخرج) ئەفەرموێ. تَفسیري ئەو ایەتە کریمە بەو نَوعە لایەقە، أمَّا تفسیري (حَيٍّ) و (مَیِّت) بە مۆمن وکافر بِرَّو فاجِر صالِح وطالح عالم وجاهل، لێرە بێ مَعنایە فَضل لە مَناسَبە. ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ﴾ ئەمەتان، خوایە. ﴿فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾﴾ چۆن روو لەو وەرئەگێڕن؟ شَریکي بۆ پەیا ئەکەن؟

شُرَکاي وا کە قیمەتي دەنکێك و دانەیەکیان نیە، أکثر بێ حَیاتن، ئەوەي بە حَیاتیشە، حیاتیان پەکي لەسەر پارچە ئەستوکە جۆیەکي کەوتوە ﴿فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ﴾ ئەو نَوعە لێك کردنەوەکي ترە، بەڕووناکي بەیاني تاریکي شەو شەق ئەکا یا نَفسي رووناکی فَجري صادق شەق ئەکا، بە أطرافا بەڵاوي ئەکاتەوە. علماي هَیئەت ئەفەرمون ڕۆژ زۆر گەورەترە لە أرض وەمُنَوِّري ستارەي أرض دائِماً نصفي أعظمي أرض بە تیشکي هەتاو رووناك ئەکا، سێبەری أرض امتداد ئەکا بە مَخروطي، ئەولایەي بە عەردەوەیە پانە وردە وردە باریك ئەبێ تا لەسەر نقطه ێك تەواو ئەبێ أشعَّەی شَمس یەك ئەگرێتەوە، ئەو سێبەرە مُقابلی نور ئەروا وە دائِماً لەجهەتي شەوە لە طَرَفِي رۆژە، کە رۆژ بۆ لاي شرق مەیلي

کرد سێبەر بۆلاي غَرب مەيل ئەكا، وەقتێ كە هەژدە دەرەجەی بمێنێ بگاتە (أُفق) لە بەيني (سمت الرأسي) ناظِر وە (أُفُق) رووناكيێ پەيدا ئەبێ بۆي، چونكی سێبەري أرض تەنكە نَظَر بە طَرَفَيْن، ئەوە (صُبْحي كاذِبە) كە (شَمس) زياتر هات بۆ لاي (أُفُق) كەناري أُفُق روناك ئەبێ، ئەوە (فَجري صادِقە). وە أوقاتي ظهوري فَجْرَين لە افاقي مائلە ئەگۆڕێ تا ئەگاتە مَوْقِفێ (صُبْح) و (شَفَقْ) پێك ئەكەون، دوايێ بۆ لاي قُطب ئەڕوا، فَجر نامێنێ بەو نَوعە كە لەلاي ئێمە هەيە تاكو ژێر (قُطب) لەوێ ساڵێكی ئێمە ئەبێتە شەو رۆژێكی وان. اِنكاري ئەمە اِنكاري محسوساتە.

(إمام فخر الدين) ئەگەرچی لە ئێمە چاكتر ئەزاني وايە أما بۆ موافَقەی مَذهَبْ كە هەرچی هەيە مَحض بە خَلقي خوايە بَعضێ اِعتراضاتێ بێ معناي اِيراد كردوە. (سَيِّدي آلوسي) دائِر بە فَجر تَفصيلاتێ زۆر جواني اِيراد كردوە، وەتعجب ئەكەم لە آلوسي چۆن سكوتي فەرموە لە ردّی قولی (اِبن حجری مَكّي) كە ئەڵێ ئەوە مَبْنيە لەسەر قاعدەيەكی باطِلي حكمايان، ئەويش اِمتناعي خَرق دا اِلتيامە بۆ أفلاك. خُلاصە مُتَعصبي اِعتقادو فقە بە قسەي خۆيان قواعدي خَلق وايجاد تێك ئەدەن.

﴿وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا﴾ أكثري حَيوانات ئارامي تيا ئەگرێ اِستراحەت ئەكات ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗاۚ﴾ گێڕاويەتي رۆژو مانگ لەسەر أدواري مُختَلِفە كە اِختلافي شەو رۆژي پێ ئەبێ وەدەوەراني (قَمَرْ) بۆ حەواڵەي قُطب زۆر باشە وەك سابقاً بەيمانمان كرديە ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوي ذِكركرا وەك (طَبَري) ئەفەرموێ ﴿تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ٩٦﴾ خوايێ غالِب وعالِم بەهەمو شت ئەو خوايەيە ئەو أجرامەي بۆ تۆو خلق كردوە وَوضعي خاصّي بۆ داناون ئەو ئاثارەيان لێ تَرَتُّبْ ئەكا. ئەوەندە بەسيە بۆ رەددي أمثالي (إمامي هَيْتَمي) لەمە زياتر چی؟ نيە، تا بڵێين بە مَحْضي خَلْقە.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ﴾ ما عَداي شَمس وقَمَر. ﴿لِتَهۡتَدُواْ بِهَا﴾ بەو ئەستێرانە ﴿فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۗ﴾ ئەوانەي دەليلي قافلەن لەبەرر وەرائيدي پاپۆڕن لەبەحر، لە نجوم زۆر إستفادە ئەکەن. في الحقيقة نجوم ثَوابت وسَيّارە لە سَعادت ونحوسەت هيچ تأثيريان نيە لە عالەمي بَشَرِيَّت، جَوامِدن، ئاگايان لە تَدبيري أمور نيە. ڕۆژ تأثيري ديارە، أمّا ئەويش وەك عەردي ئێمە لە مَعادن و موادي عَديدە مُرَكّبە، ئەوي خۆي بە نجومان ماندي كات زەحمەتێ بێ هودە ئەكێشێ. ﴿قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ ئەوانە اياتێ زۆر عَجيب وغَريبن أمّا مَألوفن جَلْبي نَظَر ناكەن.

قرآني كريم دائماً جَلبي نظر ئەكا بۆ أموري مَألوفە، تاكو وَقايعي صُنعي لێ وەرگرن. رەحمەت لە عُلماي هَيْأت بێ بە نوعێ لە اياتي سَماوات وأرض روو چوين دَقايق وحقايقي وايان دەرخستوە كە إنسان چ جاێ لە صُنعي پەروەردگاري عالەم لە كشفياتي وان تَحَيُّر ئەكات.

هيچ نەبێ لە سايەي وان ئەزانين ڕۆژو شەو چي يە، لە كُفرياتي جَهلي طُرُق، نجاتمان بو. بەيان و لێك كردنەوەي ئەو اياتي عِظامە ﴿لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٩٧﴾ صاحبي تدبّر وتَفَكُّرين، بە إعتقاداتي مُزَخرەفە عقلّيان تێك نەچووبێ، عجايباتي نافِعە لە مەياني أموري ظاهرو مَألوف بدۆزنەوە، قوەي انتباهيان تەواوبێ ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ﴾ هەرچي بێ، با شَبيهي قِرَد بێ، امتيازاتي فِطري هەر لە طَرَف ئەوە.

﴿فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞۗ﴾ اختلافيان زۆرە لەسەر مُستقِر ومُستودع وە مُستَقَر بە سەرو ژێري قاف دەخوێندرێتەوە، ممكنە بلّێين پاش ئەوە كە قاعدەي إزدواج تقرري كرد ئەوي ئەچێتە ناو رەحم وائەبێ قەرار ئەگرێ مُدّەي حَملي تەواو ئەكا، انساني تامّ الخلقي لێ پەيدا ئەبێ، واش ئەبێ قەرار ناگرێ زوو يادرەنگ پێش تەواوي مُدّە رەحم فرێي ئەدا، وە انساني ناقِصُ الخِلقي لێ پەيدا ئەبێ،

أَنَّهُ به أمانه‌ت داندراوه، لاشك ئه‌وه له أمراضي ره‌حمه ئه‌مڕۆ أطِباي مُتَخَصِّص ئه‌توانن چاره‌ي گه‌لێ له‌و أمراضانه بكه‌ن.

﴿قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ ٩٨﴾ ئه‌و إنشایه ایه‌تـي مُجَمله، أمَّـا ايات وعَجايباتێ مُفَصَّلي تيايه أربابي فِكري ثاقِب ونَظَري صائِب مُتَنَبِّه بۆ أسراري ده‌قيقه مُقْتَدِر له‌سه‌ر إستنباطي أحكامي ورد ورد، تێی ئه‌گا فهمي ئه‌كا، بۆيه لێره فِقهي اختيار كرديه له‌سه‌ر عِلم، چونكي اِهتِدا به نجوم زۆر دِقَّتي پێ ناوێ، وه بۆيه ئێمه به أئِمَّه‌ی عِظام وه‌ك (أبی حنيفه) و (مالِك) و(شافِعي) و (أحْمَد) ئه‌ڵێين (فَقيه) بتواني تر ولَوْ مِثلي (غزالي) و (إمام فخرالدين) بێ پێ يان ئه‌ڵێين (مه‌لا). ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ له طَرَف هه‌ورو بلَندی ﴿مَآءٗ﴾ باران ﴿فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا﴾ له ئاوه‌كه، نافه‌رموێ (بِهِ)، چونكي ئاو مَنشأي حَياته. ﴿نُّخۡرِجُ مِنۡهُ﴾ له گيايه سه‌وزه‌كه ﴿حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا﴾ يه‌ك سواري يه‌ك بَعضي له‌سه‌ر بَعض. ته‌ماشاي گوڵه گه‌نم وجۆو گه‌نمه شامو نروات كه‌ن چۆن هوندراينه‌وه؟ كو رێك خراين؟ عَقل حه‌يران ئه‌بێ له‌و وَضع وتَرتيب وهَندَسه‌يه.

﴿وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا﴾ له طَلعي دار قه‌سپ. طَلع ئه‌و كيفه‌يه كه هێشوي خورماي تێدا تَكَوّن ئه‌كات وه‌دێته ده‌ره‌وه ﴿قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ﴾ وشي نێزيك بۆ لێ كردنه‌وه.

گه‌رچي بَعضه دار خورما سه‌رئه‌كێشێته سَماء أمّا أربابي خۆي به هاساني ئه‌يرنێ وشي لێ ئه‌كاته‌وه. ﴿وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ﴾ له باغاتي دارمێو، ترێی هێناية‌ده‌ر.

﴿وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ﴾ هه‌نار. ﴿مُشۡتَبِهٗا﴾ پێك ئه‌كورێن له‌به‌ر مُشابَهَ ﴿وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖ﴾ بَعضه كيشي پێك ناچن. ئه‌و وه‌صفه راجِح وايه لاي حَقير راجِعي

هەناره، له عبارەتي (سَيِّد رَضا) دەرئەکەوێ، ئەمە إختياريەتـي. ﴿ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ﴾ کُلیٚ له دار قەسپ و مێوو زەیتون وهـەنار ﴿إِذَآ أَثۡمَرَ﴾ کـه بـەر ئـەدا. ﴿وَيَنۡعِهِۦٓۚ﴾ گەیشتنی. چۆن تطوراتیـان بەسـەردادیٚ؟ چ حَرکـاتي ئەکـەن؟ لـه طَعم ولَـوْن مِقدار؟ خصوصـاً لـه وەقـتي (هەرپیچـان) بچیه نـاو بـاغي مێـوي سەرداران چ بینێکی خۆشت بۆدیٚ؟ ئەتوانم بلّێم وێنەي بـۆنی بەهەشـتە. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ﴾ لەوانـەي کـه بـەیان کـرا بـۆ ئێـوه ﴿لَأٓيَٰتٖ﴾ لا تُعَدُّ ولا تُحْصى. (سَعدي) ئەلّیٚ:

(بَرگی دَرختان سَبزَست در نظري هوشيار
هَرْوَ رقي دفتَرَيست صُنْعَتي پروَردگار)

ئەمە حالّی پەلك ئەوجا بنۆڕە بەرو بۆیان! ئەو ایەتـه ﴿لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٩٩﴾ ظاهِره کە بَعضي أمرو طَبيعەت تَداخُلي هەیه لـه شـین بـون وبـەردانـي نَباتـات وأشجار، أمَّا ئەویش هەر لـه صُـنعی خوایـه، طَبیعـەت نـابیٚ بـه شَـریکي خـوا، بەلّکو مُسَخَّره له طَرَف حَضرتي کبریائي، وه بۆ اِصلاح و چـاك دان و بـەریان، عَمَل وتربیەی بَشَري پیٚ ئەویٚ.

بَشَر لەو مَقامه گـەلیٚ لـه فَـوقي ئەوانەیـه کـه بـه شـریکي خـواي دانـدراون ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ﴾ مُتَعَدِد شَریك له ألوهیەت له ربوبیەت شُـرکاي بـۆ نـانیٚ، نایەته حساب. ﴿ٱلۡجِنَّ﴾ له زەواتي بزر، مَلائکه، له ئێمه چیتر، شَیطان. (مَلَكْ) هەرچەند مُقَرَّب و گەوره بیٚ، نَظَر به مَقامي ألوهیەت، جنۆکەیه. قُـران مَسـلَکي زۆر جواني هەیه، ئەوەي بشر لـه مقـامي خـۆی تێـی پـەڕێنیٚ، خـوا ئەیهێنێتـه خوار، ئەوي بەرەژێری کا، خوا بـەرەو ژوور بلّنـدی ئـەکا، چـونکی غَـیري خـوا هەرچی بیٚ، خوارو ژووري بۆ هەیه، جامِع نَقص وکَماله. أهلي حِکمەت ئەوانەن تەماشای شت بکەن به چاویٚ حەق بین، چۆنه له نَفْسُ الأمرا، واي ببینیٚ، لکِـن ئەوانه زۆر کەمن بـه گـوێرەی مَیـل ئـەگۆڕێن دائِمـاً لاي اِفـراط وتَفـریط ئـەگرن

بەرێی عَدلاً دا نارۆن. ﴿وَخَلَقَهُمْ﴾ خوا ئەوانی ایجاد کردوە، شُرَکاء یا مُشرِکەکان. ﴿وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ مَلائکە کیژی خوان، عیسی کوڕی خوایە. فی الحقیقة وەکی انسان لە معتقداتی أوَّلین ئەوفکرێ فَرقی خوایان لەو طَرزە أحوالە لە انسان وحیوانات نەکردوە. ئەوی بێ نمەك نەبێ ئەزانێ کَمالی تَوَحُّدُ وتَجَرُّدی الاهی، لە الاهیّونی یۆنان وەرگیراوە، وە عباراتی حکمەتی علم خالّیە لە مَجازو کنایەت وتَمثیل واستعارە، بۆیە (ملیّون) بعضێ لەسەر منوالی أوَّلین رۆیشتون، گەرچی لای رُسُلی عِظام ایاتی تَقدیس وتَنزیە زۆرە ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ١٠٠﴾ بلندترە لەوەی بێتە ریزی حَیوانات داخلی ممکنات طَبیعیات ببێ. هەر صِفاتێ هی ممکنات وطبیعیات ومادّیاتە، خوا لەوە مُنَزَّهە.

لە بعضێ مقالاتی خۆم وتومە: (ئەم دیوە فرقەێ ایمانی هەبی بە خوا، بَعضێ ممکناتی بلّند نەکردبێ بۆ مَقامی إلاە، وەیا إلاهی نەهینابێتە ریزەی بَعضێ لە ممکنات) سُبْحَان الله...

﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەو ئاسمان وأرضی بَدیعە، یَعنی داندراو لەسەر شکل وتَرتیبێ بێ نَظیر مُشتَمِل لەسەر دقایق ووردی صُنْعی، ایجادیان لە طَرَف خوایە، بێ وێنە، لە گوێرەی شتێ دروســت نەکراون، کەسێ وابێ ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ﴾ هەرچی مَوجودە غَیری حَضرەتی کبریائی، یا سَماویە یا أرضیە، خواش کە خالِقی أرض و ئاسمان بێ ئەوی تێی یان دایە، ئەبێتە مَخلوقی بَعد المَخلوق، وَلَدْ چۆن ئەبێ؟ ﴿وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ﴾ وە إلاّ ئەبێ ئەویش قَبلَ خلق السَّموات والأرض بێ، مُقَدَّسەبێ لەجهەت زەمان ومکان، کەوابێ ئەبێتە واجِبةُ الوجود، ئەو إنفعال أُنوثەتە لەگەڵ وجوبی وجود چۆن گر ئەبێتەوە؟ ئەبێ بلێین ئەویش وەك داك (حَوّا) کە لە آدم خُلقاوە، لە خوا خُلقابێ، باوڕناکەم-خُلاصە- وەکی خوا ئەفەرموێ قسەی وانە وەنیە لە

عِلمەوە بیّ تابە طَریقي عِلم بۆیان بچینە پیّش، صِرف لە جَهل وحَماقەتە.

﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖۖ﴾ لە علویات و سُفلیات هەرچی مَوجود بیّ مَخلوقي ئەوە، ج رَأساً ج بە طَریقي تَوَالُدْ خوا داخلي عُنصُریان نیە، فَضل لەوە کە داخلي قاعِدەي تَوالُد بیّ، وَلَوْ بە مَبْدأیّ، ئەوەي بەوَلَد بیّ یا شتي لیّ بە وَلَد بیّ، دەبیّ نەمینیّ، بمریّ. ﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ١٠١﴾ کەسیّ کەمیّ أهلي علم بیّ، چۆن ئەتوانیّ بلیّ (غَیري زاتي واحِدي واجب الوجود هەمو شت ئەزانیّ) خصوص علمي عَمَلي. کەسیّ خالقي هەموو شت بیّ هەمو شت بزانیّ، چۆن شَریك ووَلَد ورَفیقي ئەبیّ؟ حاشا ثُمَّ حاشا. ﴿ذَٰلِكُمُ﴾ ئەو زاتي مُقَدَّسي فَوقَ كُلِ شيْءٍ ﴿ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ﴾ زاتي واجب الوجودو واحِدي حَقیقة.

﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ﴾ وەوجوبي وجود، وجودي واجب مُتَّصِف بەوَحْدَتي حَقیقي، شِرکەت قبولّ ناکا، غَیري ئەو هیچ خواي تر نیە، وە إلاّ وەك سائري ماهیاتي ممکنات ئەبیّتە صاحِبي أفراد، ئەمەش تنزیلي واجبە بۆ مَقامي ممکنات.

﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ چۆن ئیّوە مخلوقن فکر ئەکەن خالقیّ تر بۆ خۆتان بدۆزنەوە هەرچی ببیّ غَیري واحِدي واجب الوجود، وەك ئیّوە مَخلوقە لە جِهەتا لە مکانا، گەلیّکیان مِثلي ئیّوە مُحتاجی لقمەیّ نانن، مُمَثَّلە کانتان بەهەزار دەرەجە لە ژیّر ئیّوەن. ﴿فَٱعۡبُدُوهُۚ﴾ هەر خوا بپەرستن غَیري ئەو عبادەتي کەس مەکەن. ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ١٠٢﴾ هەر ئەو مُدَبِّرُ الأمورە، نە لە خَلق وایجاد، نە لە تدبیرو تَدویري عالەم، حاجەت بە شَریك ناکات، تاتَوَهُم نەچیّ تَدبیري کاروباري عالەمیّ، تَفویضي کەسیّکی کردوە.

﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ﴾ لە صَدري کتاب فەرموي: (ئەو قُرانە هِدایەتە بۆ ئەوانەي ایماني بِالغَیبیان هەبیّ، یَعني مَربوط نەبن بە حِسیّات وبەس

وەحضرەتي کبریائي غَیبي مُطلَقه، بەبەر هیچ حَواسیّ ناکەویّ، قوەي باصرە ناگا بەو باوجودي خَطيِّ شُعاعي بَصَر بە أدْنی جَوَلان بە نِصفي عالەم ئەگا.

ئەستێرەیّ بە چەند هەزار سالّیّ نوري لە ئێمە دوورە، بە طرفەیّ بە ئێمە ئەگا، إنسان بەچاو ئەي بینیّ. کەوابیّ سائري مشاعِري دي، بە طَریق الأوْلی، دەرکي ناکا. ئەگەر ئەو قَومە مُعاندە کە لەو صورەتەدا مُخاطَبن، دەعوا بکەن ئێمە خوا ببینین ئەوجا ایمان دێنین، وەك بَني اسرائیلي کە وتیان ئێمە ایمان ناهێنین تا خواي بە ئاشکرا نەبینین، بالەو دَعوایە خامە دەست هەلگرن، چاو دەرکي خوا ناکا نە لە دونیا نە لە عُقْبا، بە حَواسي حَیواني نابیندریّ، تَمثیلیش بۆ خوا ممکن نیە، قیاس لە جبریل وشَیطان ناکریّ، دەك کۆر بن ئەوانەي قیاسی خوا لە جبریل وإبلیس ئەکەن (چۆن ئەوان تَمَثُّل ئەکەن ئەویش تَمَثُّلْ ئەکا) تَعالی الله. أشاعرە کە قول بە رؤیة الله ئەکەن، مُعترفن بەو نَوعە رؤیَتە بەو شَرائطە کە ئێمە یەکتري پیّ ئەبینین، خوا وها نابیندریّ.

﴿وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَ﴾ چ عجیب صُنعێکی تیایە، چی پێی ئەبیندریّ، چی پیّ نابیندریّ. کەسیّ تەماشاي تحقیقاتي حُکَماي جَدید بکا لە (بَصَر) کیفیەتي دیتن بە (بَصَرْ) حەیران ئەمینیّ. ئەو ئایەتە حضرەتي (عائِشة) إستِدلالي پیّ هێناوە لەسەر نەدیتني رسول ي کِبریاء، اِي خوا، لە شەوي (مِعراج)، دوایّ بوە مَعرەکەي سُنّي مُعتَزِلیان.

(سَیّدي آلوسي) زۆری درێژەداوەتیّ وەکذا (سَیّد رَشید).

(سَیّدي آلوسي) لەبابی اِشارات نَقل لە (شێخی عَرَبي) ئەکا کە عَبد خوا ئەبینیّ بەو چاوەي کە خوا بویتە عَینِي، ئەوەش بِنا لە حَدیثیکي کە نَقلي ئەکەن (لا يزالُ العَبْد يَتَقرَّبُ إليَّ بالنَوافِلِ إلخ...).

وە (سَیّد رَشید)یش مەیلێکی بۆ دەکا. أمّا بە نَظَر مِن ئەو قسە (سَفْسَطه)یە إنسان وَلَوْ تَقَرُّب بکا بەقەدەر أرض وآسمان، خوا نابێتە عَیني عَین و دەست ولاقي ئەو، بەلّکو لەو مَقامە زیاد نابیّ لە (حَجَرُ الأسوَد) کە پێی

ئەڵێن (يَمِينُ الله) مَعَاذ الله خواي حجر الأسود كە چل ساڵ لەسەر گوفەكي (كوفە)ي فرێدا لە أيامي (قَرامِط)ان وە لە أيَّامي (عبد المجيد خاني عثماني) گوللەكي پێ كەوت چەند پارچۆكەي لێ كردەوە، ئەگەر (يَمين الله) بێ، ئەبێ خوا هَيكەلی حَجري بێ. ئەوانەي بەدوو (رَكْعَتْ) شەو نوێژو دوو سێ رۆژ رۆژی گرتن و نەختێ رياضە ت خواببێتە چاوو دەست ولاقيان، ئەدي ئەبێتە چی بۆ پێغەمبەرەكاني عِظام؟ بۆ ئەوانەي سەرو ماڵ و روح وأولاديان دادەنێن لە رێی خوا؟.

خُلاصە گوێ مەدەرە ئەو قسانە بڵێ ﴿وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ١٠٣﴾ لَطيفێ وەك هەوا، نا. لَطيفي لە هەمو أحوالي مادّيات وطبيعيّات، مُنَزَّه و مُقَدَّس، كە حُكما ئەڵێن مُجَرَّدە.

ئەو عيونُ الله يانە ئەو أيدي الله يانە ئەو أرجُلُ الله يانە چيان لێ هات؟ چيان كرد؟ مُقابلي دوو سێ گەرِو گوريِ ئەوروپاي، ئەگەر بە دەعواو لاف و گەزاف و خۆ هەڵكيشاني ناوپيرێژنان بێ، تەواو هەر خۆمان حسابين، أما كە هاتە مەيداني كارزار، كەس نيە، نا شكري نەبي تۆزێ بكات. ﴿قَدۡ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ﴾ لەبەر شِدَّتي إتِّصال رێی (قُلْ) نيە بَصيرەت بۆ دڵ، وەك بَصَرە بۆ چاو، بە عَقل ئەزاندرێ ئەو عالەمە صانعێكی واجب الوجود وعالم وقادر وبَديعی هەيە، لە ئاثار بۆي بەدەرئەكەوێ. (عابدين پاشا) لە شَرحي مثنوي مناظرەی (سُقراط) و (بقراط) بە تَفصيل نَقل ئەكا، أز جملە (بُقراط) ئەڵێ: (ئەوي نەيبينم لام نيە).

(سُقراط) ئەڵێ: (تۆ عَقلت هەيە؟ ئەڵێ بەڵێ؟ ئەڵێ ئەي بيني؟ ئەڵێ نا، ئەڵێ ئەدي چۆن ئەڵێی هەيە؟ ئەڵێ بە ئاثار ئەزانم، ئەڵێ ئێمەش خوا بە ئاثار ئەناسين ئەزانين هەيە). (سُقراط) ئەڵێ: (أعظمي آياتي خوا لەناو چاو دايە، لە عَدَسەي گچكەلۆكە بە أدنی نَظَر نِصفي عالەمي تيا طَبع ئەبێ، أمَّا خَلقي لێی غافڵن، چونكي شتێ لەناو چاو بێ نايبينين).

ئەو آياتي مَسروره لە شەوي حَضرەتي إبراهيم تا ئێره لەبەر قوەت و مَتانەتيان كَأَنَّهُ عَيني بَصيرەتن.

ئەو آيەتانە بۆ ئێوە هاتن لە طَرَف ربّي خۆتان لە جهەتي تَربيە بۆي ناردينە. ﴿فَمَنۡ أَبۡصَرَ﴾ بە واسِطەى ئەو بَصائِرە ببي بە صاحِبي قوەتي بَصيرەت كە بە باصِرە لە مەياني مُبصَراتي ظاهِره لە أضواء وألوان دقايقي صُنع وايجاد درك بكا، زاتاً مَقصد لە ديتن، ئەمەيە، وە الاّ حَيواناتيش رەنگ وروناكي ئەبينێ.

ئەمرۆكە كە فَصلي بەهارە خاصَّةً بەهاري (كۆ)يە زۆر بَديعە عارِف و عامي تەماشاي باغ وراغ وكێو كەژ ئەكا، ئەوي زانايە لە غَرائب و عَجايبي صُنعي پەروەردگار حَيران ومَدهوش ومَبهوت ئەمێنێ لە مُشاهدەي جَمال وحُسْن زينەتي فَصلي حَيات، مەست ئەبێ، ئەوي نادانە دێوو دەچى بە غَيري مَنظرەكەي ظاهِري چيتر نابينێ چاويان هەيە أمَّا پێى نابينن چونكي چاوي دلّيان نيە، ﴿فَلِنَفۡسِهِۦ﴾ مَنفعەتى ديتني بۆخۆيەتي، حەقّ حەقايق دەرك ئەكات، لە أسارەت وزِللەتى شِرك دەرئەچێ، لە ديتنى أشياء فەرقي ئەبێ لەگەڵ حيوانات.

بەڵكو وردە وردە تەرەقي ئەكا ئەبێ بە عالِمي فَلَكي طَبيعي كيميائي ميكانيكي آخري ئەبێ بە مخترعى عَظيم.

﴿وَمَنۡ عَمِيَ﴾ كۆر بێ، حَقايق ودَقايقي أشيا نەبينێ، تَدبُّرو تَفكّري تێ نەكا ﴿فَعَلَيۡهَاۚ﴾ زەرەرى كۆرى بۆ خۆيەتي، لە گێژاوي جَهل دا ئەمێنێ لە دەرەجەي انسانيەت سقوط ئەكا بۆ كۆمەگى، بۆ بەردێ تاشراو ئەكەوێتە سَجدە.

جەنابي حەق ئەو مَلكوتي سَماوات وأرض كە بۆ إبراهيمي نواندوە، بۆ ئێوەشى نواندوە، وەزيادةً بە (وَحي) بەيانى اياتي كردوە، ئيتر ئەگەر كۆرو كەرر نەبن ئەبينن ئەبێن. ألحَق ئەو مَدارِكي خوا دايتيە (سُقراط) و (لُقمان) و

(أفلاطون) و (أرسطو)، دايتيە ئێمەش، ئەوان لە مَوقعي خۆيان خەرج كرد، بوونە ئەو پياوە، ئێمە دەستمان بە داوي أوهام وخيالاتي فاسِدە گرت بوينە ئەو نَوعە جانەوەرە.

﴿وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ١٠٤﴾ من لەسەر ئێوە ئاگادارنيم ئاياتي اِلاهيتان پێ ئەگەيێنم، حەق وحسابتان عايدي خوايە.

﴿وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ بەو نَوعە ئاياتي (كَون) لە حالێ بۆ حالێ لە وضوح بۆ أوضَح نَقل ئەكەين وەهكَذا تا نهايەتي حَياتت. ﴿وَلِيَقُولُواْ دَرَسۡتَ﴾ با هەر بڵێن خوێندوتە لە جولەكانت وەرگرتيە، يَعني با ئەوانە ايمان نەهێنن صَرفي آيات بكەن لە وَجهي خۆی، ئێمە لەسەر ئەو حال وبَيان وناردني ايات مُشتَمِلْ لەسەر أنواعي ايات دەوام ئەكەين، ئەيان نێرين. ﴿وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ١٠٥﴾ بە تَصريفي ايات حق بَيان وئاشكرا ئەكەين، بۆ قەومێ دانا، بائەو نەزانانە استفادەي لێ نەكەن، أمَّا ئەوانە زۆر مُستَفيد ئەبن، زاتاً تبأيني فِطرەتي بَشَري، ئەو تباينە لە قَضائە خوازێ.

﴿ٱتَّبِعۡ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾ دەوام كە لەسەر ئەوەي لە طَرَف خواي بۆت هاتوە، دواي كەوە عَمَلي پێ بكە.

﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ غَيري ئەو إلاهێ نيە تابعي بي، هەر ئەوەو بەس ﴿وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٠٦﴾ أهميەت مەدە بە قسەي وان، فتورت پێ نەگا، وَظيفەی خۆت كە تَبليغە بە حەق بەجێ بێنە، ايمان نەهێناني وان، قصوري تۆي تيانيە ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكُواْ﴾ ايمانيان داخلي دائرەي مَشيەتي تۆنيە، ئەگەر خوا حەزي كردبا دەبون بە موَحِّدْ نەدەبون بە مُشرِك في الحقيقة ئەمە لە دائرەي إمكاني زاتيە، أمَّا نَظَر بە إمكاني إستِعدادي، مُحالە. فطرەتي تَربيە عائِلەوي وقَومي، فِطرەت وطَبيعەتي أوَّلي لێ تێك داون بە فَساد چوين ﴿وَمَا

﴿جَعَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗاۖ﴾ دڵیان بپارێزي له شرك وكُفرو أخلاقي رَديئه ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ١٠٧﴾ ئیش و کاریان بۆ بکەي (كَما هُوَ المَصلَحة). حاصلي حَضرەتي رسول بَشیرو نَذیره مُبَلِّغه تَصَلُّتي لەسەر وان نیه، نه مَعْنَوي نه مادّي، هەمویان ئەیانزاني حَضرتي محمد (أُمّي) بووه نەیخوێندوه مُدارەسەي لەگەڵ کەس نەکردوه، ئەوه إیجابي ئەکرد ئەوانه پێش هەمو کەس تَصدیقي بکەن که حَضرەت دەرس له خوا وەرئەگرێ، ئەوەي بۆواني تَبلیغ ئەکا له حُکم حُکمي وَحي ربّانیه، لەسەر ئەو حاله ئەو اِفتِرایه نابەجێ یانه ئەکەن، نێزیکه لەو وەقته أصحاب نائِرِي غَضَبیان بێته جۆش تَسفیەیان کەن ناوي خۆیان وإلاهیان بەناشیرني ببەن. جەنابي حەق ئەفەرموێ ﴿وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ نەخۆیان نه الاهیان جنێویان پێ مەدەن، زیرا ئەوانه قَومێ جاهِل ومُتَعَصِّبن، ئەوانیش له پاداشی ئێوه جازەت ئەکەن ﴿ ﴾ مَعَ أنَّهُ ئەوانه مُشرِکن ایمانیان بەخوا هەیه، أمّا لەو مَقامه وا ئەنوێنن که حضرة کبریائي هەر اِلاهي مُوَحِّدەکانه. ئێوه ئەمڕۆ دەسەڵاتتان نیه له چەنەیان راکێشن، ئەو سَبَّەیان ئەبێته ﴿عَدۡوَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖۗ﴾ ئەو نَوعه حاله له بَشَردا زۆره له أیّامی فەقێ یەتیم شەوي له حُجره باس کرا که (جوو)، زۆر جون به پێغەمبەري ئێمه ئەدەن، فەقێ دەستي کرد به جون دان به حَضرتي (موسى)، نَهرەتمان لێ کرد، ووتي بۆ ئەوان جون به پێغەمبەري ئێمه ئەدەن بۆچی ئەمن جون به پێغەمبەري وان نەدەم؟

(سَیّدي آلوسي) ئەفەرموێ: (خۆم دیم شَخصي له عَوامي سُنّي گوێی لێ بوو بعضێ رافضي زۆریان جوني به حضرەتي أبو بکرو عمردا، ئەویش دەستي کرد به جوین دان به إمامي عَلي، ووتیان چۆن تۆ جون به حضرەتي إمامي علي ئەدەي؟ ووتي من زۆرم رق بۆوه مَقصودم بوو مُقابَلَةً رقیان کەمەوه، وەهیچم نەدیت وەك سبّي علي رقیان پێ ببێتەوه، بۆیه وام کرد دوایْ اِنایَت

پەشیمانیم كرد). ﴿كَذَٰلِكَ﴾ وەك ئەو تزینە ﴿زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ﴾ ظاهِرە لە عمومي مؤمِن وكافر ﴿عَمَلَهُمْ﴾ لەخێرو شەر. أمّا مُعْتَزِلي ئەڵێن: (تَزیني شەڕ ناشیرنە نَقصە، بۆ خوا مُحالە، بۆیە ئەڵێن مقصد لە – أمّة– مُسُلمانن وەلە –عَمَلْ– خَیرە).

ئەو قَولَە نَظَر لە مَقام دوور نیە، لاشَك سَبّي آلِهەی باطِلە وقَدَحْ لە عِبادیان، قَبیح نیە، بەڵكو حَسَنە أمّا ئەگەر سەربكێشێتە شتێ زۆر ناشیرن، تَركي حَسَنە بە زینەتە. جەنابي حەق بەو نَوعە، زینەتی تَركي سَبّي مُشرِك شُركاء، بۆ مسڵمانان، ئاشكرا ئەكا.

وَە لەو مَعنایە ظاهِر تر ئەمەیە: (أنَّهُ كەسێ ئەڵێ چۆن ئەوانە مُقابَلەی مُسڵمانان ئەكەن بە سَبّي إلاه؟ الجواب ئەو مشركانە ئەوەندە مَیل و حُبّی الاهي خۆیان هەیە وایان لا مُزَیّنە عِبادەت و اِحترامي ئەو هَیاكلە، كەسێ ایماني بە إلاهي وان نەبێ بەڵكو – مُوَحِّد– بێ جنێو بە اِلاهیان بدا بەو نَوعە مُقابَلە ئەكەن كە رەگی جەرگی خَصمیان بپسێنن). وە هەم نَظَر بە عمومي لَفظي (كُلَّ الأُمَّةِ) ئەڵێن: (جەنابي حەق بۆ كُلّي قَوم مؤمِن وكافِر عَدلاً وفاجِر، أعمالیاني بۆ زینەت داون). أمّا بۆ تحقیقي ئەو مَعنایە ئەبێ تەماشاي رەوشتي أقوامِ ي بَشَر بكەین.

كُلّي قَومێ گەلێ آداب عَنعنات وعاداتێ زۆر زۆر ناشیرنیان هەیە، أما لایان گەلێ شیرین وجوانە، ئەز جُملە بنۆڕنە رەش بەڵەكي كوردان، ژن وپیاو تێكەلاو ئەبن پەنجە لەناو پەنجە ران بە ران شان بە شان دەست ئەكەن بە هەڵپەڕین، گەلێ پیاو ژن كچ و خوشكي خۆي لە دەستي پیاوي بێگانە ئەبینێ هەتا قیت وقۆز خۆي بنوێنێ وقنجیلەتر هەڵپەڕێ كەیفی پێ دێ.

(دانس) شتێكە بَشَریەت قبولي ناكا أمّا بە ناوي فنوني جمیلە زۆر بە كارێ مُستَحْسَن وشیرن حساب ئەكرێ، خاصَّةً هەرە سَیِّئات وقَبائحي بووە مَظْهَري تقدیري ئەورووپاییان، لاي عمومي بَني آدەم بە اِعجاب وتقدیر قبولێ ئەكرێ، حَتّا

واي لیّ هاتیه اِنپراطریّ که حوکمي لەسەر چوارصەد ملیون انسان إجرا ئەکریّ لەگەڵیّ اِحتفالات هەیە اِنپراطۆر بەچە رەقص ئەکا، ئەگەر نەختیّ مَهارەت بنوێنیّ هەمو جرائدي دونیا ستایش أعلی حضرەتي شاهَنشاهي ئەکەن.

بعضيّ حکمای غَرب اِدّعا ئەکەن هیچ شتیّ قَبیح نیە، بەڵکو مدار لەسەر اعتیاد وعدمه إعتیادە، خۆ ئەگەر ناوي دینیشي هاتە سەر ئەوجا بە ملیون تێ ئەکەنن، وەئەمەش لە زومرەي کَرامەتي أولیاءُ الله عَدْ ئەکەن. وەهەکَذا خۆت بنۆڕە أحوالاتي بَشَر شەڕوشۆڕو أموري سَیِّئَه، عادةً، بۆیتە فِطرەتیّ ثانیە، عائدي تَربیەیە، بۆیە جەنابي حەق نِسبەتی ئەو تَزینە بۆ خۆي ئەدا (کَأَنَّها هيَ هيَ)، لەسەر ئەو نِسبەتەش باز ئەبیّ بە چاوي دِقَت تەماشاي حالي عالەم بکەي تا بزاني ئەو تَزینە قابلي زەوالە؟ یاچونکي لە طَرَف خودایە ئەبیّ لازمي غَیرە مُفارِق بیّ؟ قَریبي دوو ساڵ یەك دوو حُکّامي سیاسي انگلیزي لە کۆیەو رانیە بوون، ئەوانەي عادەتیان گرتبو بەڕیّ گري، بە إنسان کوشتن، بەمال دزین، بە خەرمان وخانوو پووش و پاوان سوتاندن، تەرکي عادەتیان کرد، ئەو بەدکارانە قَطعیاً نەیان ئەتوانيّ مەڕیّ لەناو بکەن باقەپۆشیّ بسوتێنن. ئەو شەوە کە حاکمي سیاسي لە کۆیە رۆیی شەوي جُمعە بوو، بەشەو رۆژیّ لەناو شارو حَوالەي شار، یازدە کەس کوژران، کَما في السّابِق بۆوە دەوري مسڵمانان قَتل ونَهب وسَلْب ودزین وریّ گریّ وإحراق، نِصابي پێشوي گرتەوە، وەتا ئەمڕۆ سَنَةً فَسَنَةً لە زیادی دایە، کەوابیّ دیارە ئەو تَزینە، قابلی زەوالە.

أهلي صَلاح ئەتوانن لە ژێر ئەو پەردەي زینەتە ناشیریني أشیا بەدەر خەن، نَفرەت باوێنەناو مِزاجي مُسلمانان، زیباو زینەتي أموري مُستَحسنە بەدەر خەن، نافرەجاي کاري بەد بۆ عبادي خوا ئاشکرا کەن. کەسیّ لە غایەتي شَوق و وَشیق رووکاتە کاریّ بەد، لەوانە نهایەت دەرەجە لاي مُـزَیَّن بیّ، ئەتواني بە زللەیّ هەمو مَیل و تَزیناتي ئەو کارەي لە دەماغ ببەیتەدەریّ بناءً علیه ئەو ئایەتە زۆر حەقە مُشتَمِله لەسەر حقیقەتیّ بیّ شك و شُبْهە. وَمَعَ هذا بێتە دەلیل بۆ ئەوانەي نائلي فِسق وفجورن بڵێن (مادام ئەوانە خوا بۆماني

تَزین ئەکات، ئێمە دەسەلاتمان نیە ئەبیٚ بیکەین). نابینی خوا ئەفەرموێ ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ﴾ لەپاش مردن گەڕانەوە بۆلاي خواي خۆيانە ﴿فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾﴾ بامُزَيِّنيش بیٚ لە طَرَف خودا، ئەگەر ئەو تَزینە إجبار والزامي تیابایە، قَطعیاً خوا واي نەدەفەرمو. وە ممکنە بلێین جەنابي حەق بۆ کُلّي أُمَّتیٚ عَمَلیکي لایەق بە انسانێەت وحافِظ بۆ نِظامي إجتماعي بە زینەت داوە ئەوانەی أهلي (خِرد) بن عَمَلیان پیٚ کردوە، باقي دواي هەواي نَفس وتَسویلاتي إبلیسي کەوتونە. پاش (بَعث) خوداوەندي خَبیر وبَصیر خەبەریان ئەداتیٚ بەوەي بالفِعل کردبویان لە چاکەو خراپە. ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ﴾ سوێند ئەخۆن سوێندی زۆر بە قووەت ئەوەندەي لە طاقەت و لُفەتیان دابیٚ تأکیدیان کردیە ﴿لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ﴾ ئەوەي ئەوان ئەیخوازن ﴿لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ۚ﴾ بە سَبَبْ آیەتەکە ایمان بە تەواوي دێنن، یابە وَحدانیەتي إلاهي، بِنا لەسەر دەعوەت ورِسالەتی تۆ، گۆیا ئەو مَلَکوتي سَماوات وأرض کە بۆیان بَیان کراوە تَفصیل درا، هیچ نیە. بەڵیٚ ایەتی عِلمي نَظَر بە عَوام حَتّا سَوادي أعظَم لە مُسُلمانان، فائدە نادا، کَیفیان بە شتی سەیر سەیر دیٚ -حوشتر لەسەر منارەي چۆپی بکێشیٚ بزن حەیرانان بلێ - ﴿قُلْ إِنَّمَا ٱلْـَٔايَـٰتُ﴾ هەرچی بیٚ ﴿عِندَ ٱللَّهِ﴾ لاي خوایە لەبەر دەستي من دانیە، زاتاً مُعجِزە مُداخَلَەی قُدرەتي صاحِب دەعوتي تیانیە - بِوجە مِنَ الوجوە- ضَربي عَصا لە کیٚ؟ شَقّي بَحر لە کیٚ؟ پف لیٚ کردن لە کیٚ؟ قوڕیٚ وەك هَیأتي طَیر دروست کرابیٚ بوبە طَیر لە کویٚ؟

﴿وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾﴾ لاشك جەنابي رسالەت پەناهو یاراني حەزیان ئەکرد ئەوانە مُسُلمان ببن، بِناءً عَلَیە ئارەزویان ئەکرد پەروەردگاري عالەم مُقتَرَحي وان بەجیٚ بێنیٚ، ونَوعاً ما وثوقیان ئەکرد، سوێندەکەیان بەدرۆ نەبووە، أمّا ئەو ایاتي ئەوان طَلَبي ئەکەن خواناپان نێریٚ،

ئەو ئەزانێ ئەوان ایمان ناهێنن، ئێوە نازانن مفتاحي ئەو (غَیبە)تان لانیە. ئەنجا خوا پێ یان ئەڵێ: (ئێوە چۆن ئەزانن اياتي مقترحە ئەگەرێ ئەوانە ایمان ناهێنن؟ دیارە ئەو علمە بۆ ئێوە نیە، بۆیە وا گومان ئەبەن، ئەگەر اياتی مطلوبەیان بۆبێت، ایمان دەینن). سُبحان الله لە دقَّەتی قُرآن لە بادئُ النَظر دێتە فکر ئەبایە بفەرموێ (یؤْمنونَ) بەبێ (لا)ی نافیە، أنە جنابی حەق نوعە مَعْذەرەتێ بۆ ئارەزووي مسلّمانان بەیان ئەفەرموێ، ئەوي بلێ (لا) زائدە، قسەیێ زائدو بێ مَعنا ئەکات. ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَـٰرَهُمْ﴾ خوا ئەفەرموێ ئێمە دڵ و چاویان وەرئەگێرین بالفَرض اياتي مُقترحەیان بۆبێ، رووي لێ وەرئەگێرن، نەبە حِس نەبە عَقل، تەماشای ناکەن تێی نافکرن. ﴿كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ کو لەأوّلي ایمانیان بە پێغەمبەر نەهینایە، بَعْدَ مَجَیءِ الآیاتیش، ایماني پێ ناهێنن، کەوابێ بۆ اياتیان بۆبێ بێ هودە؟ ﴿وَنَذَرُهُمْ﴾ لێیان ئەگەرێین ﴿فِى طُغْيَـٰنِهِمْ﴾ تجاوەزیان لەحَدّي عَداوەت وانکار وکفر ﴿يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾﴾ کوري دڵ کە دڵ کۆر بوو چاو چ ئەبینێ؟ زیاد لە دیتني حَیواناتي، چیتر نابینێ. کەوابێ عَراقەت ورسوخیان رەگ داکوتان و رووچونیان لە کُفر مانِعە لە ایمان، نظر بەإمکاني اِستعدادي قابِلي زەوال نیە[١].

[١] – جزءي سابع تەواو بوو پاش نیوەڕۆي دووشەمو ٢٧ی مُحَرّم ١٣٥٥ هجری، مُطابِقي ٧ نیساني رۆمی ٢٠ نیساني افرنجی ١٩٣٦ میلادي.

﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ﴾ کەیەکێکە لە مُقترحاتیان. ﴿وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ ئەیان وت باوکە مردووەکانمان بێنن قسەمان لەگەڵ بکەن، ملائکە شاهدي بدەن لەسەر رِسالەتي تۆ، بە أموات زیندي بوونەوە إثباتي حَشري أجساد بکەي ﴿وَحَشَرْنَا﴾ جَمع وسَوق بکەین ﴿عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ﴾ لە أدلاە ﴿قُبُلًا﴾ رووبەڕوویان بێن مُعایَنەیان بکەن، یا قَبیلە قَبیلە جَماعەت جَماعەت شهادەت بدەن دلاٰلەت بکەن لەسەر رِسالەتی تۆ ﴿مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟﴾ بِالفِعل ایمان ناهێنن. نَظَر بە إمکاني استِعدادي بویتە مُحال عَداوەتیان لەگەڵ حەق بەدەرجەیەك گەیشتوە بویتە کَیفیَّت ومَلَکەیٚ راسِخە، بەهەمو مَلائِکەت زائِل نابیٚ ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ کە ئەو بە قووەی قاهِرەي خۆي ئەو عَداوت وبغضایە لە دلّیان بشواتەوە، ایمان بۆ ئەوانە حَقیقَةً لە دائِرەی اِمکاني زاتي دەرنەچووە، أمَّا مَقام مَقامي اِمکاني اِستِعدادیە، مؤْمِن ئەبیٚ ایمان بە نَظَرو دەلیل پەیا بکات، ئەگەر ببێتە اِلجاو اِضطرار، لە حَقیقەتی ایمان ئەشۆرێ، بَدیهیات تکلیفي پیٚ ناکریٚ وەك مُمتَنِعي زاتي. ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾﴾ لەوانەي کە ئارەزو ئەکەن ئایاتیان بۆبیٚ، نازانن کە قابلیّەت لەواندا نەماوە، نەك بە نَظَر أزَلْ، بە نَظَر حالي حاضریان، چونکي انسان لە أوَّلي فِطرەتەوە قابلیەتي هەیە بۆ گەلیٚ شت وەك (هَیولا) کە قابِلە بۆ صوەري عَدیدە، دوایٚ نَظَر بە تَربیەي بیئە وأحوالاتي مُحیط ومُحیطة، هەر کەس صورەتیٚ وەرئەگریٚ. ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا﴾ دیارە ئەو عِنادو جحودەیان لەبەر عَداوەتە —نعوذ بالله— عَداوەت مُصیبەتیٚ عَظیمە.

ئەو حالە تەنها بۆ تۆ نیە، هەمو پێغەمبەران، بەڵکو هەمو مُصْلِح لە کلّي زەمان، دوشمنیان هەیە، سەکتە لە کاروباریان ئەدەن. ﴿شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ﴾ ئەوانەي کە بە قووەت وقُدرەت وصَلابەت ونفوذن، مَردە وعَفاریت

وسیاسیّ ومَکّاد وحیّالن، حَقّاً شیاطینی اِنسان گەلیّ خراپترن لە شَیاطینی أجِنةً. ئەدي ئەو شَیاطینَي ماردانە غَدّارانە نەبون چەند سالٓ بوونە کێوی ئەلوەند سَدّي ئاسن وپۆلا، بۆ صَدّي دیني إسلام؟ بیّ شُبهە ئەوانە نەبانە، لە زەماني رسالەت دینی اِسلام لە عراق وسوریە بەلکو لە أقطاري أیران رۆم إنتشاري ئەکرد، وەدینی اسلام چاکتر دادەمەزرا بەهەزار بەلکو بەچەند هەزار سالێ دي نەدەگەیشتە بیّ هێزي ئەمڕۆ.

﴿يُوحِي بَعْضُهُمْ﴾ لەو أعدایانە بە سرعەت اِشارە ئەکەن ﴿إِلَىٰ بَعْضٍ﴾ ئەوان بۆ ئەمان ئەمان بۆ ئەوان.

ج بە وَحي ئەنێرن بۆ یەك ﴿زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا﴾ قسەي رووکەش کە عَوامي پێی هەڵخەڵەتیّ. زاتاً سَوادي أعظَم لە بَشَري عامي زەلیلي دەستي شێخ ومالم وقەشانن حَتّی ئەمڕۆش چەندي واهەن لە ئەورووپا لە ئەمریکا بە قسەي بیّ أصل وأساس بُغض وعَداوەتي دیني اِسلام وصاحبي دین ئەهاوێنە دلٓی عَوام، بەو نَوعە هەلّیان ئەخەلّەتێنن کە لە هەموو ئارەزوي أهَمتر لایان، مەحوي دیني اِسلامە.

﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ﴾ وەك پێشدان بەیان کرا، مُمکِنە نەیان کردبا، ئەو أسبابي موجِبە نەبایە، إمّا ئەبوە نَظمیّ دی. ﴿فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾﴾ ئەمڕۆ رۆژي بیّ دەسەلاتیە، رۆژیّ دیّ لە بُرهاني قاطِعي سَیف، پرووزاتیان دەر ئەکەویّ زوبانی اِفترایان ئەبڕیّ.

﴿وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ﴾ زُخرُفِي قولیان ﴿أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ﴾ بەدلٓ گوێی لیّ راگرن کەسیّ تەماشاي أحوالي فاسِقان بکا – فِي يَومِنا هذا– ئەزانیّ اِنکاري حَشریان صِرف بۆ صَفاي گوناهە.

ئەوانەي ایمانیان هەبیّ بە قیامەت، گوناهیان لا تالٓە بیّ صَفایە، کەیادي قیامەت بکەن لەزەتیان ئەبیّ بە أَلَمْ.

أما كە ئەو ایمانە نـەما، گوناهیـان لا عَسَـلي بـی خلـط وخۆشـی گـوارە بـیٚ شائبەی ألَم وآكدارە. ﴿وَلِيَرۡضَوۡهُ﴾ پیی راضي بەدڵ قبـوڵی كـەن﴿وَلِيَقۡتَرِفُواْ مَا هُم مُّقۡتَرِفُونَ ١١٣﴾ بابیكەن ئەوي ئەیكەن، بیٚ دەغدەغەو خَیـالي نـاخۆش، عاقبەتي خۆیان لیٚ مَعلوم ئەبیٚ وەقتاكي خِصام وجِدال درێژەی دایٚ، كەسیان بۆ كەسیان نەیان سـەلماند، بـۆ برانـەوەي ئـەم مُنـاظرە حكَمـي لازمـە طَـرَفين داینیٚن وە بە قسەی راضي بن، ئەو حكَمە یا لە (أحباري) یَهود یا لـە (قِیّسـي) نَصارا بیٚ، نَقل كراوە قائلیٚ ئەڵیٚ: (مُشركاني قُـریش وایـان اِقـتراح كـرد). خـوا ئەفـەرمویٚ (قُـلْ) یـا محمـد (ﷺ) ﴿أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡتَغِي حَكَمٗا﴾ كـیٚ طَلَـب كـەم غَیري خواي تَعالي بە حكَمْ فَصل لە بیني ئێمە بكات؟ كیٚ هەیە عَـدلاً بـیٚ؟ بـیٚ مَیل ومُحاباة، صاف دڵ بیٚ تَأثُر لە دۆستي ودوشمـني، ببێتـە حـاكم وفاصِـل؟ لاشَك ئەوەي نسبەتي بۆ هەمو كەس – عَلى السَّواء– بیٚ هەرخوایـە كـە – رَبُّ العـالمين–ە. ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ قُرآنـي كَـريم. ﴿مُفَصَّلٗاۚ﴾ مُبَیَّن وئاشكراو واضِح دلأئل وحَجمي مَفهوم ومَعقول بە عبارەتیٚ خۆشگوار بـیٚ تَعقیدو غَرابەت، ئایا ایەت لەوە چاكتر ئەبیٚ؟ نَـوادِر وشَـوادو خَـوارِق چ كـەڵكی ئێوە ئەگریٚ؟ تەماشای جَنّاتي خورماو هەنارو تریٚ وسائري اياتي قُرآني كـەن، مادّي ومَعنوي، اِستفادەي لیٚ ئەكەن، وەك (سعدی) ئەڵیٚ:

(أدیمي زَمین سُفْرَیٚ عامي أوست
بَرانِ خوان بِفَرما چ دوشمن چ دوست)

لە هـەزار مائـدەي (عیسـی) أنفـع تـرە. كەسـیٚ بـە دِقَـت وذەوق تەماشـای هێشوە تریٚ بكا لە دَقایقِي صُنع وتـركیبي بفكـریٚ، هـەم بـە ذەوق لـەزەت لـە تامي ئەبینیٚ، هەم بە عَقل لەزەتیٚ – فَوْقَ تِلْكَ اللذَّة–ي ئەچێژیٚ، وەك شـێخی عەرەبي ئەفەرمویٚ: (بۆ اِنساني بە وِجدان، كُلّي لـەزەتی حِسـیّ لـەزەتیٚ عَقلـي روحي تیایە).

ئەو اياتي (كَونيّە) كە لە قُرآن دايە هەريەكێ سەروچاوەيە بۆ عِلمي عَظيم ونافِع بۆ بَشَر – إلى يَوْمَ القِيامَة – موجبي تەرەقي انسانە لە مَدارِج ومَعارجي كمالات تا ئەيكاتە مُختَرِعێ وەك (أديسون) و أشباهي وي، خارِقەێ هات و چو، چبو؟ پاش دەمێك ئەبێتە حِكايەت. ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ لە يَهود ونصارى ﴿يَعۡلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٞ مِّن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ﴾ لەقەلبدا بێ شكن، أمَّا ئەگەر بيان كەن بە حَكَمْ، بۆ مُشرِكان ئەڵێن. عَداوەتي وان لە حەق تۆ بە قوەت ترە لە عَداوەتی قُرَيش.

سُبحانَ الله پاش چەند قَرن لە عُلماي نَصارى بَعضێ بە نەناردني اياتي مُقتَرحيُ مُشرِكين دەليل دێنن لەسەر كِذبي حَضرتي رَسولي أعظَم ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ١١٤﴾ شك واشتباهت نەبي لەو قسە. وە لە حقيقەت دا جێی اشتباهە بەڵكو جێی اِنكارە. أهلي كتاب دەربارەي مُشركين بڵێن ئێوە (أهْدى) ترن لە (داعي، اِلى الله الواحِدِ الأحَد).

﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ﴾ فەرمودەي خواى تۆ دەربارەي ئەو مُنكرانە لە جِهەت صِدق وعَدلاً تەواوبوو آياتيشيان بۆ بێ ايمان ناهێنن، ئەوەي خوا بيفەرموێ راستە، شائبەی درۆ لە قسەي ئەودا نيە، بەرەڵلاكردني ئەوانە، لە كُفر وضَلال، عَيني عَدالَتە. شَريعەتي تَكليفي وەك شَريعەتی تَكوينيە، عَدالەتي وەك عدالەتي طَبيعيە، زاتاً واضعي هەردوو شَريعەت، يەكە. موادي عنصري بعضێ لەگەڵ بعضێ زۆر بە ئولفەتن، بعضێ لەگەڵ بعضێ زۆر بە نەفرەتن تێكەڵاو نابن، وە دەرەجاتي ئولفەت ونەفرەت زۆرە، مَعرِفَةُ الله وسائِري أحكامي شَرعيش وايە، هەرچەند أساسي فِطرەت يەكە، أما حُكم حُكمي طبيعە تی ثانيە، أثري فِطرەتی پاك، ناهێڵێ، فاسِدي فِطرەت بە فَساد ئەدا، بە قاعِدەی عدالەتي طَبعي وطِبّي كە هەر مادّەيە بۆ عضوي مُناسبي خۆي ئەچێ، مَلَكات ئاثاري خۆي لێ تَرَتُّب ئەكات، كُفرو ضَلال كە بووە مَلَكە

ئەوەي لايەقي بێ لێی بەدەر ئەكەوێ، ئەوەي ماهر ئەبێ لە ألعاب لَعْبي وا إختراع ئەكا، مُدهِش بێ، وەهەگذا سائري مَلَكات وكَيْفياتي راسِخە.

أمّا (عَدلاً) به مَعنا مُساوات نابێ، هەموو کەس مەلا بێ یا دەوڵەمەند بێ گوزەراني دونيا چۆن ئەبێ؟ تفسيري (كَلمَة) به قُرآن ئەگەر چی لە (قَتادە) نقل كراوە وەلغەتیش موافَقەی ئەکا أما –من حيث المَعنى –(سَيِّد رشيد) ئەفەرموێ غَيره ظاهِره. وەتَفسيرى (سَيِّد رشيد) (كَلِمَه) بە وَعدي إلاهي بە نَصرەت داني پێغەمبەر وەخَذلان وهِلاكي أعداي صاحِب رسالەت (ﷺ) لاي حقير – من حيثُ المَقام– خۆش نيه. ﴿لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ﴾ هەرچی بێ. كە قَراري قَطعي دا، ناگۆڕێ. كێ هەیە بیگۆڕێ؟ بَدلأي دانێ؟ خُلفي وعَید وەك خُلفي وَعد بۆ خوا مُحاله، قياسي كبريائي لە عَبد ناكرێ. چەند ساڵ لەمەو پێش به خدمەت (شێخ عَلي افندي طالبَاني) گەیشتم لە (كركوك) رۆژي عَرضم كرد: جەنابتان لە مَسألَةي (خُلفي في الوَعيد) چی ئەفەرمون؟ شێخی عەرەبي لە (فصوص) زۆر قوەتي ئەداتێ کە ئەو (خُلفه) جائزي على الله يە. فەرموي: سبحان الله کەسێ دەعواي عبوديەت وإخلاص وأدَب بكا لە خدمەت خوا مَسألەیێ عِنواني (خُلفْ) بێ چۆن نسبەتي بۆ خوا ئەدا؟

أما تَخصيص وتَقييد ونَسخ ئەوانيش لە كَلِماتي خۆيەتی. – مَعَ أنَّهُ– ممكنه بلێین (مُتكَلِّم) داخلي كَلامي خۆي نيه.

في الحقيقة دێته ذِهن، کەسێ بلێ کێ ئەتوانێ حكمی من بگۆڕێ؟ –غَيري خۆي پێ مُراده– لاشَك تبدلاتي حكمي شَرعي تابعي تبدلاتی ظروف وأحوالي (كَونيه)، ضَعيف كه قَوي بوو أحكامي زەماني ضَعيفي طبعاً ئەگۆڕێ.

شَریعەتی تَكليفي مادام إلاهی بێ، ئەبێ بگۆڕێ بەگوێرەی شریعەتی طبيعي. شرعێ مُخالِفي طَبع بێ شَرعي إلاهي نيه سەرناگرێ ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ﴾ حتّا بەو كَلِماتەی کە لە دڵدا إنسان ئەیکا ﴿ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾﴾ بەهەموشت. ئەو

ئەزانێ کێ ایمان دێنێ کێ ایمان نـایێنێ، ئـەو تَجَـلاّیِ علمـي ئـەو ئـەیکا، علمـي کەس نایکا، مُمکِن نیـە أَحَدي علمـي وەك علمـي خـوا بـێ یـا صـاحِبي نَفسـي قُدْسـیّە بـێ. ﴿وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ لـە روأسـاي أدیـان ومَـذاهِبْ، قبولّیان کەي بە حَکَمْ، بە قسەیان راضي بي. ﴿يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ ئەگەر ممکن یان ببێ. کەوابێ چۆن شاهِدي بۆ صِدقي تۆ ئەدەن؟ با مُحَقَّقیان بێ کـە تۆ رَسولي بە حەقي ئەو ایاتی بۆ تۆ دێ، وەحيِ الاهیە. عِناد وعَداوەتي وان بۆ تۆ، لە خزمەکانت کەمتر نیە. أما بعضێ هـەن دلّیـان صـافە لـە دیـني خۆیـان نەگۆڕاون بێ تَعَصُّبْ، ئەوانە بێ تَوَقُّف اِطاعەی تۆ دەکـەن ایمانـت پـێ دێنن. ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ﴾ سَـوادي أعظَـم لـەوان هـەر دواي ظَـنّ وگومـان ئەکـەون ﴿وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ١١٦﴾ (خَرص) بە معنا (تَخمینە) وە تَفسیریان کردیە بە (كِذب). ئەوانە بە مُجَرَّدي (ظَن) جَزْم ئەکەن، لاشك ئەمـەش موافـق نیـە، ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ بێ بێ نافەرموێ (بِمَنْ) وەك لە ﴿وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١١٧﴾ (ب)ي اِظهـار ئـەکا. لێـرە اِضـطرابیان زۆرە. لـە هـەموي خۆشتر تَقدیري (ب)یە. ئەمەش نُکتەی ئەوەیە إشارە ئەکات کە علمي جەنابـي حەق بەوانەي کە لە رێی خوا گوم ئـەبن، لێـی لائـەدەن، رووي تـێ ناکـەن، بـە زەواتي وان تَعَلُّقي بەستیە بێ حاجەت بە رابِطي (ب). لە فَقَرەی دووەم (ب)ي ئەفەرموێ، چونکی اِعتِنا بە شَأْني أهلي ضَلال، لێرە زیاترە، بـەلّکو جُملـەی ثاني ئەگەر ذِکریش نەکرابا، خَلَل بە مَقصود نەدەگەیشت، أمّا بـۆ بَیـانی حـەق وحَقیقـەت، ذِکـري فـەرموو. ﴿فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ﴾ ئەوانـە چـونکـي مُشرِکن ایمانیان بە خوا هەیە ئەبایە زەبیحەی کە بۆ خوا بـێ، وە تـەنها نـاوي وي لەسەر بهێندرێ، وە بەناوي دي نەبێ، بیخۆن، ئەگەر لەبەر عَداوەت نـەبێ بۆ نـایخۆن؟ کـەوابێ عَداوەت کـە گەیشتە ئـەو دەرەجەیـە، نَفرەت وا مَحکَمْ

ئەبیّ، هەزار آیاتي مَطلوبەیان بۆ بیّ، ایمان بە پێغەمبەر ناهێنن. ﴿إِن كُنتُم بِـَٔايَـٰتِهِۦ﴾ واردە یامُقتَرحە ﴿مُؤْمِنِينَ ١١٨﴾ ئەڵێن ئەگەر آیاتمان بۆ بیّ إیمان بە (محمد) دێنین. خۆ ئێوە ایمانتان بە خوا هەیە دیارە ئێوە سَبَبْ بە نَفرەت لە حَضرەتي (محمد)ي وا دوور کەوتونەوە لە خوداوە مەیل ومُحِەبتی (آصنام) بە نَوعیّ لە دلّتان جێگیر بووە حَتّا زەبیحەیّ تەنها ناوي خواي لەسەر بیّ، نایخۆن، کَأنَّهُ بالکُلّیّە ایمانتان بە خوا نەماوە ﴿وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ﴾ – وَحْدَهُ – عوند و بەهانەتان چی یە؟ هەر ئەوەندەیە حَضرتی محمد وأتباعي ئەوي ناوي الاهي ئێوەي لەسەر نابەن، بۆیە نایخۆن، لەبەر ئەوە خۆتان لە خواي مُحَمدّي ئەکەن. ﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ﴾ رَسولێکی ناردوە ئەوەي پاك بیّ بۆتان حَلال ئەکا، ئەوەي پیس بیّ لێتان حەرام ئەکا بە وَجهیّ مَعقول ومَطبوع ومُعَلّل ومُدلأَلْ. لە جُملەي ئەوانە مردارە بە هیچ حالّ و وەقتیّ بۆتان نیە بیخۆن. ﴿إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ﴾ ئەوانەي مَجبور بون بۆ سَدّي رَمَق رُخصەتتان ئەدا بۆتان حَلال ئەکا. ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا﴾ لە أئِمەی کُفر ﴿لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم﴾ خەلکي گومراه ئەکەن بەگوێرەي هەوەسي خۆیان ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ ئەوەي ئەیلّێن کە تَحلیل وتَحریم نِسبەتی لەگەلّ عِلم نیە، صِرف هەوایّ جاهِلانەیە، نە لە عَقل نە لە طَبع نە لە وَحي، لە هیچیان وەرنەگیرایە ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ١١٩﴾ مُتجاوِز لە حَدّي خۆیان، یا لە حەق بۆ باطِلْ ئەوانەي ئەلّێن عَقل حاکمە لایان شَرطە عَقل مغلوبی هەواو هەوەس نەبیّ.

﴿وَذَرُواْ ظَـٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ﴾ ئاشکراو بزر، بەدەني وقەلبي ئەمە خۆیەتی. باسي خواردني حَیوان ئەگەر لە طَرَف (وثَني) یان رەنگی دیني وەرنەگرتبایە، باسي لیّ نەدەکرا.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡسِبُونَ ٱلۡإِثۡمَ﴾ هـــەر كەســـێكی بـــێ ﴿سَيُجۡزَوۡنَ بِمَا كَانُواْ يَقۡتَرِفُونَ ١٢٠﴾ بەو كە سبەي ئەيكەن. ﴿وَلَا تَأۡكُلُواْ﴾ هەموتان، یاخود ئـەي مُسلّمانینە.

﴿مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ﴾ بەتەنێ. ج تەنها ناوي أصنامي لەسەر هاتبێ یـا پێكرا. زاتاً ئەوەي بۆ غـیري خـوا بكوژرێتـەوە، نـاوي خواشـي لەسـەر بـێ بـێ فائدەیە. ﴿وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞ﴾ مَذبوحي لِغیرِ الله، فِقە، خروجە لە ایماني راستي، لێ خواردني حەرامە، لە عَلائمي شِركە.

كەسێ لـە مَقـام تەماشـا كـا بـە مَقـام ئـەزانێ مَقصـد مُطْلَـقْ الذَّبيحـة نيـە. مسلّمانێ بۆ خواردن وفرۆشتن حیوانێ سەربڕێ با ناوي خـواي لەسـەر نـەێنێ، حەرام نیە، زێرا مَحَل مَحَلّێ قُربَتْ نیە دەخلي چیە بەناو هێنان وناو نەهێنان؟

عُلماي اجتهاد خِلافیان زۆرە. امامي (أبو حنیفە) فەرق ئەكا لە بەیني مَتروك التسمیة — عمداً یاسَهواً— أوَّل حەرامە ثاني حـەرام نیـە. ئـەوەي ئێمـە ووتمـان مُختاري إمامي (شافعیە). عَـلامـەي (تَفتـازاني)و (سَـیِّد رشـید) زۆریـان تحقیـق فەرموو چاكیان بەدەرخستیە. بَعضێ (حَنَفـي) ادِّعـا ئەكـەن، شـافعي خَرقـي اِجماعي كردووە، ئەو غَلَطە، شافعي وغَیري شـافِعي لـە أئِمَّـەی أهلـي (سُـنَّة) خَرقي اِجماع ناكەن، وەبعضێ هَذَیان ئەكەن ئەڵێن: (شافعي لە چەند جێي تـر مُخالَفەی آیاتی قُرآنی كردیە) بەڵێ ئەو هَذَیانە لـە حـەق أئِمـەی تـریش كـراوە، لكِن ئەوانە مُخالَفەی آیەت ناكەن بەهەواو هـەوەس بـەڵكو بـە دەلیـل، ئەمـەش مُخالَفـە نیـە. لێـرە (شـافعي) ئەفـەرموێ: (حَقیقـةً ظـاهِري آیـەت عامَّـە، أمّـا تَّخصیص ئەكرێ بە ئەوانەي دوایێ، یەكیان ئەو جملەیەیە، وەهەم بە آیەتی — قُلْ لا أجِدُ— وي آتي كە تَفسیري — اِنَّـهُ لَفِسـق— ي ئێـرەي پـێ ئـەكرێ، وەبـە آخری آیەتي ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ﴾ اِئمَّەی كُفرو ضَلال لـە اِنسـانان ﴿لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ

﴿أَوْلِيَآئِهِمْ﴾ اَتباعیان مُطیعی أمریان ﴿لِيُجَٰدِلُوكُمْ﴾ ئـەو جهَلـەی قـومی ئێـوه مُجادەلەی لەگەڵ ئێوه بکەن. ﴿وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾﴾ لاشك کەسێ متروك التَّسميه بخوا یا ذبیحەی کافر، نابێ بە مُشرِك أمَّا آکل له (ما ذُبِحَ عَلى النُّصُب) له عَلائمی شِرکه، شەرع حُکم بـه شـرکی ئەوکەسـە ئـەکا، خـۆ ئەگـەر تەماشای تَحقیقی سابِق بکەی له نسجی (فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللّهِ علیه) ئەزانـی ظاهرو باطِن، حەق قَولی شـافعیه. ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا﴾ بـێ ئاگـابێ ﴿فَأَحْيَيْنَٰهُ﴾ حَیـاتـێ عِلمـی ﴿وَجَعَلْنَا لَهُۥ﴾ بـۆ ئەوکەسـە ﴿نُورًا﴾ گـەوره ﴿يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ﴾ بەو نوره ئەڕوا له بـینی خـەڵك ڕێ دەر ئـەکا ڕێ نیشـان ئـەدا ﴿كَمَن مَّثَلُهُۥ﴾ صِفەتی وابێ ﴿فِى ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ لـە أنـواعی تـاریکی دا بـێ ﴿لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾ لەو ظُلُماته حاشا وەك یەك نین. کەسێ بە نـوری ایمـان وعلـم و عرفـان بەڕێدا بڕوا وەلَوْ کوڕه گاوان بێ بەهـەزار دەرەجـه لـه فَـوقی کەسێکه لـه نـاو ظُلُماتی کُفر وجَهل وبێ شعوری دا بمێنێ وَلَوْ شاهَنشاه بێ. بعضێ ئـەڵێن ئـەو ایەته له حەق عمری فاروق وأبی جَهل نازِل بوه.

(إبنُ عَبَّاس) ئەڵێ: (له حەق حَمزەو أبی جهل بنی مُشامه). (عَکْرَمه) ئەڵێ: (لـه حـەق عَمّـار وأبـی جَهلـه). ئەمانـه بـا مِصـداق بـن، أمَّـا لفظـه کـه عامَّـه، وەئایاتیش ئەوەنده پێکەوه نوساین ڕێـی سَـبَبی نـزول نیـه. ﴿كَذَٰلِكَ﴾ بـەو نَوعه ﴿زُيِّنَ﴾ له طَرَفْ کێ؟ (سَیِّدی آلوسـی) ئەفـەرموێ: (لـه طَـرَفْ خـوا مِـنْ حَیْثُ الخَلق، یاخود له طَرَفْ شیطان مِنْ حَیثُ الوَسْوَسة).

من ئەڵێم: ممکنه مَقصَد ئەو شَیاطینەی أئِمەی کُفر بێ که وَحـی بـۆ أولیـای خۆیان ئەنێرن، أعمالی قَبیحیـان بـۆ زینـەت ئـەدەن). ﴿لِلْكَٰفِرِينَ﴾ اَتباعیـان ﴿مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾﴾ لـه قَبـایح. ئەگـەر لەبەر ئـەو ڕوو کەشـیه نەبایـه،

كەس پێی هەلْ نەدەخەڵەتا، وەكەسێ بە أدنی نَظَر تەماشاكا، قەڵپی بۆ مَعلوم ئەبێ. ﴿وَكَذَٰلِكَ﴾ هەروەكو تَزين دراوە بۆ أهلي مَكّە أعمالي ناشيرينيان.

﴿جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ﴾ لە (نوح) تازەمانی تۆ ﴿أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا﴾ رواساي گوناه كاري ئەو دێ یانە ﴿لِيَمْكُرُوا فِيهَا﴾ بەحيلەو فێر شتي ناشيرينيان لا جوان بكەن. ئەو حاڵە هەر بۆ تۆ نيە، ياخود هەر وەك لە مَكّە رواساي مگذاي مان دانايە فێل بكەن لە خەڵكي لە سائِري شارودێي تريشمان دانايە، عَلى كُلِّ حال دڵدانەوەيە بۆ حضرتي رەسول. ﴿وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ﴾ عاقبەتي خراپەيان بۆ خۆيانە، بەينێ اِستفادە لە مَكر وحيلە ئەكەن، دوایێ تێ ئەچن.

﴿وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾﴾ نازانن كە مَكر لە خۆيان ئەكەن. في الحقيقة ئەو نَوعە سياسيانە لە هەمو شرفي بَشَري مَحروم ئەبن راستي وعَهدو أمانَت وناموس وغيرەت وعِزَّەتي نَفس و وەفا دۆستي لايان نامێنێ ئەوەی بَشَر بێ ئەوەندە جَزايەی بەسە. ﴿وَإِذَا جَاءَتْهُمْ آيَةٌ﴾ هەرچي بە واسطەی رەسول بێ. ﴿قَالُوا لَن نُّؤْمِنَ﴾ بە واسِطەی ئەو ايەتە. ﴿حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ﴾ ئەمە شِعارو پيشەي ئەو مُجرِمانەيە، حَتّى بَعضە جوو ئەيان ووت كو خوا قسە لەگەڵ موسى ئەكا، ئەبێ قسەش لەگەڵ ئێمە بكا. وەمِثلي أبي جَهل لە قَومي حاضر وەكي أمثالي لە أسلافي كُفرو جَهل ئەڵێن وئەيان گوت: (ئەبێ رەسولێكيش لە ئێمە بێ، خوا وەحي بۆ بنێرێ) وەبەڵكو لاي قەومي رەسولي أكرَم لە جەنابي رِسالەت پەنا بۆ رِسالەت، لايەق تر هەيە.

﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾ كێ تَحمُّلي ئەو مَشاقّە ئەكا؟ بە صبر وثبات بە سعێ بێ فتور وَظيفە بەجێ دێنێ؟ دڵ صاف بێ، بێ مَيلي حُبّي

رئاسەت طمعي مال وجاه وسلطنه تو كبريائي؟ خوا ئەيزانێ. رسالەت في الحقيقة مُكتَسَب نيه، مَوهبەێ إلاميه، أمَّا ئەو ئەزانێ كێ پێی لايەقە.

نەك رُسُلي عظام ئەبێ رجالي مَشهور لە عالەم بن، وەك لە أوائلي فطرەتيان إمتيازيان بووە لە خەلك. باوڕ مەكە بە هەموو گەوران، بەهەزاران وەك شاعرێ زوڕنا ئەنگێوێ كراينە قُطبي عالم ومُدَبِّري أرض وئاسمان. يادزێ رێ گرێ تۆبەي كرديە، بويتە وَلي وصاحِبي كَشف وكَرامەت.

﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ﴾ فَساد كەر. خاصَّةً ئەو مُتَكَبِّرانە كە دەعواي هەم شأني ئەكەن لەگەل صاحِبي رِسالەت، وەلە خۆيانى كەمتر ئەزانن ﴿صَغَارٌ﴾ ذِلَّەت وهَوان وبێ قەدري ﴿عِندَ ٱللَّهِ﴾ لاي خوا پاداشى كِبرو نخوتيان رەزالەتە.

﴿وَعَذَابٞ شَدِيدُۢ﴾ بە نسبەت قووەتي كُفرو فَساديان ﴿بِمَا كَانُواْ يَمۡكُرُونَ ١٢٤﴾ سَبَب بە حيلەو تَزيني مُزَخرەفيان ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ﴾ تَفريعە لە اياتى سابِقە وەمُشعِر بە عَلامەتى فارِقە لە بەيني ئەوانەي ايمان دێنن زوو يا درەنگ وەبەيني ئەوانەي ايمان نايەنن تا ئەمرن زياتر اِصرار وتَعنُّد ئەكەن لەسەر كفرو فَساد وإفساد.

شَرح وايضاحي ئەو ايەتە قيمەت دارە، اِطِّلاعي پێ ئەوێ بە أحوالي روحيَّەی أقوام تأثيري تَربيە ورەوشت و عَنعَناتي قَوم لە شخصێ تازە پێ گەيشتيى. كەسێ خوا ارادەكا رێی نشان بدا بەرێی نَجاتا ﴿يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ﴾ غَيري اِسلام، يا اِدياني مُحَرَّفەيە، يا آداب رەوشتي مُزَخرَفەيە، نەك تەنها دين، كُلِّي مُجَدَّدێ وايە. ئەوانەي مَيلي ئايين و رەوشتي قَوم لە دلّيان رسوخي بەستبێ لەگەل گۆشت ورەگ و مێشكيان تێكەلاو بووبێ، أبَداً دەست

لەو ادابە کۆنە هەڵناگرن، دەربارەي أصول و شێوەي جَدید أصلاً دڵیان نەرم نابێ.

غَیري ئەوانە بَعضێ زوو دەست هەڵئەگرن محاسِني ئەو أمرە نوێ یەیان زوو بۆ ئاشکرا ئەبێ دڵیان ئەکەشێتەوە بۆی واسع ئەبێ، تیای جێ گیر ئەبێ – بَعضێ نەختێ بە اِعادەي فِکر ونَظَر وتَأمُّلْ لە شیریني و ناشیریني قَدیم وجدید–.

بَعضي بە مُزاوەلەیێ زۆرو مُحاکمەێ دوورو درێژ قبوڵی جَدید ئەکا. ئەوانەي سینگیان والآ بووە بۆ اسلام ئەزانن ئەم شَرحە چۆنە، ئەو نَفرەت وبُغْضي لە حەق اِسلام وصاحبي کەبووە، کو زائِل بووە؟

مەیل ومُحِبَّەتی ئەو دین وصاحِبي ئەو دینە کو کەوتیتە قَلبیان؟ أربابي تَعلیم بۆ تَفهیم وتَربیەي منداڵان قواعدێ زۆر جوانیان داناوە، منداڵي غَبي چۆنی تێ بگەینی؟ زەکي چۆن دەرس ئەدرێ؟ بێ مەیل کو مەیلی لەدڵدا پەیدا ئەکرێ؟ کەم مەیل کو تَقویە ئەکرێ؟ ئەوەي زێدە مەیلي لەگەڵ علمێ یا فَنّێ بێ کو ئەگێڕدرێ بە مُتَخَصِّص لەو علمە یا لەو فَنَّە؟ ئەوي بالمَرة قابلیەتي علمي نەبێ چي پێ ئەکەن؟ چۆنی إستخدام ئەکەن؟...

﴿وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ﴾ گومراهي بکا أبَداً نەیەتە سەر رێی راست. ﴿يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا﴾ تەنگ ﴿حَرَجًا﴾ زۆر تەنگ کە ایمان نفوذي تیا ناکا پێوەي ناچێ، وەك بیشەێ پڕ دارو دڕك وچیلکەو چڵ، کەسێ ناتوانێ پێی دابڕوا. لاشَك تا لە دائِرەي اِمکاني إستعدادي دابێ خوای تَعالان نوري ایمانیان بە طَریقي نَظَر هەر نَوعە نظرێ بێ ئەهاوێتە دڵیان. ئەوانەي أهلي کِبرو عِنادن تَصَلُّبْ ئەکەن لەسەر کُفر، خواي تعالانیش بەو نسبەتە معاملەیان لەگەڵ ئەکا، زێدە غَریق ئەبن لە کُفردا، جَبراً ایمانیان تیا خَلق ناکا. ئەوانە بە نَوعێ دەربارەي اسلام وعِلم وعِرفان دڵ تەنگ وهەناسە سوار ئەبن ﴿كَأَنَّمَا

يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ أنَّهُ بۆ ئاسمان هەڵ ئەچێ بە هەشتاو. ئەوەي بەرەو هەوراز بڕوا زۆر ماندي ئەبێ، سینگی وێك دێ دڵی بە سُرعەت لێ ئەدا، هەناسە بڕکێ ئەگاتێ، دفکي ئەدا ﴿كَذَٰلِكَ يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ﴾ پیس، بێزلێوە بووي، قَبیح ناشیرن ﴿عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ١٢٥﴾ بە سَبَب ایات وفِکر وإعتبار وتأمُّل لە حَقایقي کائنات، هەر شتە بە گوێرەي خۆي خوا لَوازِم ومُناسَباتي بۆ پەیدا ئەکا. ئەوانەي تَوَغُّل ئەکەن لە لَعْبُ العالي لَعبي وا اختراع ئەکەن مُدهِش بێ، سِیاسِیّون فِکرو حیلەي وا بەجێ دێنن أعْلَمي عُلَماي کَلام وتَفسیر رێی پێ نابەن، دوشمنیان بە تەپڵی سەرا دادەخەن، ئاگاشیان لەخۆنیە.

وَهَکَذا كُلِّي صنفێ لە أصنافِ بَشَر بە گوێرەی ئیشي خۆي زیادي بۆ دێ. ئەوجا کەسێ بە تأمُل تەماشاي ئەو مَقامە بکا ئەزانێ مَعرەکەی أشاعِرە ومُعْتَزِلە وجبْري وقَدري، مُجَرَّد لە ظاهِري – يُرِيدُ ويَجْعَلْ–يە.

تەماشاي رەوشت وأحوالاتي نفسي أقوام وأشخاصیان نەکردیە، وَبالخاصَّة أشاعِرە ئەنۆڕنە إمکاني زاتي، أما دائِرەي تَشریعي لەناو عالەمي اِستِعدادي دایە وێنەیەکي لەگەڵ عالەمي (كَونْ) هەیە، لەبەر ئەوە لێ یان پەشۆکاوە.

رجا ئەکەم مسڵمانان بە نِزاعي ئەوانە خۆیان لە روحي قُرآنی لە أسراري أکواني مَحروم نەکەن خەریك بن شرحي سینەي خۆیان بکەن بۆ علم ومَعارِف وآداب وأطواري حَسَنە ئەگەر بە رەوشتی أسلاف مُتَأثِر بوین خۆیان نَجات دەن –تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَها ما كَسَبَتْ وَلَكُم ما كَسَبتمْ (الآية)– ﴿وَهَٰذَا﴾ دیني اِسلام ﴿صِرَٰطُ رَبِّكَ﴾ رێی خواي خۆتە ﴿مُسۡتَقِيمٗا﴾ بێ خوارەکەو پێچەکەیە ﴿قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ١٢٦﴾ بە دڵ ذِکر وفِکر لەو عالەمە بکەن، آیاتي قرآني وأکواني تەماشاکەن ئەوانە دڵیان بۆ ایمان وعِلم واسِعە، لەسەر ئەو

وسعەتە أدقّي أشيا باريكترينى أسرار، دَرك ئەكەن. ﴿لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ﴾ جيّگاى احترام وتَحيّة وإكرام وسَلام ﴿عِندَ رَبِّهِمۡۖ﴾ به مُقابلي صِغار وهَوان بۆ أهلي كِبر. ﴿وَهُوَ وَلِيُّهُم﴾ كەورەو ناصر ومُحِب و مُعين وياريدەدەريان هەر خوايە، أصلاً شائبەى شرك لە دلّيان دا نيە.

﴿بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢٧﴾ كە ثَمَرەي ايمانە. قيمەتي ايمان عَملي صالحە، مَقصَد لەو تكاليفە، كردنە. كەچى لاي بَعضيّ مُتَكلِّمين عَمل هيچ نيە، هەرچى هەيە مُجَرَّد فَضلي –سُبحانَ الله العَظيم–ە. وەبعضيّ ئەلّيّن ايمان كافيە، بەلّىّ ئەگەر ايمان ببىّ، كافيە، وە ايماني راستي بىّ اِطاعە نابىّ. ﴿وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا﴾ رۆأساو أعوانيان.

دائِر به أحوالي حاضِريان آياتي يان بۆ دىّت، لكِن لەبەر غرور، إعتباري پىّ ناكەن. ئەمرِۆ دائر به عاقِبەتيان بَعضە آياتي إلاهي بۆيان نازِل ئەبىّ، تا بزانن چيان بەسەر دىّ وەچۆن نَدامەت ئەكەن لەو رۆژە كە خوا هەمويان حَشر ئەكا گريان ئەكاتەوە بۆ حِساب وجَزا پىّ يان ئەلّىّ ﴿يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ﴾ لاي حَقير عِبارەتە لە مَرَدەي شياطينە مُتَكَبِّرَەكانيان كە بە حيلەو دەسيسە خەلّكيان إغوا ئەكرد بۆ تَحقير تَعبير بە (جنۆكە) دراونەوە ﴿قَدِ ٱسۡتَكۡثَرۡتُم مِّنَ ٱلۡإِنسِۖ﴾ زۆرتان گومراە كردن، يازۆرتان لەوان گيّرا بە أتباعي خۆتان.

﴿وَقَالَ أَوۡلِيَآؤُهُم﴾ أنصارەكانيان ﴿مِّنَ ٱلۡإِنسِ﴾ ئەوانەي مُنادان كَأنَّهُ لەبەر دَسائِس ومَلعَنەت وسياسەتي سوءْ، لە زومرەي اِنس حساب ناكرێن، وەهەم لەبەر خۆ گۆرِين وەك گورگ لە لِباسي مەرِ خۆيان لە أتباعيان بزر كرديە، بوينە (أجِنّە) چۆنن، واناىبينرێن.

سائري مُفَسِّرين بە (جنۆكە) يان تَفسير فەرمووە لكِنْ لە بَياني جوابيان كە

ئەڵێن ﴿رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٍ﴾ چی وایان نەفەرمووە خۆش بێ. ئەي خواي ئێمە بعضە کمان لە بعضێ مُنتَفِع بوين بە نفعێ دونيوي، ئێمەش لە رِوأسا، رِوأسايەکانيش لە ئێمە، فائِدەمان ديت، ئەوە ديارە، أمَّا تَمتُّعي (جِن) لە (انس)، (إنس) لە (جِنْ) چی وانيە کەلەو مَقامە عَرضي کبريائي بکەن، بۆيە لە تَفسيري (قَوم) لامان دا.

﴿وَبَلَغۡنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِيٓ أَجَّلۡتَ لَنَاۚ﴾ عُمرێ درێژو خۆش وبە لەزەت لەگەڵ يەك رامان بوارد، ساتەکمان نەکرد، زِللەیێ تَأديبمان نەخوارد کە بگەڕێينەوە ﴿قَالَ﴾ جەنابي حق لە جوابيان دا ﴿ٱلنَّارُ مَثۡوَىٰكُمۡ﴾ مَنزِل وقرارگاهتان ئاگري جهَنَّمە. هەرچی کردتان بۆ رێی جهَنَّمتان کرد، بە ئاياتي قُرانی وأکواني إعتبارتان نەکرد، بە اِقتراحي بێ مَعنا، لە ئاياتی نافِعە خۆتان محروم کرد. ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ﴾ أبَدي لە ئاگردا دەمێنن، مُدَّەیێ غَيرە مُتَناهي ولا يَنقَطِعْ. ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ﴾ إلاّ وقتێ خوا حەز بکا، ئەگەر إرادە بکا اِنتِهاي دەوامتان لە ئاگردا نەيني.

ئايا خوا ئەو مَشيَّتە ئەکا يان نا؟ عُلَماي اِسلام اِضطراب ونِزاعيان زۆرە. سَوادي أعْظَم لايان وايە دەواميان بێ اِنقطاعە، أمَّا ئەوەش هەر بە مَشيَّتي خوايە، خوا حەز بکا خلاصيان ئەکا. (سَيِّد رَشيد) لە جلدي هەشتەم لە لاپەڕەي (٦٨) تا لاپەڕەي (٩٩) تَفصيلاتي مذاهِب ودلأئلی ذکر کرديە، مەيلي (سَيِّدي) مرحوم بە تبعيەتي (إبنُ القَيِّمْ) لەسەر انقطاعە. مُختاري (آلوسي) صاحبي (روحُ المَعاني) دەوامي بێ بڕانەوەيە. بعضێ ئەفەرمون: (ئەو اِستثنايە بۆ زێدە تَعذيبە) إطماعيان ئەکا ونابێ. ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ﴾ بە مُقتَضاي حِکمەت تَکليف لە عِباد ئەکا، کەس بۆ کُفر وايمان مجبور ناکا، هەرکەسە ئەوي لايەقي بێ بۆي جێ بەجێ ئەفەرموێ ﴿عَلِيمٞ ١٢٨﴾ بە هەمووشت. هەمووشت بۆ وي

تَجَلاّ ئەکا ئاشکرا ئەبیّ. علمي ما هُوَ عَلَيهِ فی نَفْسِ الأمري ئەزانیّ ﴿وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًا﴾ إدارەي بَعضە ظالم ئەدەینە بَعضە ظالمِي دیارە هەردوو لا ظالمن.

فِي الحَقيقة ظُلمي رؤساء بە سایەي اَتباعە ئەگەر ئەوان مەیلي ظُلم وفِسق وفجوریان نەبیّ، رؤساء چیان پیّ ناکریّ. ئەو قانونە مُستَمِرە إلى الأبد.

﴿بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿١٢٩﴾﴾ ئەو تَولِيە سَبَب بە ئەوەي ئەیکەن و بەدەست خۆیان ئەخەن. هەردوولا مەیلیان بۆ یەك جِهەتە بۆیە ئەوەي مەیلی فَسادي نەبیّ، خراپیان پیّ هەڵنەخەڵەتیّ، ئەگەر مەیلي چاکەي بە قووەت بیّ، أصْلاً إتّباعیان ناکا، حیلەو دەسیسەو وەسوەسەي وان تأثیري تیّ ناکا. ﴿يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ﴾ لێرە (جِن) بەهەر تَفسیریّ ئەیکەی بیکە، بَأسي نیە، ئەگەر چی لام یەك (نَهج) خۆشترە. ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ﴾ لە خۆتان. دێتە یادتان ئەتان ووت مَلائكەت بێنە یا ئێمەش ببینە پێغەمبەر ئەوجا ایمان بە رَسول دێنین.

﴿يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِي﴾ بەسەرتان دا بخوێنێتەوە ایاتی مـن ﴿وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا﴾ بتان ترسێنن لە پێکەوتني ئەورۆ، رۆژي قیامەت رۆژي حساب وجَزا، ئەگەر بە عَقلَیش نەزاندریّ بە إخباري رَسول بیزانن ﴿قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا﴾ پێغەمبەر هاتن ایاتی یان بە سەردا خوێندینەوە لەورۆیان ترساندین، أمّا گوێمان نەدانیّ ووتمان درۆي ئەکەن، پەلپمان پیّ گرتن. ﴿وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ اِشارەیە بۆ عِلَتي کُفریان وە قَولي سابقیان – اِستَمتَعَ بَعضُنا بِبَعْضٍ– ئەیکەیێ. ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾﴾ کُفري عِنادي حَسَدي کبریائي، اِطلاقي نَفس لە شَهَوات.

﴿ذَٰلِكَ﴾ ناردنی رُسُل به ایات وإنذار ﴿أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ﴾ لادێ وشاران. ﴿بِظُلْمٍ﴾ ظُلْم لە جِهەت خوا، یاظُلمي خۆ بەخۆي. ﴿وَأَهْلُهَا غَٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾﴾ یَعني به مُجَرَّدي ظُلم خوا هِلاكیان ناكا، تا رُسُلیان بۆ نەنێرێ ایەتیان بەسەردا نەخوێنێ لە قیامەت نەیان ترسێنێ. حَتّا جەنابي حەق بە مُخالَفەی عَقلیش عَذابیان نادا، وَلَوْ بلێین حاكمە، چونكي مەیل وجَهل زۆر غَلَبە ئەكا لەسەر عَقل، تَفَكُّر وتَأَمُّل ناكا نانوارێتە حُسْنُ قُبحي أشیاء، بِناءً عَلَیهِ حُجَّەتی پێ تەواو نابێ، أمّا به ناردني رُسُل وتَفصیلي ایات وإثباتي مَعاد، بۆ اِختیاري كُفر، بەهانەیان نامێنێ. ﴿وَلِكُلٍّ﴾ تابِع ومَتبوع ﴿دَرَجَٰتٌ﴾ أمّا بەرەو ژێر. یامُؤْمِن وكافر لە (جِنّ) و (إنس) دەرەجاتي إرتفاع ودەرەجاتي إنحِطاط. ﴿مِّمَّا عَمِلُوا۟﴾ چاكەو خراپە. دەرەجە كە بە نِسبەتی عَمَلە، كَأَنَّهُ اِبتِداي لەوە، وە یاخود بۆ كُلّي لە أهلي قَریەي مُهلَكە، دەرەجات هەیە لە عَمَلي سوءْ دەرحەق رَسولي خۆیان، برێ یا كەمێ، تَقصیریان تیا نیە، كەلێك لەوان صاحِبْ مَراتِبن. ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾﴾ هیچی لێ بزر نابێ. ﴿وَرَبُّكَ ٱلْغَنِىُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ﴾ لەبەر رەحمەت نەبا ئەو هەمو مُجارات ومُداراتەي لەگەلّ ئەوانە بۆ ئەكرد؟ رەسولي بۆ ئەنارد؟ خوایێ كە غَنِّي بِالذّاتە إحتیاجي بە هیچ نیە چ پەكي كەوتیە إنسان مؤْمِنە یا كافر؟ لە مؤْمِن قازانجي چیە؟ لە كافر زەرەری چیە؟ ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ﴾ ئێوە وەك چەپەری لوركن، چ لێوە بن چ پێوە بن، خوا چ ئیشی بە ئێوە نیە، حەزكا هِلاكتان ئەكا ئەتان با بۆ فەنا ﴿وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم﴾ دواي ئێوە دادەنێ بە جێنوشین ﴿مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾﴾ ئەوەي لە أولادي ئێوە بي یاغَیر، بۆچی نافەرموي (مَنْ)؟ كَأَنَّهُ ئەوەي لە جێی وانن

لەو حَیْثِیَتە ناگاتە دەرەجەی عُقَلاء.

﴿إِنَّ مَا تُوعَدُونَ﴾ لە طَرف خواوە رەسول پێتان ئەگەیێنیْ. ﴿لَآتٍ﴾ دیْ – وکُلُّ آتٍ قَریب–. ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿١٣٤﴾﴾ بەلَکو ئێوە عاجز ئەبن لە مُقاوَمە، چاروناچار، مل رائەکێشن، زەلیل وبیْ دەسەلات ئەبن، ئێوە ئەتوانن مُدافَعە بکەن؟ ئەوەی عَذابتان بنێرێتە سەر بیْ هێزی بکەن؟ أَنَّهُ ئەوانە والە خۆ گەیشتنی بن، بۆیە بەوەندە اِکتفای کرد. کیْ هەیە خۆی لەبەر تاولەرزی راگریْ، جَبّار و بەقوەت و قُدرەتە. ﴿قُلْ يَٰقَوْمِ﴾ (یای) فریْ داوە چونکی قَطعی نسبەتیان کردیە. بفەرمو ئەی قَوم ﴿ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ﴾ بیْ منەت بن هەرچی لە دەستتان دێت لە قُدرەت وقوەت وگەورەیتان، دەبارەی من بیکەن. ﴿إِنِّى عَامِلٌ﴾ من لە تَبْلیغ و دەعوەتی –إلى الله– قصور ناکەم، دائِماً خەریك ئەبم بیْ سستی وإنقطاع ئیش ئەکەم ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ زوو یا درەنگ ﴿مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ﴾ عاقِبەت وأنجامی کار بۆ کیْ ئەبیْ؟ بۆ من؟ یا بۆ ئێوە؟ کیهەمان غالب ئەبین؟

﴿إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾﴾ بەو عنوانە معلوم ئەبیْ، کیْ ظالمە، نأیلی مَقصَد نابیْ. خۆدیارە من ظالم نیم، من خێر خواهم، بۆ اِنقاذی بَشَر سَعی ئەکەم، وەظُلم وتجاوزی ئێوە لە عالەم دیارە، حَتّا ئێوە لە جِهەت خوا ظُلمُ ئەکەن، لەلای وی دادەبڕن، بەلای أصنامان دادەشکێنن.

﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ﴾ بۆ خوای ﴿مِمَّا ذَرَأَ﴾ لەوەی خَلقی کردیە ﴿مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ﴾ لە خورماو دەغل وحیوانات وەك مەڕو بزن ﴿نَصِيبًا﴾ چزیْ، پشکیْ مُحَقَّر، کەم قسمێکیش بۆ أصنام ﴿فَقَالُوا۟ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ﴾ (مَع أنَّهُ) بۆ خوانیە، غایەتی وان واگومان ئەبەن ﴿وَهَٰذَا

﴿لِشُرَكَآئِنَا﴾ ئەمەیان بە دڵە. ئەمە ظُلمە، ئەگەر حبوباتە، ئەگەر مێوجاتە، ئەگەر حیواناتە، هەموی مَخلوقي خوایە. أصنام ﭺ دەخلیان لەو خَلقە نیە، کەچی ئەیان کەن بە عَدیلي خوا بەڵکو – فَوقَ العدیل– وە ئەو مأکول وحَیواناتە گەلێ لە فَوقي أصنامي وانن، بە قوەي حَیات، بە حَیات وحِسّ وحَرَەکە. أجسامي نامیە و حَیَویّە ئەکەن بە قورباني وخێر بۆ جماد، ئەوەش ظُلمێ ترە ﴿فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ﴾ لەوەي بۆ خواي صَرف ناکەن ﴿وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْ﴾ ئەمەش نتیجەي ظُلمي فَوقَ الظُلمە.

﴿سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ١٣٦﴾ حُكمێ خراپ وپیس وأحمَقانەیە. قَومێ وابن فَلاحیان ئەبێ؟ حاشا. ﴿وَكَذَٰلِكَ﴾ کو ئەوە تزیین دراوە، لایان وایە شتێ زۆر جوان وحُكمێ موافِقي عَقل ومَنطِق ئەکەن. ﴿زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ﴾ قِراءَتي مَشهور مَقبول مُتَّفَقٌ عَلَیْه شەش أئِمەی قِراءَت – زَيَّنَ– بِنا فاعِلْ. – قَتْلَ– مفعول. – أوْلادهِمْ– مُضافُ الیە. ﴿شُرَكَآؤُهُمْ﴾ (فاعلي زَیَّنَ)ە. یَعني ئارایشیان داوە شُرکاي ئەو مُشرِکانە، بۆ گەلێ لەو مُشرِکانە، کوشتني أولادي خۆیان ﭺ مُذکَر وﭺ مؤَنَّثَ ە.

ئەو قِراءَتە هیچ نَقصي نیە، ثابتە لە عَرَبي دا تَقدیمي مفعول ي صَریح وغَیرە صَریح لە فاعِل. وە قِراءَتي تر هەیە نَقل کراوە لە (إبنُ عامر)ي، (إبنُ جَریر) مُفَسِّري شَهیر نِسبەتی ئەدا بۆ بَعضە قُرّاي أهلي شام. (زُيِّنَ) بِنا مَفعول (قَتْلُ) نائب فاعِلْ (أولادَهُمْ) بە نَصْبَە (شُرَكائِهِمْ) بە خَفض. (إبنُ جَریر) ئەفەرموێ: ئەوە لە کلامي عَرَب قَبیحە غَیرە فَصیحە، ئەفەرموێ ئەوانە بۆ تأیدي قِراءَتي خۆیان شعرەکیان نَقل کردوە: (فَزَجَجْتُـهُ مُتَمَكِّناً زَجَّ القَلُوصَ أبي مزادە)، یَعني (زَجَّ أبي مِزادە القَلوصَ) أمّا رواتي شعر وأهلي عِلم بە عَرَبیە

له أهلي عِراق اِنكاري ئەكەن. (اِبنُ جَرير) ئەو قِراءَتـه قبـولْ ناكـا، لاي دروست نيه. (فخري رازي) ئەفەرموێ: (کـه ئـەوه لـه شـعر دا مُسـتَكْرَه بـێ فَكَيْـفَ لـه قُرآندا؟ قُرآني مُعْجِز له فَصاحَتدا. له قسـەي (زَمَخشَـري) بەدەرئەكـەوێ، ئـەوه ثابِتْ نەبوه له حَضرەتي رِسالەت پەناه، بەلْكو له بَعضـه مَصاحِفْ ديويـەتـي (شُرَكائِهِمْ) به (ي) نوسراوه.

وه (أمالي)ش به (قالوُا) ئەو تَوْجيهەى قل كرديه وه اِعتِراضي لێ نەگرتيـه. (بَيضاوي)ش فەرمويەتي ئەو قِراءَته ضَعيفه، له ضەرورەتي شعردا نەبێ، نابێ، أمَّا ئەو تَوْجيَهى فرێ داوه، مـادام (اِبـنُ جَريـر) (إمـام فخـر الـدين) (بَيضـاوي) تَقبيح وتَضعيفي ئەو قِراءتەيان كرديه، خاصَّةً طعن له (زُمَخشَري) بێ مَعنـايه، بابلّێين (إمـام) و (بَيضـاوي) دواي قسـەي وي كەوتينـه، خـۆ (اِبـنُ جَريـر) لـەو سابِق بـووه، ئەگـەر في الحَقيقـة ئـەوه بـه تَـواتُر بـا چـۆن (اِبـنُ جَريـر) قبـولي نـەدەكرد؟ لام وايـه مُجَـرَّد تَعَصُـبه، لەبـەر تَعَصُّـب نـەبێ چـۆن (أبـو حَيّـان) (زُمَخْشَري) ئەكاته عامي وضَعيف له (نَحو)، مـع أنَّـهُ (زُمَخْشَـري) مشـهوره بـه (إمام) له عەرەبى دا. ئەمـەش يەكێكـه لـه ظُلُميـان أولادي خۆيـان دەكـەن بـه قورباني • بۆ آلِهەى جامِده مَوهومه. له مَقالـەىْ ديتومـه حَضـرەتـي (إبـراهيم) دەيديت (وَثَـني) أولاديـان ئـەكرد بـه قوربـانـي بۆيـه ئەهاتـه خـەيالـي ئـەويش كورێكى خۆي بكاته قورباني بۆ خواي حەق، ئەو خەيالاته تَأْثيري لي كـرد، تـا لەخەويا ديت – بَعْدَهُ– مُباشَرەي پێ كرد، جەنابي حەق – لَهُ الحَمد– فِديـەي بۆ نارد. وه قِسمي له ترسي فَقر ئەيان كوشتن، ئەوەش له طَرَف رؤساي ديـن بۆيان تَرتيب كراوه. ﴿لِيُرۡدُوهُمۡ﴾ بەهيلاكيان ببەن، بەهِلاكي مادّي ومَعنوي. ئايا ئەو نَوعه قَـومـه قـەد فَلاحيـان ئـەبێ؟ عجايب ئەوەيه رَسـولي هـادي بـه شەرعێ پاك ونافِع، بۆ بَشَرْ دێ، ئـايينێ غايـەت جوانيـان بـۆ دادەنـێ بـەگوێى ناكەن هەزار پەلْپى پێ ئەگرن. كاهنێ كليلداري بيتُ الأصنام ئەو قَبايحيان بـۆ دادەنێ به غايَت مەيل و خۆشى قَبولي ئەكەن، نه ئايات نه مُعجزات نه كَرامـات

وەك خۆشناو ئەڵێ: (حەتَّق لەوێ سووریێ). بەڵێ روأساء قبل کُلُّ شيءٍ عقل سلب ئەکەن بە مَکرو دەسیسە مەیلیان بۆ خواهِشي خۆیان لێ ئەخولقێنن، وەکی شیعەکانی غَلیظ، بُغضي عُمر وحُبّي عَلي له دڵی منداڵیاندا شین ئەکەن، صوفیەکان حُبّي شێخ، تابە جاریێ وەك کەرانی ماڵی إستخدامیان ئەکەن، لەمە بوینەوە، وەگذا بَعضە مُقَلِد لە ئێمە.

في الحقیقة ئەمە باعثي هِلاکە بۆ أُمَّەت، ئەوي خائن نەبێ رێوشوێنی باشیان نیشان ئەدا، رێی فکریان بۆ ئەکاتەوە، فێري مُحاکمەي عَقلَیان ئەکا، أمَّا قَوم ئەو نَوعە کەسانەی ناوێ. ﴿وَلِيَلۡبِسُواْ عَلَيۡهِمۡ دِينَهُمۡۖ﴾ بۆیە وا ئەکەن – عَنْ قَصْدٍ– چونکە هەر قَومە دینێ باشی إلاهي بووە أما روأساي دین ئەواني خائن لێ یان گۆڕیین تێکەڵاو پێکەڵاویان کردوە – سَواءٌ– ئەو اغوایە أساساً لە شَیطان بێ یا لە روأسای خَوَنە، نان وعِزّو اعتباریان لەو تَلبیسە دایە. کەوابێ (لام) بۆ تَعلیلە بۆ عاقِبەت نیە، ئەمڕۆ ئەوە حَقیقەتێ ظاهِرە. عُلماي سُنَّة وجَماعَة بێ فێل بوون، لەنَظَري أُمَّة سقوطیان کرد. سائِري عُلماي فِرَقْ اِسلام وغَیرە اِسلام بە دەسیسە خۆیان لە نَظَري أُمَّة شیرن کردیە زۆر بە حورمەتن پایەیان بلندە دەولەمەندن. مَثَلەێ کوردیە –کفن بەمن ببڕێ مردي گۆڕ بەگۆڕ چی – أُمَّة چی بە سەردێ با ببێ، روأسایەکان بەخۆشي راي بوێرن، کافیە ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُۖ﴾ ئەوانەیان نەدەکرد لەسەر فِطرەت ئەمانەوە، بەوَجهێ مُتَساوي خَلقي ئەکردن، عیشێ بَسیط وفکرێ بسیط وطَمَعێ کەم، یا نەبووبێ، أمّا بَشَر ئەبووە طَورێ تر نِظام ئەگۆڕا ئەبونە خَلقێ تر. ﴿فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ١٣٧﴾ ئەو أمرە أمرێ تَهدیدە عاقِبەتی اِفتراي خۆیان ئەبینن، (ما) مَصدريّەیە یا مَوصولەیە ﴿وَقَالُواْ﴾ نَوعێ آخرە یاتَتِمَّە یە.

﴿هَٰذِهِۦٓ﴾ ئەوەي بۆ إلاهەکانیان داناوە. ﴿أَنۡعَٰمٞ وَحَرۡثٌ حِجۡرٞ﴾ حەرامە

– مَمنوعُ مِنهُ– وە ﴿لَّا يَطۡعَمُهَآ﴾ نایخوا ﴿إِلَّا مَن نَّشَآءُ﴾ ئەوەي خۆمان حەزکەین ﴿بِزَعۡمِهِمۡ﴾ ئەو تَحریم ومَنعە، صِرف بە زەعمیانە، عِلمیان نیە، وەنیە حُکمیْ سَماوي بیْ ﴿وَأَنۡعَٰمٌ حُرِّمَتۡ ظُهُورُهَا﴾ پشتیان حرامە لەبار لە سواري ﴿وَأَنۡعَٰمٌ لَّا يَذۡكُرُونَ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا﴾ ناوی خواي لیْ نایەنن لە وەقتی سەر برِین، هەر ناوي آلِهەکانیان لەسەردیْنن وەك (بَیْضاوي) ئەفەرمویْ.

﴿ٱفۡتِرَآءً عَلَيۡهِۚ﴾ کە ئەلیْن ئەوە دینی الاهیە بە أمري خوایە ﴿سَيَجۡزِيهِم﴾ خواي گەورە. ﴿بِمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ١٣٨﴾ خۆی ئەزانیْ چیان پیْ ئەکات ﴿وَقَالُواْ﴾ ئەمەش فنَّیْ ترە ﴿مَا فِي بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ فەرخۆلە یا شیْر. (ابنُ جَرير) ئەفەرمویْ باهەردووك بیْ چ قەیدي یە؟ لکِن فَهمي شیْر لە ما في البطون، دوورە إلاّ بە نَظَر عاداتي قَوم، کەسیْ بیزانیْ، ئەتواني بیکاتە مَعناي. ﴿خَالِصَةٞ لِّذُكُورِنَا﴾ بۆ میْ یان نابیْ ﴿وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِنَاۖ﴾ ئەگەر زیندو بیْ خاصَّە بۆ نیْرانە، میْ مَحرومن. ﴿وَإِن يَكُن مَّيۡتَةٗ﴾ (ماني البَطن) بە مردوی ببیْ ﴿فَهُمۡ فِيهِ﴾ نیْرو میْ لە مردووەکە بە اِعتباري – ما في البَطن– ئەفەرمویْ –فيه– نالیْ (فيها) مع أنَّهُ (فيه) بیْ (فيها) بیْ مَرجع دیارە، جیْی إلتباس نیە. ﴿شُرَكَآءُۚ﴾ هەمویان لیْ ئەخۆن، ظاهر وایە بِالسَّويّة بیْ. ﴿سَيَجۡزِيهِمۡ وَصۡفَهُمۡۚ﴾ ئەلیْن ئەمەش لە طَرَف خوایە، خواي تعالان جزایان ئەداتەوە مُقابِلي ئەو درۆیە. ﴿إِنَّهُۥ﴾ جەنابي حەق ﴿حَكِيمٌ عَلِيمٞ ١٣٩﴾ کاري بەجیْ ئەکا ئاگادارە. ئەو حُکمە بیْ مَعناو مَزیەتە لە حَکیم ناوە شیْتەوە. ﴿قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوۡلَٰدَهُمۡ﴾ ئەم قتلە زەرەری دونیاو دینە فِطرەتي حیواني لەسەر سَعیە بۆ بَقاي نَوع، ثَمرەي ژیان

وڵدە، پشیلە لەوانە چاکترە چ نەبی ئەو ئەخوا، ئەوانە بە خۆڕای وبێڕای دەیان دۆڕێنن قتلي أولاد چ لەبەر خوفي فقر وە یا عار وەیا قوربانی بۆ آلهە بێ شتێ غایەت خراپە لەبەشەر ناوشێتەوە. ﴿سَفَهًا بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ حقیقةً ئەوە عینی حماقەت ودوور لە علم و عقلە، بەهەر نوعێ بێ بێ وجهە.

﴿وَحَرَّمُوا مَا رَزَقَهُمُ اللَّهُ﴾ لە بهائم. حقاً جێی حیرەتە حیوان حمایەت ئەکەن ماندیان ناکەن، بەناوي خوایەکانیان بەرەڵڵایان ئەکەن، أولادیان ئەکوژن. فخر بە ضیافەت و میوانداري ئەکەن نەوەك ببیتە شریك لە خواردەمەني أولادیان قتل ئەکەن. وەي وەي لە بشر! خوا بەقورباني رسولانیان بکا ﴿افْتِرَاءً عَلَى اللَّهِ﴾ بەناوي دیني الاهي ئەیکەن. سبحان الله لەو درۆیە لەو بوختانە.

﴿قَدْ ضَلُّوا﴾ بە أسلافیان ﴿وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾﴾ لە طرف خواو رُسُل. یاخود بە مَیل ئەوانیش دوایان کەوتینە بێ حُجّت ودلیل وبُرهان وآیاتی بیّنات، کەچی لەسەر صدقي رسول اقتراح وافترا ئەکەن.

﴿وَهُوَ الَّذِي﴾ هەر ئەوە ئەوەي ﴿أَنشَأَ﴾ دایناوە ﴿جَنَّاتٍ مَّعْرُوشَاتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَاتٍ﴾ داري ئەو باغانە بعضێ خۆیان ئەهاوێژنە سەر کەپران سەرداران وەك دارمێو وەأکثري دار هەرئەچێ. لەو داراني ئێمە ئەیان ناسین ئەیان بینین بە غیري دارمێو چیتر خۆی ناهاوێ بۆ سەر شتێ.

هەتا کەي ئێوە دەست بە کلکي حوشتردا ئەگرن، بۆ خۆتان باغ و باغات دانێن سعي بکەن ببن بە مدني مملکت مُزیّن بکەن بەدارو‌بار بیکەنە بلادي مُتمّدنە ﴿وَالنَّخْلَ وَالزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُ﴾ انواعي مختلف گەنم وجۆ نیسك و نۆك برنج وماش وفاصولیا ولوبیا (إلى ما شاء الله) باغاتی خورما زیاد بکەن، حبوباتی مختلفە بچێنن ﴿وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ﴾ تەماشای جواري خۆتان

بکەن لە (سوریە) شروەتیان لەسەر زیتونە ﴿مُتَشَـٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَـٰبِهٍۢ﴾ پێك ئەچن وپێك ناچن. ﴿كُلُوا۟﴾ هەمووتان نێرو مێ ژنان محروم مەکەن ﴿مِن ثَمَرِهِۦٓ﴾ ئي ئەوەي ذکر کرا لەدارو دانە ﴿إِذَآ أَثْمَرَ﴾ گەي ﴿وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ﴾ رۆژي دروێنەي. دروێنە أصل بۆ حبوباتە أمّا لاي مُفَسِّران (تَغلیبە) شاملي رنیني ترێ وهەنارو لێ کردنەوە داوەشاندنی زەیتونە وەك (ثَمَرْ) عامّە لە دانەومیوە یَعني بەري دار. ئەو حەقە بَعضيّ دەڵێن زکاتی مَشروعە.

(سَیِّد رَشید) ئەفەرموێ ئەوە مَردودە چونکە اِجماع لەسەر ئەمەیە کە ئەم سورەتە (مَكيّة) زەکات لە (مَدینە) واجب بووە وەئەو ایەتە اِستثنا نەکراوە. (بَیضاوي) ئەفەرموێ مُراد ئەوەي ئەدرێ بەخێرو صَدَقە لەو رۆژە، زەکاتی مُقدّەرە مراد نیە. وەممکنە بڵێین مُراد ئەمەیە رۆژي رنین ودرەو حەقي درەو رنین بەجێ بێنن چاکی بدرونەوە پەریزتان پاك بێ داران هەرە رن مەکەن باخەسار نەبێ، خاصَّةً لە زەماني هەرزاني. بێ مُبالاتي مەکەن ﴿وَلَا تُسْرِفُوٓا۟﴾ بەولاو بەولاي دابدەن هەرچی هات بیدەنێ چی وانەهێڵنەوە.

ئەمرۆ لە پێش چاوتان زۆرە کەم حورمەتە سبەینێ اِحتیاجیتان پێ ئەبێ. گەنم هەر گەنمە مداري حَیاتە حەز ئەکا کوتکی بەدوور لێرەبي یا بە چوار آنە ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ١٤١﴾ علی الأطلاق لە أکل لە عَطا، خاصَّةً ئەوانەي بەناوي سیادەت ئەگەڕێن مەیاندەنێ سَیِّد حورمەتي سیادەتي خۆي لایە، لە برسان بمرێ لە سوآل ناگەڕێ، ئەوی چیان بداتێ گەلێ گوناهي ئەکاتێ.

﴿وَمِنَ ٱلْأَنْعَـٰمِ﴾ بۆ ئێوەی اِنشاو اِیجاد کردیە ﴿حَمُولَةً وَفَرْشًا﴾ گەورەوکچکە بارەوبەرد داخراو بۆ کوژرانەوە، یا فَرشي لە خوري و موو توك ﴿كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ﴾ خۆتان بیخۆن مەیدەنە وکلاي اِلاهەکانتان مێ یان

محروم مەکەن، بَعضە کي حَرام مەکەن. لام وایە ئێرە جێی معرەکەی معتزلە وأشاعِرە نیە، حرام رزقە یان نا، هەرچی بخورێ رزقی خوایە من حیث الخلق والأیجاد، یا من حیث الشرع رزق نەبێ. فەرق هەیە لە بەینی رزّاقی خواوە بەینی رَزّاقي شارع (وهو الله سبحانه) لکِن ئەوانە خَلطیان کردیە، وە تعریفي رزق ئەکەن بە (ساقە الله) نازانم معنای ئەو (ساق) چی یە؟ ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ﴾ دوای ڕێگایانی ﴿ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ مەکەون ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ١٤٢﴾ دوای کەون بە هیلاك ئەچن، ڕێی چاکتان نیشان نادا، بەڕێگای خرابتان دا دەبا تا گومڕاه ئەبن. فەرقی نیە ج (شَیطان الأنس) بێ ج (شَیطان الجِن) بێ، عداوەتي شَیطان بۆ ئێوە ئاشکرایە گەرچی خۆی بزرە یا بزرئەکا. ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۖ﴾ زَوج بە کلّي لە جفتي ونێرومێ ئەڵێن. ئەو حمولەو فَرشە بە تَفصیل هەشتن بە إجمال چوار نَوعن ﴿مِّنَ ٱلضَّأۡنِ﴾ سپیان ﴿ٱثۡنَيۡنِ﴾ مەڕوبەران ﴿وَمِنَ ٱلۡمَعۡزِ﴾ رەشان ﴿ٱثۡنَيۡنِۗ﴾ بزن ونێري ﴿قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ﴾ خوای تعالی هەردوو نێر، بەران ونێري، حەرامی کردینە، یا هەردوو مێ، مەروبزن ﴿أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ أَرۡحَامُ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۖ﴾ ج نێر ج مێ. (ذکورەت) و (انوثَتْ) إشتمالی رەحم ج نسبەتي لەگەڵ حورمەت وحَلْ هەیە تابەو نسبەتە جەنابي عَلیمي حُکیم، حکم بە حل یا حورمەت بفەرموێ، جمعاً یاتفریقاً؟ ﴿نَبِّـُٔونِي بِعِلۡمٍ﴾ خەبەرم دەنێ بە شتێ معلوم مُثبَتْ لە رسولێ، مُطابقي مَعقولێ ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٤٣﴾ کە ئەڵێن خوا ئەوەي حەرام کردیە ﴿وَمِنَ ٱلۡإِبِلِ﴾ حوشتر نێرو مێ. فەرقي نێرو مێ لەناو، بەعەرەبي، وەك (جَمل) و (ناقة) ﴿ٱثۡنَيۡنِ﴾ دوو، نێرومێ ﴿وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ ٱثۡنَيۡنِۗ﴾ رەشە وولاغ، گاو چێڕ ﴿قُلۡ ءَآلذَّكَرَيۡنِ حَرَّمَ﴾ خوا ﴿أَمِ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ أَمَّا ٱشۡتَمَلَتۡ عَلَيۡهِ

أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ خلاصه ئەو سَفاسَفه له خۆتانه (بِوَجهٍ مِنَ الوجوه) لەطرف خوايەوه نيه ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ﴾ بەلْكو ئێوه حاضر بوبن ﴿إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَاۚ﴾ زێرا ئێوه ايمان به رەسولي عَصري خوتان ناهێنن ئەبێ خۆتان رآساً له خواتان بيستبێ ﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ كەسێ درۆي هەلبەستێ لەسەر خوا، كەس لەو كەسه ظالم تر نيه، بەلْكو ئەو كەسه له هەموو كەس ظالم تره زيده مُتَجاوِز له حَدّە.

﴿لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ﴾ مَقصَدي له تَلبيسي ئەو نَوعه أحكامه، گومراه كردني خَلقه ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ وا ئەبێ بَعضێ له أهلي سياسەت وكياسەت بەزەكاو عِلم دەها خەلْكي گومراه ئەكەن، هەمو نَوعه كەسێ رێ به كَيْديان نابا أمّا ئەوانه بێ علم وبێ شعور بێ مناسبەی منطقي وعَقلي خەلْكي له رێ وەرئەگێرن.

ئەوجا بزانن ئەوانەی ئەم درۆيانه ئەكەن چەند بێ شعورن! ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾﴾ ئەوانەی به جَهل يا كِبْر حَسَد وحَسَب ورِئاسەت تجاوزيان له ئەندازه كرد، خوا رێ يان نيشان نادا به كُلّي، به گوێرەی قوەتي مەيليان بۆ ضَلال، سَوقيان ئەكا بۆ جَهَنَّم.

﴿قُل لَّآ أَجِدُ﴾ نابينم ﴿فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ﴾ له طَرَف جەنابي حەق ﴿مُحَرَّمًا﴾ طَعامێ حەرام كراو، له حيوانات ﴿عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ﴾ ئێرومێ ﴿إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً﴾ مردار بێ ﴿أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا﴾ يا خوێنی هەلْرژاو، نەوەك خويني ناو عروقي باريكه، ياجگەرو سپڵ ﴿أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ﴾ گۆشتی بەراز ﴿فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ﴾ ماذّي ومَعنوي پيسه موجبي مَرَضة مورِثي عِلّەتی خراپه صَعْبُ التَّداويه.

حُكماي غَرب زۆر وەصیەت ئەكەن لە قەومي خۆیان، دِقّت بكەن لە لێنان وخواردني گۆشتي بەراز. باوڕ ناكەم بەراز شتي پیس بخوا، برنج ئەخوا جۆ ئەخوا تریێ ئەخوا گلێنیە ئەخوا بەڕو ئەخوا، أمّا أساسي ومِزاج و طبیعي پیسە. ﴿أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ﴾ بەناوي غَیري خوا بكوژرێتەوە. قورباني بۆ آلِهەی باطلەی مَوهوبەی جامِدە، ئەوە عَیني فِسقە، وتَحریمي صِرف دینیە. لێرە باسي (مَتروكُ التسمیە) ناكات، دیارە لە پێشدان بەوی، ئەوەی مقصود بووە. بەلێ ئەوە زۆر معقولە شتێ بۆ قوربانی تزكیە بكرێ، ئەبێ ناوی خوای لەسەر بێ. أما ئەوەی بۆ خواردن ئەكوژرێتەوە لـزوم نیە ناوي خواي لەسەر بێ، ئەگەر تركیش بكرێ، مَعناي نیە حرام ببێ. ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ﴾ ناعِلاج ومجبور بێ بۆ خواردني شتێ لەوانە، قەیدي ناكا. ﴿غَيۡرَ بَاغٖ﴾ (بَیضاوي) ئەفەرموێ لەسەر مُضطَرێ وەكي خۆي ﴿وَلَا عَادٖ﴾ تجاوز نەكا لە حَدّي ضرورەت. ئەمە قاعدەێ أصولیە ئەوەي بە ضرورەت تجویز كرابێ، ئەبێ بە قەدەر ضرورەت بێ، زیادي حەرامە ﴿فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٤٥﴾ اِضافەی (رَبّ) بۆ (كافِي خِطاب) زۆر بەدِقەتە. (بیضاوي) ئەفەرموێ ئەو ایەتە (مُحكمە) (نَسخ) نەكراوە زێڕا ممكنە پاش ئەو فەرمایشە بَعضە شتێ تر لە حَیوانات حەرام كرابێ، صادِقە تا (آلآن لا أجِدُ) بادوایێ (یَجِدُ) بێ، كەوابێ ئەوە آیەتە نابێتە دەلیل لەسەر صِحّەتی نَسخي (قُرآن) بەخەبەري آحاد، وەهەم نابي بە دەلیل لەسەر حەلالي ماعَداي ئەوانە لە حیوانات. ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ﴾ جو ﴿حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ﴾ نینۆك، عام لە پەنجە چەنگالي وسم. لە ترجمەي تَورات وەرئەگیرێ هەر حَیوانێ دووسم بێ وە ئەنگوستي لێك جوودا بێ وەكاوێژ بكا وەك گاو مامز لێ یان حەلالە، ئەوەی دووسم بێ وەكاوێژنەكا وەك بەراز، یاكاوێژ بكاو دووسم نەبێ وەك حوشتر و كەروێشك، یا دووسم نەبێ

وە کاوێژیش نەکا وەکو ئەسپ وکەرو ماین حەرامە. لە طَیران قازو أمثالي قازیان لیّ حەرامە وەبعضیّ وەکی لەق لەق وتووتي باوجودي ئەنگوستیان لێك جودایە لایان حەرامە. ﴿وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ﴾ کەلیّ یان حەلالە چونکە کاوێژ ئەکەن ودووسمن ﴿حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ﴾ پیو، چەوراي ﴿إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ﴾ بەپشتیانەوە بیّ پشتیان هەلی گریّ. ﴿أَوِ ٱلْحَوَايَآ﴾ یائەوەي دەوري لە ریخۆلە دابیّ ﴿أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ﴾ نونگیّ بە کلینجە مُتَّصِل بیّ ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو تَحریمە بە زەحمەتە ﴿جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ﴾ بە سَبَب (طُغیان) (تَعَنُّتُ) یان و مل رەقي و ئەستووریان، وە إلاّ جەنابي حەق بۆ عبادي خۆي شەرعي سَهل دائەنیّ. ﴿وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾﴾ لە خەبەر دان لەوەعدو لە وەعید، جەنابي حەق (مُنَزَّه)ە لەدرۆ. دەوامي حورمەتي ئەوانە جَزاي طغیاني جووان بیّ؟ تحریمي گەلیّ شت (کە لە آیەت دانیە) لە ئێمە وەك لە کتیبی مَذاهِب تَفصیل ئەفەرمون لەبەر چیە؟ لاشَك ئەو تَجزیە وا ئەگەیَنیّ (ما عَداي ما في الآية) لە ئێمە حەرام نەبیّ. گەرچی آیەتي ئێرە (لا أجِدُ) ئەفەرمویّ، أمّا آیەتي (مائِدە) کە (آخر السُّورَە نزولاً) وە آیەتی سوەري (بَقَرە) بەبیّ (لا أجِدُ) ووە. (فَخري رازي) و (سَیِّد رَشید) زۆر تأیدي مذهبي إمامي (مالِك)یان کردوە خاصَّةً (سَیِّد رشید) لە نَقدي أدلەی مُخالِفُ دادي داوە، رەحمەتیان لیّ بیّ. من مەیلم نیە ئە منازعاتە بە تفصیل ترجمە ونقل بکەم، بابۆ مُحَشّي بیّ.

﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟﴾ لەو مَقامە نەیان گوتیە، أمّا ئەیلێن. ئەواني مشرك ئەلێن ﴿لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا﴾ بە مَشیئَەتی تَکویني بە آیەتی إلْجائي. یا أمریش نەکردبیّ، أمّا چی واي درەبارەی ئێمە نەکرد کە بزانین پێی راضي نیە.

﴿وَلَآ ءَابَآؤُنَا﴾ نەخۆمان نە آبامان نەدەبوین بە مُشرِك شریكمان بۆ پەیدا نەدەكرد. ﴿وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَیۡءٍ﴾ هیچمان حەرام نەدەكرد، مادام هیچ عَلامەتی سُخُطمان لە طرف خوا نەدیت، دیارە مەشیئەتی لەسەرە پێی راضیە.

﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِینَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ بەو تەرزە چیرۆكە أقوامي پێشی وان كە بۆ ئەمانە پێشەوان، تكذیبي پێغەمبەرانیان كردوە. بەڵێ ئەگەر خودا حەزي كردبا اِجباري ئەكردن، أمّا ئەوە لە قاعدەي كَسبي إیمان تَفریقي چاكەو خراپە دەرئەچێ. ئەو عالەمە با هەمو كافر بێ هەرچی سَیّئاتە بیكا، خوا چ پەكی بەوان كەوتوە بە جبري ئەبێ بیان گێڕێتەوە؟ ﴿حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأۡسَنَا﴾ دەوامیان لەسەر تكذیب كرد هەتا عَذابي خوایان چێشت. ئێوەش عِبرەت بگرن نێزیكە بأسي خوا بچێژن. ﴿قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٍ﴾ عِلمی واتان هەیە إعتمادي بكەنە سەر بە جَزم؟ ﴿فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآ﴾ بۆ ئێمە بهێننەدەر إظهاري كەن تا قسەي لێ بكەین. ئەو دەلیلی حُجَّەتی ئێوە مُعارەضەی آیاتي بَیِّناتي ئێمە ئەكا؟ ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ﴾ حُسنِي ظَنتان بە آباءتان ﴿وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ ١٤٨﴾ خۆتان هەر تَخمین ئەكەن.

(سَیِّد رشید) ئەفەرموێ (خرص) زۆر إطلاق دەكرێتە سەر درۆ كە لازمي خَرصە بۆیە تَفسیر كرا بە درۆ. ﴿قُلۡ فَلِلَّهِ ٱلۡحُجَّةُ ٱلۡبَٰلِغَةُ﴾ بفەرمو كە ئەو آیاتی بَیّناتەتان بیست، ئەزاندرێ كە حُجَّەت ودەلیلی بە قووەت گەیشتوە بە حَدّێ ئاشكراي.

﴿فَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِینَ ١٤٩﴾ لكِنْ هیدایەتي ئێوە نادا قَصدي ناكا، تازە فەرمويِ خوا هِدایەتی قەومي ظالم نادا وەئێوە نهایەتي ظلمتان هێناوە دەرحەق خواو پێغەمبەر.

ئەو کِبر وأنانیەت وعِنادە ئەکەن کەچی خۆتان ئەکەن بە عَبْد وزەلیل بۆ هَیاکِل وتَماثیل، لەبەر غایەتی ظُلُم نەبێ کێ بە خیالی دادێ بڵێ: (خوا ئەفەرموێ شەریکان بۆ من پەیدا کەن) ئەوە قسەیە؟ کە معلوم بۆ سَببی قَصد نەکردنی خوا بۆ هِدایەتیان چیە، حاجەت بە مَعرەکەی (مُعتزلی) و (أشاعِرە) نامێنێ، ئێمە لە صَدَدی منازعەی ئەو مُشرِکانەین، چیمان بەسەر شەڕوشۆڕی (أشاعرە) و (مُعتَزِل)ی؟ ﴿قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ﴾ ئێوە ئەگەر ناتوانن مقابلە بکەن بە حجّەت وبرهان ورِوأسایەکانی دینیتان حاضر بکەن ئەڵبەتە ئەوانە عالمن ئەتوانن إثباتی مدّعی بکەن. ﴿ٱلَّذِينَ يَشْهَدُونَ﴾ جزما ئەزانن بە دڵ وزوبانێ موافق ئەڵێن ﴿أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَاۖ﴾ ئەوەی ئێوە اِدّعا ئەکەن خوا حەرامی کردیە. ﴿فَإِن شَهِدُواْ﴾ دوور نیە شاهدی بدەن. کەسێ خەریکی اِضلال بێ هەزار سوێندی بەدرۆ ئەخوا هەزار شاهدی بە درۆ ئەدا. ئەگەر ئەوانە شاهِدیان دا ﴿فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْۚ﴾ یعنی وەك (سَیِّد رشید) ئەفەرموێ: (شاهدیان قبول مەکە لێ یان مەسەلمێنە) ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ وەك ئەوانە کە خِصام دەکەن لەگەڵ تۆو تابعی هەواو هەوەسی ئەوانەن کە تَکذیبی آیەتی ئێمەیان کردیە.

﴿وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ﴾ بە إیمانی موافِقی نَفْسَ الأمر وەك جوودیان، ئەوانەی إعتِماد لەسەر شَفاعەت ئەکەن، ئەوانە لە نەترسان فەرقیان نیە لەگەڵ ئەوانەی کە بالکُلّی إنکاری آخِرەت ئەکەن. شك ناکەم، عُلمای بَنی إسرائیلی، لەو مشاجرە دەسیسەیان هەیە. وە ممکنە مقصد لەو شهدایانە ئەوان بن، مَعَ أنّهُ مُشرِەکەکان لە حَلّ وحورمەتی أصنافی ثَمانیة وسائِرە، ئەهوەنترن لە جووان لە دیانان. دیان هیچ هەرچی بێ ئەیخۆن، پاك وپیسی لای وان نیە ئەڵێن: (عَشای ربّانی خَمرو خُبْزە، ئەگەر قَدّیس بەرەکەتی تێ خا دەبێتە

گۆشت وخوێنی عیسی). جوو قوربانیان ئەسوتێنن، چرە دووکەلي سم وپێست وپیو و گۆشت ئەکەنە بخوري خۆشبووي خودا، أنَّهُ ئەو بێنێ چرا، لاي خودا زۆر خۆشە عَطر بۆن ئەکا. ﴿وَهُم بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ١٥٠﴾ هەمتا بۆ خوا پەیدا ئەکەن، وای لەو ظُلمە.

ئایا ئەوانەی ئەڵێن إدارەي ئەو عالەمە لەبەر دەستي قُطبة ذَرّاتي کائنات بێ أمري ئەو حَرَکە ناکا، ئەگەر قطب نەبێ، عالەم مُنْقَلِبْ ئەبێ، وەبعضێ لە أولياءُ الله ئەبن بە صاحِبي (کُنْ فَیَکون)، مُشرِك نین؟ عَدیل بۆ خوا پەیدا ناکەن؟ (مَعَ أنَّهُ) ئەو قسانە سەرا مِداني مَذهَب و دین قبولَیان کردیە) ئەوەي لاي وانەبێ لایان کافرە مُلْحِدە (نَعوذُ بالله من سوءِ الإنقِلاب) ﴿قُلۡ تَعَالَوۡاْ﴾ وەرن ﴿أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ﴾ بەسەرتان دا بخوێنمە ﴿أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ﴾ گوشتی ذوشکي حەلالە یا حەرامە، قیمەتێکی چەندانی نیە. ئەمە خۆیەتي، شِرك حەرامە جَهلە حَماقەتە ظُلمێ لە هەمو ظلم گەورەترە. لەو مَقامە فەرق لە بەینی (جبریل) و (عیسی) و (رۆژ) و (مانگ) و (گاو) و (گۆلك) و (حَجَر) و (مَدَر) نیە. هیچ شت وَلَوْ أشْرَفْ الکائنات بێ وەك عقلي أوَّل لاي حُکَماي یۆنان، ناگاتە مەرتەبەی خوایەتي.

وەحدەتي زاتي وجوبي وجودي شَخصي، شِرکەت هەڵناگرێ، هەمو لە إمکان شریکن، مُمکِن مُحتاجە، (مُحتاجْ إلَیْهِ) نیە، لە إمکاندا تَقدیم وتأخیر مَفقودە. ﴿وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗاۖ﴾ حَقاً ئەوەي دواي خوا حەقي لەسەر إنسان هەبێ باب وداکە، خاصَّە داك، چ زەحمەت ومُشَقَّەت ئەبینی، چ تالاوێ ئەچێژێ، چ خوني دڵ دەرێژێ تا منداڵی گەورە ئەکات، لەو وەقتە نە (مَلَكْ) نە (عیسی) نە (شێخ) نە (مەلا) کەسێ رووي تێ ناکا، تاگەورە ئەبێ، ظالم وغَدّار حقوقي داك وباب لە فکر ئەکا دواي ئەم وئەو ئەکەوێ دۆستان ئەگرێ لەسەر یاران هەزار فَحش وقَطیعەت بە داك وباب ئەکات، لەسەر ئێوە واجبە إحسان لە

حەقیان إطاعەیان حەرامە ئەزیەت دانیان، أمّا ئەگەر کُفر بوون لە کُفر دوایان مەکەون، ئەگەر سعي بکەن بۆ مُشرِکي ئێوە، إطاعەیان مەکەن حەرامە، کأنّهُ ئەفەرموێ: (بەس إحسانیان پێ بکەن، لە کفرو شِرك وإطاعەیان مەکەن) با وجودي بۆ وجود وتربیەی ئێوە داخلي عِلّتن، (فَکَیْفَ) بە إطاعەی غَیري وزیري؟ ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم﴾ چ نێر چ مێ. ﴿مِّنْ إِمْلَٰقٍ﴾ لەبەر فقرێ کە لەسەرتانە واقِعە.

﴿نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾ ئەو هەموو أشیایەي لە دونیا خَلق کردوە کەسابەت بکەن، زراعەت وفَلاحەت، أولادتان فێری کەسب وصنعەت بکەن، تێ بکۆشن رزقێ کە خوا خَلقي کردیە بەدەست خۆتانی بخەن، مالْ داري بکەن، بە إقتصاد صَرفي بکەن أولادي خۆتان مەکوژن ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ وەك زِنا، لِواطە، جوێنی ناشیرین بە مُحصَناتان کە زۆر قَبیحن شدِّتي قُبْحیان بە شَرع وعَقل ثابِتة، بە (قحپان) ئەڵێن (فاحِشە)، هەرچی زۆر ناشیرین وناڕێك بێ لەگەڵ بَشَریەت (فاحِشە) چ بە ئاشکراي چ بەدزي. تخوني فَواحِش مەبن، مەچنە قەحپەخانە، قەپاتمان مەگرن، دۆست وبناژۆتان نەبێ نە لەگەڵ (حُرَّان) نە لەگەڵ (جاریان)، کاري فَحش مەکەن لە خلوەت خانان، لە زیارەت گاهي مُقَدَّسە، خۆتان بپارێزن، (نَعوذُ بالله) لە ژێر زەمینەکان، لە مَخادِعي پاکی و لە مَرتَو شَرَدەی صاحِب طَریقان. لەو عَصرە مَنحوسە فَواحِش ئەوەندە تَعَمُّمي کردیە نایەتە خَیال. سەربەستي وحُرّي وبێ مُبالاتي و بێ شەرمي، ئەوە هەموي نَشْأت لە (أوروپا) دەکا، گەرچی أوروپاي فَحشیاتیش بێ فائِدە ناکەن، أمّا (آسیاي) بە تقلیدي وان بێ هودە صَرفي نَقدیەتي حَیاتي خۆیان ئەکەن. ئەوەندەي چاکە ئەگەر خەزینەي أوقاف کِفایەت نەکا مَعاشي مُدَرِّس وشێخەکاني عاصمە وەیاخود أربابي مَناصِبي عالیە لە ایجارەي قەحپەخانەو مەیخانە تأمین ئەکرێ. ﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ

﴿ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ﴾ ئەو وەقتە حورمەتي نامێنیٚ. باز لەو عَصره شومە کە ئـەڵێن عَصـري (مَعـارف وعِلـم ونـوره) (عَصـري مَـدنیەتـە) (عصـري مَعْـدلت ومَشروطیّته) قَتلي ناحـەق زۆرەو بـیٚ أهمیەتـە، چ إنسـانیٚ بکـوژري ج صـەیٚ. لـەودوو سـیٚ ڕۆژە دووبـرا سـەپان ئـەبن، براگەورەکـە نـەختیٚ ناصـاغ ئـەبیٚ براگچکەکە ئـەڵیٚ ئـەم سـالٚ سـەپانیت نـادەینێی تـۆ چ ئیشـت نەکردیـە، ڕقـی ئەبێتەوە بەردیٚ ئەدا بەسەري برا گچکەکە، کە ئەویش داسی بەدەستەوەئەبیٚ داي ئـەوە شـێنێتە براگەورەکـەي نـوکي لـە زگـی ئەچـەقیٚ راي ئەکێشـیٚ لـەو کەلەکە بۆ ئەم کەلەکە هەڵی ئـەدریٚ ئەکـەویٚ دەرحـال ئـەمریٚ، سەرشـکاویش ئەوا تَداوي ئەکریٚ، پار شیوعي بەست برایەکي کوشت لەسـەر کۆتکـە تۆکێك. ﴿ذَٰلِكُمۡ﴾ ئەوانە أيْ ئەو پێنج مُحَـرَّماتـە. ﴿وَصَّىٰكُم بِهِۦ﴾ بـە أهمیـەت خوا نَهیتان لیٚ ئەکا ﴿لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ١٥١﴾ دیارە ئەوەي خـۆي لەوانـە ناپـارێزیٚ لەبیٚ عَقلیە، عَقل بۆ مَنع لەو قَبایحە، کافیە.

لە پاش وەصیەتی إلاهي بەڵکو تیٚ ئەفکرن هۆش ئەهێننەوە بەرخۆ مُنْزَجِـر ئەبن، أمَّا ئەورۆ هیچ، هەزار نُصْح بە پـۆلیٚ کـیٚ گـوێی لـیٚ ئـەکا؟ خاصَّـە کـە فَواحِش ڕەنگی دیني وەرگرت بەناوي دین کرا چارەي ناکریٚ إلاَّ بە (شیر).

وەقتیٚ (انگلیـز) إستِلاي کـرد حـاکمیٚ سیاسـی لـە (کۆیـە) یـەکیٚ لـە ڕانیـە دانیشت عالەم ئارام بوو، قَتل نەما دزي ودرۆزنـي وزینـا، ژن بـە هـەڵگرتن وژن بەدووکەوتن، خەرمان وخانوو پوشو پـاوان سـوتان، بـیٚ ناونیشـان بـوون. أمّـا مُسلمانان ظاهراً زۆر سەغلەت بون، (ئـاخ کافرمـان لەسـەر بوینـە ژێـر دەسـتي گاوري) أشـقیایەکان إظهـاري تَأسُّـفیان ئـەکرد ضُـعَفاو بەسـتەزوبانەکان زیـاتر لـەوان مَحـزون بـون، تـا حُکمـاي سیاسـي ڕۆیشـتن دەرکـەي گونـاهو سَـیِّئات وفَحشیات کرایەوە، مـازي بـەڕەڵابو، تـا ئـەمرۆ ڕۆژ بـە ڕۆژ لـە زیادیـە. دیـارە ئەوەندەي موسڵمانەکان لە حاکمي سیاسی ئەترسان عُشري مِعشـاري لـە خـوا

ناترسن وەشەرم لە پێغەمبەرو دینی إسلام ناکەن. عقلي چی! شعوري دیني چی! ئاینی چی! ﴿وَلَا تَقْرَبُواْ مَالَ ٱلْيَتِيمِ﴾ تخوني مالي هەتیو مەکەون ﴿إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ (بِوَجهٍ أحسَنْ) بۆ نِماو حِفظي.

ئەبیٚ ئێوە ئاگاداری بکەن نابی بیدەنە دەست هەتیو ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ﴾ بە سِنّي رُشد. ئەو وەقتە تَصَرُّفي مالّی خۆیان بۆ خۆیان بیکەن. مَسألەی زۆر عَجیب دەوران ئەکا لە کوردستان مالّی هەتیو چائەکەنەوە، لابدە سەنیٚ ئەچیٚ ئەوەی حەقی هەتیو مردە زیندە قابِلي دەوام وناقابِل بە کەسیٚ لە أقاربي ئەفرۆشیٚ حەتّا حەقي (ما في بَطن أُمِهِ). گەلیٚ جار سوٚال لە ئێمە لە آبای ئێمە ئەکەن وکراوە، عَرضیان ئەکەین ئەمە نابیٚ موافِقي هیچ قاعدەو مَذْهَبي نیە، باز کۆلکە مەلا ئەیکەن و نەبیٚ بزنێک مەرێك جەوارێك هەمبانەیەکیان پیٚ ئەبریٚ، پەنا بەخوا لە شەري کۆلکە مەلایان! بالمناسبە عَرَضتان ئەکەم دوێنیٚ تَحریرا سوٚالێکیان لیٚ کردم (شَخصي بە سیٚ طَلاقە خُلعي لەگەلٚ ژني خۆی کردیە دەر حال لیٚ یان مارەکردیتەوە) ئەمە چۆنە؟ بزانن جَهل چی ئەکا! فَقري مەلایان بالخصوص أُمَّت، دین وشَرعیان تێك دا.

﴿وَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ﴾ خیانەت لە کَیل و وَزن حەرامە، بە عَدلاً و حەق پێمان پیوان واجبە إیفای پیٚ بکەن بە تەواوي بەجێی بگەینن چ بۆ خۆتان چ بۆ غیري. ﴿لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ لەو تَکلیفە چ ضَیقَت ومشَقّت وتەنگی تێدا نیە ئەوانە نە (مُمْتَنع ی بِالذّاتن) نە (مُمْتنِعي بِالْغَیرن) سَهل وخۆشی بۆ کەسیٚ مەیلي خیانەتي نەبیٚ حەقي شەریعەتي إلاهي ئەوەیە هەر کەس بەگوێرەي حالّی خۆي تَکلیفي لیٚ بکریٚ، بەلّکو طاقەتي زیاتر ببیٚ ئەوکارەوکاری تریشی پیٚ بکریٚ کاري لەسەر تەنگ نەکریٚ. ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ﴾ حُکم، شایەدي.

﴿فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ﴾ ئەوەي حكمي لەسەر ئەكەن يا شايەدي لەسەر ئەدەن، يا بۆی ئەكەن، بۆي ئەدەن. ﴿ذَا قُرۡبَىٰۖ﴾ خزم بیّ. حُكمی بە ظُلم، شايەدي (زۆر)، قسەی درۆ، حەرامە دەربارەي هەر كەسێكی بیّ. ﴿وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْۚ﴾ مُخالَفەی عَهد مُطلَقا حەرامە، خاصّە عَهدیّ كە لەگەڵ خوا ببەستریّ. وەفا بە عَهد واجِبە، وەمَقصد لە تِلاوەتی تَحريم واجبەكانە.

(سَيِّد رشيد) بە أول وثاني ئەتۆرێتە وصاياى خوا إشارەي بۆ جوابي إشكال فەرموە. ﴿ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ١٥٢﴾ ئەوەي ذِكر كرا، خاصّە وەفا بە عَهدي خوا، ئەوەيە كە خوا وصايەتي پیّ ئەكا، لیّ ئەكا، بەڵكو ئێوە تَذَكُر ئەكەن. شت ئەهێننە بيري خۆتان تا بزانن فەرقي حُكمي إلاهي لەگەڵ حُكمي دي چەند فەرقي هەيە. أحكامي إلاهي هەموي حِكمەتە سەراپا مَنفَعَتە عَدالَتە كافِلي نِظامي حَياتە مايەی نَجاتە، ئەوەی حُكمي خودايە بیّ مەيل و مُحاباتە، ئەوەي وەفا بە عَهدي خوا بكا چاكە ئەكا، لە خراپە خۆي ئەپارێزیّ، سَعي ئەكا بۆ حِفظي نَفس بۆ كسبي ماڵ، بۆ حفظي خۆي بۆ بَقاي نوع حِفظي نَسل حفظي عَرض وناموس. لە هەموي گەورەتر حُرِّيەتی ضَميرە، بە مُقابِلي غَيري خوداوەندي عالەم. واي (مُوَحِّد)ي چەند خۆشە! بۆ ئەوەي حەزي لە حُريّەت وعِزّەتی نَفسي بیّ، مع الأسف ئەو مەيلە بە وَەجهیّ صحيح زۆر كەمە. ﴿وَأَنَّ هَٰذَا﴾ ئەوەي ئەيبينن ﴿صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا﴾ راست، بیّ خوارەكەو پێچەكە ﴿فَٱتَّبِعُوهُۖ﴾ حَقيقةً مَقصد لە إيمان إتّباعە. كەسیّ گۆييا إيماني بەخواو پێغەمبەر هەيە أما بە قسەيان ناكا ئەوە چ إيمانێكە؟ لەبەر شِدّەتي اِستلزام نێزيكە بلێين: (عَمل عَيني ايمانە) ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ﴾ رێگايەكاني لێك جوداو مُتَبايِن. ﴿فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ

﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾ هەر یەك ڕوو لەلایَ ئەكا، قوەت ووەحدەت نامێنیَ، مِلّیَت نامێنیَ، لە ڕێگەی خودا دوورتان ئەكا. وەكی حُكَما ئەفەرمون: (شت بە وەحدەت نَوعە مُناسبەیَ لەگەلَ مَبْدَأي أوَّل پەیدا ئەكا). تا قەومیَ وەحدەتـي زیاتر بیَ، فَیضي إلاهي بەسەر ئەوان زیاترە (يَدُ اللهِ عَلى الجَماعَةِ) لە أعظَمي مَصائب ئەمەیە طُرُقي مُختَلِفە بكەنە طَریقي خوا بەوناوە دەعوەت بكەن، هەر قَومە تابعي رئیسیَ ئەبیَ لە روأساي دین ومَذاهبي طُرُق، لەگەلَ ئەویتر عَداوەت ئەكا بە موسلّمانی زانانیَ. أتباعي أئِمَّەی أربعەی ئێمە ئەلّێن: (وكُلُّهُم عَلى هُدىً مِنْ رَبِّهِمْ) أمّا درۆ ئەكەن هەریەك خەریكە إبطالي غیري إمامي خۆی بكا.

عالەمي إسلامیەت ئەمڕۆ چەند إمام وشێخانی هەیە مردي وزیندي، ئەوەندە إلاهەیان هەیە، أكثَر شِركي مَحْضە كردیتیانە عَیني عَقیدەی إسلامي، بەناوي خواو پێغەمبەر إطاعەیان نـي یە. ﴿ثُمَّ﴾ لەپاش ئەوەي ئەو وِصایانەت بەسەردا خوێندنەوە بفەرمو خبەریان دیَ بە (مأیأتي) ئەویش ئەوەیە: بۆ تَوجیهي (ثُمَّ) قسەیان زۆرە لە هەموي دوورتر فەرمودەي (أبو مُسْلِم)ە ئەلّیَ ئەو مُتَّصِلە بە قِصَّەی (إبراهیمي خَلیل): (ووَهَبنا لَهُ إسحاقَ ويَعقوب) ئەوە چیە؟ ئەمەیە ﴿ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ﴾ (تَورات). ﴿تَمَامًا﴾ بیَ نَقص وزیادەو تَبدیل وتَحریر وتَعقید وإشكال. ﴿عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ﴾ نەوەك (تَورات)ی ئێستا مالامالا لە خَرافاتي أحكامي پڕوپوچ ﴿وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ﴾ كە رُسُل مَأمورن بە تَبلیغي، وەك عبادات مُعامَلات عقوبات، نەك هەرچی هەبیَ وەكی بَعضە جَهَلە یا ریاكار إدعّا ئەكەن ئەوە هَذَیانە. نە (تورات) نە (قرآن) بە تَفصیل هەمو شتي تیانیە.

حَتا گەلیَ أحكامي شَرعي بە قَولي رَسول یابە إستنباط دەرخراوە. تەماشاي ئەو حَماقەتە شتیَ اِختِراع ئەكریَ تا ئەو ڕۆژە بە خَیالي كەسیَ دانەهاتوە، دەست ئەكەن بەهایوهویو نَعرەتە، بەلیَ ئەوە لە فلان آیەت دا ئەفەرمویَ.

نامُبارك تا ئەمڕۆ هەزار جار ئەو آیەتەت خوێندوەتەوە بۆ چی ئەو مُخترعەت لێ نەزاني؟ بە موسڵمانانت نەگوت تا ئەوان بیکەن نەکەوێتە دەست أجانب؟ إدِّعای تریش هەیە لەمە چروك ترە ئەڵێن: (چ جای پێغەمبەر، وەلي هەموشت ئەزاني) حتّا ئەڵێن: (علم وقدرەتي وەك علم وقُدرەتی خوایە ((العیاذ باللە))). بەخوا خاتم الرسل أعلم الکل سَیِّد الأنام علیە الصلاة والسلام هەمو شتي نەزانیوە عِلمي هەمو عالم نَظَر بە عِلمي خودا (لا شَيْءَ)ە. ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ (١٥٤)﴾ دیارە بَني اِسرائیل ایمانیان بە لِقاي خوا نەبووە (مَعَ أنَّهُ) طَلَبي دیتنیان ئەکرد.

(سُبحانَ اللە) لە هیچ شت إیمانیان بە تەواوەتی نەهینایە بە نَسَب وفِدیە وشَفَاعەت تێکیان داوە. ﴿وَهَٰذَا﴾ اشارەیە بۆ قُرآن ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ﴾ کتێبێکە أمّا چ کتێبێ تابلێی عالي قَدرو عَظیمة. صاحِبي (نماو) زیادە شامل لەسەر خُلّصي کُتُبي اِلاهي، زیادەیکی زۆر... سەراپا حِکْمَتە مُطابِقي عقل وفِطرەتە. ﴿فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟﴾ ئەوەی أمری پێ کردینە دوای کەون بیکەن، ئەوەی نَهي لێ کردینە خۆی لێ بپارێزن لێی دوور کەون. ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (١٥٥)﴾ ئەوەی ایمان بەو (قُرآن)ە بێنێ نابێ أدنی خَلَلیکي لە إیمان بەڕۆژي جَزا ببێ حتّا بە شفاعت بە فِدیە بە نَسَبْ نابێ هەڵ خەڵەتێن، بۆیە إیمان دارێ داواي دیتنی خوای نەکرد، ئەوانەی کە خوا ئەپەرستن ئەبێ أومێدیان بە ڕەحمەتي خوا بێو بەس. ﴿أَن تَقُولُوٓا۟﴾ قرآنمان ناردوە نەك بلێن لە ڕۆژي قیامەت ﴿إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا﴾ نەناردراوە کتێب إلاّ بۆ سەر دوو جماعەت لە پێش ئێمە، ئەوانیش (یَهودو نَصاران)، بۆ ئێمە نەناردراوە وەئاگامان لە أُمَمي تر نەبوە ﴿وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ﴾ لە خوێندنی

وان ﴿لَغَٰفِلِينَ ١٥٦﴾ ئاگامان لێ نەبوە، نەمان ئەزاني چى ئەڵێن، بەزوباني عەرەبى نەبو تاتيێ بكەين﴿أَوۡ تَقُولُواْ﴾يا بڵێن ﴿لَوۡ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡكِتَٰبُ﴾ وەك نزولي كراوەتە سەروان ﴿لَكُنَّآ أَهۡدَىٰ مِنۡهُمۡۚ﴾ ئێمە وەكي وان زەليل وپەژارە نين، ئەوان ژێر چەپەرۆك بون، لە تێهو چوڵ وبيابان حەيران بون، لە خۆيان وەرز بون، نەيان ئەتواني چاك حِفظي كِتابيان بكەن، فَضل لە عَمل پێ كردن. (عيسى) و (حَواري)يەكاني لە ترس وزِللەت حاليان لەوان خراپتر بو ﴿فَقَدۡ جَآءَكُم﴾ هاتەلاتان ﴿بَيِّنَةٞ﴾ حُجّەى (جليل الشأن واضِحُ البيان) بەزوباني خۆتان ﴿مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ هاتني بەيانێ لە طَرَف خواي خۆتان ﴿وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞۚ﴾ عَيني هِدايەت ورەحمەتە، خواري ورەقي وشِدّەتي تێدانيە.

﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ بلێ ئەوە اياتى خواى نيە، (مَعَ أنَّهُ) زۆر ظاهرە كە آياتي خوايە. ﴿وَصَدَفَ عَنۡهَاۗ﴾ رووى خۆي لێ وەرگێرێ، تأمُّلي تێ نەكا، رووى خەلكي لێ وەرگێرێ، مانع بێ لە هِدايەتيان. ﴿سَنَجۡزِي ٱلَّذِينَ يَصۡدِفُونَ عَنۡ ءَايَٰتِنَا﴾ خۆيان، يا خەلكى ﴿سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ﴾ خراپ وشَديد ومؤلِم ومُهين ﴿بِمَا كَانُواْ يَصۡدِفُونَ ١٥٧﴾ آيەت صَريحە كە مُجَرَّدي إسْتِعقاب، نيە بێ سَبَب بێ لە قُرآندا، إنكار ناكرێ. ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئەمانە صَرفي نَظر لەو آياتي بَيناتە ئەكەن، ئەدى رِوو لە چى ئەكەن؟ ئايا مَلائكەت خۆيان بێن رسالەتيان بۆ بێنن؟ ياشاهِدي لەسەر رِسالەتى تۆ بدەن؟ ﴿أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ﴾ زاتي أقدَس بێ بيبينن؟ وەك جولەكەكان كە ئەيان گوت (أرِنا الله جَهْرَةً) بەلكو صَناديدي شِرك لە أساطيني جَهل ئەو إقتراحەيان إقتباس كرديە. ﴿أَوۡ

يَأۡتِيَ بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَۗ ﴾ وەك آياتي قيامي قيامەت مُلجأ بىٚ كەلە سورەي (اسراو فُرقان) ئەيان فەرمویٚ. أمَّا أشراطي ساعە، (دُخان) (دابَّةُ الأرض) سێ (خَف) يەك لە مَشرِق يەك لە مَغرِب يەك لە جزيرة العرب (دَجَّال) (طلوع ى شمس لە مَغرِب) (يَأجوج ومَأجوج) (نزولي عيسى) (ئاگري لە عَدەن دەرئەچێ سَوقي خەڵك ئەكا بۆ أرضي مَحْشَر) على تقديري صِحَّە وەعَدَمي تَأويل شكم نيە (نار)ى عَدَن ئاگري إنگلز بوو، لەوەپێشەوە حَربي هاويشتە أرضي مَحْشَر، نهايەت دايە فَرَنسە، ئێستاش ئەو ئاگرە دەئايسێ، مُمكِنە إرادە بكرێن. مَقصَديان بۆ إيمان بە قيامەتە يعني إيمان بە قيامەت نايەنن تا ئەو نوعە آيەتە نەبينن. ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ﴾ لە عَلائِمي قيامەت ومُقتَرَحي وان مُلجأ بێ بۆ إيمان ﴿لَا يَنفَعُ نَفۡسًا ﴾ هيچ كەس يأمثالي ئێوە كە عَنود بن ﴿إِيمَٰنُهَا﴾ ئەو وەقتە إيمان بێنن نَفع نادا. ﴿لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ ﴾ پێش ظهوري ئەو بَعضە اياتە، ئەمە ئەگەر كافر بێ. ﴿أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرٗاۗ ﴾ ئەگەر مؤمِنْ فاسق بێ، پاشان هەزار خێران بكا فائدەى بۆ نيە، ئێوەش ئەگەر آياتي مُقتَرَحەي خۆتان بۆبێ إيمانتان بێكەڵكە ئەگەر إيمان بێنن. كەوابێ حاجەت بە مُنازَعەى (مُعتَزِل)ى و (أشاعِر)ە نيە، گوێيا إيمانێ خێري تيا نەكرابێ لە قيامەت نَفع نادا لاي (مُعتَزِل)ي، وە ئەدا لاي (أشاعِر)ە.

تَفسيري ئەو آيەتە بەو طَرزە لە مُبتَكَراتي خۆم ئەزاني لكِنْ مُقابِلْ بە (سَيِّدي آلوسي) و (سَيِّد رشيد) نەمدەتواني بينوسم. تاكو تەماشاي تَفسيري (أبو السعود)م كرد (رەحمەتي خوايان لێ بێ) ئەويش واي تَفسير كردبو، ئەگەرچي كەمێ مُخالفەمان هەيە أمَّا لە روحي نَظمي كِتابي جَليل يەكين. ﴿قُلِ ٱنتَظِرُوٓاْ﴾ ئەوي إنتظاري ئەكەن. ﴿إِنَّا مُنتَظِرُونَ ١٥٨﴾ بزانين خودا چي ئەكا وەعاقِبەت بۆكێ ئەبێ. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ ﴾ ئەوانەي ديني خۆيان لێك جودا كرديە

مُختَلِف بوین، چ مَوحِّد چ غیرە مُوَحِّد ﴿وَكَانُوا۟ شِيَعًا﴾ هەر طائفەیێ مُشایعەی زعیمیێ ئەکا دوای ئەکەویێ ﴿لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ﴾ لەوان نی، لە هیچ شت، با قەوم أقارییت بن با خۆیان بە أتباعي رُسُل بزانن إقرار بە نبوەت بکەن، وەکي جوو دیان بوینە فِرەقیێ زۆر، یەك تَکفیري یەك ئەکەن. کُلِّي رەسول أمري کردیە بە إتفاق نَهي کردیە لە إختِلاف وعَداوەت وشِقاق، خاصَّە امام المُوحِّدین وسَیِّد المُرسَلِین. أساس تَفرَقَە لە تَعَدُّدي إلاه هەڵدەستیێ، هەر شُعبەیێ صَنەمیێ ئەپەرستیێ، لەگەڵ ئەوي تر رێك بونیان نیە، أصْلا جِهەتی وەحدەتیان نیە تا (عُنْصُري) بن وە (عُنْصُر) هەرچەند کە زۆر بن دەرحەق بە أجانِب چیان پیێ ناکریێ، خۆ بەخۆي ئەبن بە ئاگر یەك تر ئەسوتێنن.

هەرچەند بڵێین ئەو آیەتە دەرحەق جوو دیان نازِل بووە أمَّا مَقصَد اعتبارە مُقایَسەیە، دیارە لەبەر إشتراکي في العِلَّە صاحِبي رِسالەت لە أُمَّتي خۆي ئەگەر تَفرەقەی دینیان بکەن، لیێ یان بَریە لەوان نیە. مَعَ الأسف ئەو تَفَرّق وتَحَزُّب وتَشَعُّب وشِقاق وخِلاف وعَداوەت ونِفاقي لەو أُمَّتە دابووە لە هیچ أُممیێ نەبووە. چەند سالیێ اِتِّفاقیان بو، مَعبود ومَقصودیان یەك بو، إستِلاي جهانیان کرد. زۆر نەچو تَفرَقەیان کرد لە هەمو جَوانِبْ بە هەموو خصوص، أجانِبْ إستیلاي بەسەردا کردن، عِزّ وشَوکەت وشرەف وجاهو وجَلالیان نەما. حالاش زێدە مُختَلِفن، حَتّا نَقل ئەکەن گۆییا صاحِبي رِسالەت فەرمویەتي: (اِختِلافُ أُمَّتي رَحْمَة) سُبْحانَ الله ئەمە حدیث نیە بیێ سَنَد ئَبتە.

تا ئەمڕۆ ئەو أُمَّتە لە إختِلاف چ ڕەحمەتێکی دیت؟ چ فائدەي لیێ بەدەست کەوت؟ ئەمڕۆ مەلایێ شیعە بَعضیێ مَطاعیني کۆنە لە حەق أصحابان ئەنوسیێ ئەیکا بە کتێب باسي فِتنە ئەنگێزي حضرەتی عائشە ئەکات، ئاگاي لە کەمترین فِتنەی مَلکەی (رووس) (فکتور) یا ملکەي إنگلیز نیە، چیان بە عالەمي إسلامیەت کرد، چۆن پشتی موسڵمانانیان شکاند!

ئەمڕۆ مەلايان تەماشاى مُبَشّري مەسيحي وبەهائي وقاديانى ناكەن، مَطاعِنْ لە حەق (أبو هُرَيره)ى مسكين ئەنوسن! دەك كوێر بن دەستي قَلَمەيان بشكێ! وەأُمّت ئەمڕۆ هەر وەكو پێشو دواي ئەو خائن ومُفسِدانە ئەكەوێ، لاشك پێغەمبەر لەوان نيە ئەوان لە پێغەمبەر نين، رَسولي كبريا لەوان بَريە ئەوان لە رَسولي كبريا بَرين. لە پاش بيستني ئەو ئايەتە وەلەپاش بيستني آيەتي (تلكَ أمّة قَدْ خَلَت) ئەبايە ئەوانيش لە كُلّي عَصر دەربارەى إمامەكاني خۆيان بلێن (تِلكَ أمّة قَدْ خَلَت لَها ما كَسَبَت ولَكُمْ ما كَسَبتم ولا تُسألونَ عَمّا كانوا يَعمَلونَ).

﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ﴾ شأني وان إدارەيان لە دونياو قيامەت ﴿إِلَى ٱللَّهِ﴾ هەر بۆلاي خوايە روأسايەكانيان بە فريادیان نايەن، خاصَّةً بۆيان دەرئەكەوێ كە چيان پێ ناكرێ. ﴿ثُمَّ يُنَبِّئُهُم﴾ لە رۆژى جَزا ﴿بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ١٥٩﴾ لەدونياێ ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ﴾ چاكە ﴿فَلَهُۥ﴾ علَى الأقل ﴿عَشۡرُ أَمۡثَالِهَا﴾ لەدە كەمتر نيە.

﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ﴾ خاصّە سَيئەى أثمّە ﴿فَلَا يُجۡزَىٰٓ إِلَّا مِثۡلَهَا﴾ بە سَيِّئە جَزا ئەدرێتەوە، تەماي جَزاي چاكەى نەبێ. ئەوەى سَيِّئە ئەكا تەماشاي دەرەجەى سَيِّئەى خۆي بكا بەو گوێرە جزا وەرئەگرێ. فەرقي كەس نيە، لەنَسلي رُسُل بێ يا لە أولادي گاوان وشوان.

﴿وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ١٦٠﴾ لێرە مەلاێ وەك (فخر الدين الرازي) (سَيّدي آلوسي) قسەێ زۆر سەير ئەكەن سوأل ئەكەن (مادام ظُلْم نيە، ئەدي بۆ كُفري مُوَقّت جزاي مؤبَّدة؟). سُبحان الله زاتێ وەك (فَخري رازي) ئاگادار لە علمي (مَنطِق) مُطَّلِع بە قَضاياي مُوَقّتە ودائمە وضروريّە نەبوە، چۆن ئەو سوأله ايراد ئەكا؟ كەي كافر كُفري مُقَيّدە بە وەقت؟ بەلێ عُمري كافر مَحدودە بەحَسَبْ زەمان، بەلام حُكمي كە ئەيكا زەماني تێدا نيە. مثلا ئەڵێ خوانيە، خوا بە شَريكە، ئەو زاتە رَسول نيە، كوا تَوقيت؟ وەجوابيان سەيرترە ئەڵێن: (كافر عَزمي وايە ئەگەر مؤبّداً بژێ دەوامي ئەبێ لەسەر ئەو اعتقادە فاسِدە) كَأَنَّهُ ئەيكەنە

قَضيه ىَ دائمه، كێ ئەتوانێ لَلْ بكا؟ (فخري رازي) وائەفەرموێ! ﴿قُلۡ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ﴾ به آراي يَهود ونَصارى تَقاليدي قومي خۆم دەماغم به فَساد نەچو، خوا لەسەر فِطرەتێ خاوێن بەخێوي كردم، گەورە بوم، دواي ئەم و ئەو نەكەوتم، حَتّا له باوەشی داك وبابم نەبوم، نەك به مەيل وحُنوى داك وبابي بۆ إعتِقادياتيان مەيل كەم، خواي من مني هِدايەت دا. ﴿إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ ڕاست بێ خوارەكەو پێچەكە. ﴿دِينٗا قِيَمٗا﴾ دينێ ثابِت ومُقَرَّر بێ نَسخ وتحويل وتَبديل ﴿مِّلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ (أبُ الكُلْ) ﴿حَنِيفٗاۚ﴾ مائِل له فَسادو بُطلان، خالِص بۆ خوا، له ڕوو وريا، له مەيل ومُحابا.

﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٦١﴾ كەوابێ ئێوه لەو نين، ئەويش له ئێوه نيه، مُوحِّد ومُشرِك يەك ناگرنەوه ﴿قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي﴾ نوێژى من فَرض وسُنَّة ﴿وَنُسُكِي﴾ حەج وقوربانى. ﴿وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي﴾ ژينم مردنم ﴿لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ﴾ بژێم له ڕێى وى سَعي ئەكەم، بمرم لەڕێى وي ئەمرم. بۆ أبو بكر وعَلي بۆ أولاد أحفاد تأسيس ملك سَلطه نەت سَعي ناكەم، مَحض سَعي وكۆششي من بۆ خوايه. بَشَر كه أشرەفِ مَوجوداته له خِسەتى شِركي نَجات دەم له أسارەت وذِللەتي ژێر چەپەرۆكى رۆساو ظَلَمه وأقويا، قورتاريان بكەم. ﴿وَبِذَٰلِكَ﴾ بەو قسه بەو إخلاصه ﴿أُمِرۡتُ﴾ له طَرَف خوا له طَرَف وِجداني پاك و خاوێن ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ١٦٣﴾ وكَذا كُلّي رَسول به نظر أُمَّتي خۆی يا مُطلقًا، زێرا كُلّي رَسول به تقاليدي قَوم به خوێندن وتَعليم وتَعَلُّم نَوعاً ما تَأْثيرێكى بووه، مەگەر دواێ به تەواوي خاوێن بويتەوه:

وإنّي وإنْ كنْتُ الأخيرَ زمانا لَآتٍ بِما لَمْ تَستَطِعْهُ الأوائِلُ

﴿قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِي﴾ طَلَب بکەم ﴿رَبّٗا﴾ خوایٚ تر کیٚ هەیە أدنی مُنـاسَبەکـی لەگەلٚ مَقـامي ربوبیَّـت هـەبیٚ؟ ﴿وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيۡءٖۚ﴾ خـوا رَبُّ العالمینـە، عالـەم ممکنە، ممکن مُحتاجە.

﴿وَلَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٍ إِلَّا عَلَيۡهَاۚ﴾ هەر کەس عَمَلي لەسەر خۆیەتـي، خـۆي هەلي ئەگریٚ، چاکەو خراپە. ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ﴾ هیچ نَفس گوناهي هیچ نفس تر هەلٚناگریٚ، ناکەویٚتە سەر وي. چۆن من بە تَزویري ئێـوە فریتـە ئـەبم؟ بە تقلیدي ئێوە غَیري خوا ئەپەرستم؟ ئێوە چ کەلٚکی من ئەگرن؟ چ گوناهێکم لەسەر هەلٚئەگرن؟ حَقّاً ئەو آیەتە زۆر قیمـەت دارە، بـەلاٚم مـع الاسـف سَـوادي أعْظَم لە أُمَّت بەو داوي تزویرە، خۆي گیرۆدە ئەکا. ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم﴾ خوایٚ یەك، بـیٚ شـریك. ﴿مَّرۡجِعُكُمۡ﴾ گەڕانـەوەتان بـۆ لای ئـەوە. ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾﴾ کە هەر کەسی ئەلٚیٚ من. هەر طائفەیٚ ئەلٚیٚ ئێمە فِـرقـەي ناجیـەین، مَـعَ أنَّـهُ هـەمویان لـە ڕیٚ دوور کەوتینـەوە ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ قەڕن لە دوای قـەڕن دیٚـن ودەچـنە جیٚـی یـەك ئێـوە (خلیفة الله)ن لە أرضي کە فەرموي (إنّي جاعِلٌ في الأرضِ خَليفة) ئەوجا ئەبیٚ خلیفەی خوا چۆن بیٚ؟ سجدە بۆ بوت وگاو کەران ببا؟ حەي حاشا.

﴿وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ﴾ گەورەي مُنحصـر نیـە لـە شـعبیٚ. خـواي تعـالی بعضەکی لەسەر بعضەکان بە علم وکیاسەت وسیاسەت وشجاعەت وعقل وتدبیر بلٚند کردیە ﴿دَرَجَٰتٖ﴾ زۆر مُتَفاوت.

سَعي کەن أسبابي فضل پەیا کەن، حەیفە بە جهل وعطالەت بَطالەت بوینـە بنەڕۆکـەی أُمـم. ﴿لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ﴾ إمتحانتـان ئـەکا لـەوەی پیـی عطـا کردینە، ئەو مَواهبەی بۆ إمتحان بە ئێوەی کَرَم کردیە، بزانین چۆن لە إمتحـان

دەرئەچن، بۆ سعادەتی مِلّت چۆن تێ ئەکۆشن، نقدینەی خۆتان لە چ ڕێگایێ صرف ئەکەن؟ ﴿إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ﴾ بۆ مخالفان مُهلەتیان نادا گورج ئەیان گرێ ﴿وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾﴾ دەرحەق هەمو کەس، شَرط ئەویە خۆیان محروم نەکەن.

قومێ رعایەتی حقوقی هامَّە بکەن، خوا وردە وردە مُسامَحە ئەکا. ئیتر خوای تَعالان ڕەحم کا بە موسڵمانان بەخەبەربێن خِلافیان نەمێنێ، یەك بن، بەسەرکەونەوە، هەرمەلایێ، هەر شێخی، هەر ڕاسێ لەگەلّ ئەو دین ومِلّتە خائِنە بۆ نفعی خۆی رێیان لێ ئەگۆرێ، خوای تعالان کە (أسرعی مایکون) مەحوو نابودیان کا، ئەوەی أمینە بژی مُوَّفق بێ أُمَّت خێری لێ ببینن ئەویش خێر لە أمَّت ببینێ، خوا ڕەحمیان پێ بکا امین.[1]

---

[1] — تەولو بۆ تفسیری سورەی (أنعام) لە أنعامی إلاهی سبەینەی دوو شەمو ١٨ مانگی مبارەکی مولود (ربیع الأول) سنەی هجری ١٣٥٥ مطابقي ١٢ مایس رۆمي سالی ١٩٣٦ میلادی والحمد لله رب الأنام.

## سورەتی (أعراف)

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ سورەي أعراف (مَكِيّە) إلا چەند ايەتێ نەبێ (لە إبن عباس وإبن زبير) منقولە. بلا إستثناء هەموی (مَكيّە). آياتي دوو صەدو پێنج يا شەش ايەتە (٢٠٥-٢٠٦)وە نسخی تيانيە، گەرچی بعضێ ئەڵێن لە دوو مَوقعِ نَسخي تيايە، لكنْ قسەي ئەمانە مَنسوخە. ئەو سورەتەش بِنا لە رأي (سَيِّد رشيد) جُملَةً نازِل بوە. في الحقيقة ئەو مُباحثەی تێی دايە قابلە بِلا تَفريق هاتبێ. دُرَرْ هۆ نەوەكاني پێش ئێمە هەندێ مُناسباتيان فەرموە بۆ وَضعي ئەو سورەتە لەو مَقامە، لاي ئێمە زۆر زۆر جوان نين، وەمُناسَبەتی سائِري سورەتي تريشيان هەروايە.

ئەگەر تەماشاي ئەو نَوعە مُناسَبە بكرێ ئەتوانين سورەي (يسِنْ) لە مەياني سورەي (بَقَره) اِيراد بكەين.

ئێمە ئەڵێن رِسالەت پەناه لە سورەي سابِق حُكمێكی قَطعي وەرگرت لە حَضرەتي عَلاّمُ الغيوب كە ئەو مُخاصِمانەي تۆ مُقتَرحيني آيات إيمان ناهێنن وَلَوْ ئەو آياتانەشيان بۆ بنوێنم. ئەو زەواتانەش لە صَناديدي قُريش پياوي بە قووەت نافِذُ الكَلِمە لاي عەرەب مُحَتَرم وەك سَدّي ئاسن وپۆلا بوبونە مانع لە نَشري دينی إسلام عَوايق وديوار وحَصار بۆ دەعوەتي حضرەتي رِسالەت. في الحقيقة لەبەر وان نَشري دين گەلێ تأخير بو، ئەگەر بهاتبايا ئەوانە زوو موسڵمان بوبان زۆر زۆر تر دين نَشر ئەبو لە دڵی عەرەبان بە قوەت تر إيمان دادەمەزرا، أثَري عَداوەت نەدەما طولي صُحْبەتيان لە خدمەت (هادي السُّبُل) ئەبو.

ئەتوانین بلێین لە حَیاتي رەسولي أکرَم فتوحاتێ تەواو لە مُلکي فارس وڕۆم ئەکرا، پاش وەفاتي فِتنە وئاشوب لە بەینى أُمَّت نەدەبو یا زۆر کەم ئەبو. لەبەر ئەو مُلاحَظاتە دڵی جەنابي رِسالەت پەناه لەو قَرارە قَطعیە بِالطَبع تەنگ بو.

(أصْدَقُ القائِلِین الذّي تَمَّت كَلِمَتهُ صِدقاً وَعدلاً) بۆ تنبیه وئاگاداري سامعین خاصَّة (رَسولي گوزین) حَسْبَ العادە لە أموري زۆر مُهِمَّه بە ﴿الٓمٓصٓ ۝١﴾ إیقاذي فەرمون تا چاك گوێ ڕاگرن، مُنتَظري فەرمایشی إلاهي بن، وەلەبەر خصوصیەتي (رَسولي مُجْتَبا) (ص)ي عَلاوەي سەر (آلم)ي کرد.

﴿كِتَٰبٌ﴾ چ بلێین قُرآن، چ بلێین سورەت ئەبێ، أمَّا لاي من سورەتي سابِق مراد بێ باشترە ﴿أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ چ دلّداریێ خۆشي تیایە؟ نافەرموێ (أنْزَلْنا عَلَيْكَ)، حەز ناکا بەنسبەتێ صَریح شتێکی باوێتە سەر رەسولي خۆشەویست ﴿فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ﴾ تەنگ وسەغلەت نەبي لەوەي لە سنگی تۆ دایە، یالە خودا. ئەگەر چی مُلاحَظات وتَصَوّراتي پێغەمبەر مَقبول ومُوَجّه وجوانە دەوامي عَداوەتي ئەو نَوعە أشخاصانە لاي رَسولي مُحتَرم گرانە (لكِنْ) عَلّام الغیوب (کما هُوَ هُوَ) أشیا ئەزانێ، کێ إیمان ئەهێنێ کێ إیمان ناهێنێ، ئەنجامي کار چی لێ دێ حَوادِثي آتیة اِنقلاباتي مُستَقبله چۆن ئەبێ، بەس مَعلومي ئەوە. حاشا جەنابي رەسول لە نزولي (وَحي) إلاهي دڵ تەنگ نابێ، أمَّا بِالمجبوریەت لەو نَوعە أحوالە قَلبي مُبارەکی ڕێك دێ عاجز ئەبێ. لکن بە تَسَلّاي إلاهي دڵی دێتەوە جێی خۆي بۆ قَضای مُبْرَمي خوداوەندي عَلیم، گەردەن دادەي رَضا ئەبێ.

تَفسیري (حَرَجْ) لێرە بە (شك) بێ شك لەبێ میشکیە ولَوْ لە (حِبُر الأئمَّه)ش نَقل کرابێ. هەرچەند مِثلي (سَیّدي آلوسي) خودا جزاي خێري بنوسي زۆر خۆي ماندي کردیە بە تَوجیهی، لکِنْ ئێمە ئەو قُدرەتەمان نیە قسەي بێ وجە

وتَوجيه بكەين.

ئەوكتابە ناردراوە بۆ لاي تۆ ﴿لِتُنذِرَ بِهِۦ﴾ وەظيفەي رەسول تَبليغە ﭺ انذار ﭺ تَبشير، تأثير ئەكا يا ناكا عائدي خوايە، كێ پێی مُنشَرِحُ الصَّدر ضَيِّقُ القَلب ئەبێ، خۆي ئەيزانێ.

﴿وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢﴾ (ذكرى) لەو مَقامە جوانترە لە (بُشرى) تا ئاگاداري خۆيان بن، دائماً مُستَمِّراً لە آياتي قران مُستَفيدن، ئەمەش موجبي بَشارەتە. ﴿ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم﴾ (أيّها المؤمنون) ﴿مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ لە طَرَف خواي خۆتان. زاتاً مَقصَد لە اِنزالي كتێب لەسەر رەسول، أُمَّتە ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ﴾ خواي خۆتان ﴿أَوۡلِيَآءَ﴾ هەركەسێكی بێ، خۆتان لە اِلقا آتيان بپارێزن، هەڵ مەخەڵەتێن بە قسەيان، باگەورە گەورەكاني خۆتانيش بن. ئەمڕۆ حالي ئێوە ئەوەندە ايجاب ئەكات هەرچی ئەيڵێن لە افساد وتَشويشي أذهان، گوێ يان مەدەنێ. ﴿قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ٣﴾ ئەگەر خوا تذكيرتان نەكا زۆر غافل ئەبن، بە ظَواهِر هەڵ ئەخەڵەتێن، خۆ ئەتوانن كەم كەمە بە فكرو هۆشي خۆتان تێ بگەن ودَسائس وحيلەيأن لاتان ئاشكرابێ، أمَّا ظروف وأحوال مُحيطە بە ئێوە، زێدە موجبي غَفلَتە، خوا زۆر ئاگادارتان ئەكاتەوە زۆر ئاگادار بن شەو ڕۆژ سَعي بكەن لە اِصلاحي شئوني خۆتان وموجِباتي رَضامەندي خوداوەندي.

﴿وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ﴾ دێی زۆر، إي كافران و إي مؤمنان، وەك دێهاتی (بَني إسرائيل) ﴿أَهۡلَكۡنَٰهَا﴾ وێرانمان كرد. مشغول بوون بەسەيرو صَفاو كُفريان شَراب وقومارو رەقص وسەماو أتباعي هەواي جَهلەی أوليا ﴿فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا﴾ قوەت وشِدَّەت وعَذابي ئێمە ﴿بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ ٤﴾ تفصيلي إجمالي ئەوەيە: بَعضێ أهلي قُرى بە هيلاك چوون لە شەو غافلِ مەستي مودام

خەريكي تياترو ودانس وطَنبورە چەنگ وچەقانە، بَعضي لە وەقتي نِصْفُ النهار ئەويش زەماني اِستراحەتە. ئەو قەومانە نەبەشەو بەڕۆژ ئاگاداري خۆيان نەئەكرد، دائِما خەريكي سَفاهەت واِستِراحەت بون، هەر قەومێ وابێ بالطَّبع بە هيلاك ئەچێ مەحوو نابوت ئەبێ.

﴿ فَمَا كَانَ دَعْوَىٰهُمْ ﴾ هيچ عُزريان نەبو بيكەنە سَبَبي هيلاكيان دەعواي بكەن ﴿إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَآ﴾ لەو وەقتە ﴿إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ﴾ هەمويان ﴿إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ۝٥﴾ وا نەڵێن بڵێن چی؟ لاشَكَّ ئەوانە لە أهلي عَصري ئێمە چاكترن. گەلێ شارو مَمْلَكَتْ بەزَوبَعەو فرتَنە وێران ئەبێ لە مَوانيء بَحر چەند پاپۆري عَظيمي حَربي پارچە پارچە ئەكات، ئەڵێن (غَضَبُ الطَّبيعَتە) بەو إنتباهە بۆ جهەتی خوا ناڕۆن. لە قروني مُتَطاولە شكست ئەخۆن مُلكيان ئەچێ، بێ عِزَّەت ئەبن، ئەكەونە ژێری نيری أجانِبْ، كەچی ئەڵێ ی نەبايان پێداهاتيە نەباران، بە بەزم ورەزم و عُشرەت چەنجەبازي لەگەڵ ئەو بِلادي راقيەي غالبە ئەكەن، سُبْحانَ الله لەو اِنقلابە عَظيمة لە هەموشت! ﴿ فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ ﴾ أُمَّتی دەعوەت ئايا إتِّباعي رُسُلتان كرد؟ رێی هيدايەتی وانتان گرت؟ ﴿وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ۝٦﴾ لە چۆنيەتی تَبليغ وإيجابەي قەوم ومُتابَعە ﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم﴾ هەمويان، حالی ڕابدويان بۆ بيان ئەكەين.

﴿بِعِلْمٍ﴾ (كَما هُوَ الواقِع) بێ كەم و كورتي ﴿وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ۝٧﴾ هەمو حال حِكايەت و أعمال ومَنْوِيّاتيان لاي ئێمە ئاشكرايە لەوان گوم نەبوين، كە ئاگامان لێ يان نەبێ ﴿وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ﴾ كێش وتەرازووي ئەوێ ڕۆژي حەقە، ياهەر ئەوي ڕۆژێ، ياهەر وَزني ئەوێ ڕۆژێ حەقە، فِديە نيە، مُجَرَّدي اِنْتِساب كەڵك ناگرێ، لاف و گەزافي شُفَعايان دەرئەكەوێ دەعوايان باطِل دەرئەچێ هەر شتە تەرازوێكی هەيە، سوك و گران صاغ و چروكي پێ ئەزاندرێ، نَحو صَرف مَنطِق عِلمي بَلاغە عَروضْ، هەريەك نَوعە تەرازوێكە

إنسان تەماشا ئەكا، إنسانێ ئێسك سوك و ئێسك گران لێك جودا ئەكا. ئەڵبەتە جەنابي حەق نَوعە ميزانێ دا ئەنێ بۆ أعمال و أخلاقي أهلي مَوقف، سوك وگراني پێ دەرئەكەوێ، كەس قسەی نەمێنێ لام وايە ئەو نَوعە (ميزانە) (مُعْتَزِل)ى إنكاري ناكەن، بەڵكو قَول بە (وَزن) مُناسِبي مَذهَبي وانە ئەوان أصحابي عَدلن ئەڵێن: (واجبە هەر كەس بەحەقي خۆيان بگات هەر كەس بەگوێرەي عملي خۆي چاكەو خراپە استحقاقي مُقابِلي هەيە).

دووكەس لە ظاهِري عَمَلي چاكە مُساوي لە حُسني نِيَّت وإخلاص مُتَفاوِت بێ كێش وتەرازو چۆن حەقيان دەرئەكەوێ؟ عَدالت چۆن ظهور ئەكات؟ أمّا اِنكاري كێش وتەرازووي (بَقّالان) ئەكەن، اِنكاري تَجَسُّمي أعمال ئەكەن، نالێن صَحايفي أعمال، وەك كاغەز ودەفتەري ئێمەيە.

بزانن اِنسان گەيشتە دەرەجەێ ڕۆژو أرض لە وَزن ئەدا نِقليان ئەزانێ تَفاوت لە بەيني نسبەتي ثِقليان وحَجميان كَشف ئەكا، چ تەرازوی بَقالان هەرناخا. عُلَماي نَقل بَعضة روايەت ئەكەن مُدهِشن. بِنا لە قسەي وان تەرازو تەرازوي عَدل نيە، تەرازوي اِغرايە تەرازوي تَشجيعە لەسەر گوناهان يەك جار بلێ (لا إلاه إلا الله) بەسيە، صەد هەزار سِجِلي گوناه لەتەرازودا مەحو ئەكاتەوە. صَلَواتێ لە پێغەمبەر بدە پێغەمبەر لە رێی (جَهَنَّم) ئەتگرێتەوە، بەرُقعەي صَلَواتێ، كَفَّەی حَسَنات راجِح ئەبێ لەسەر كَفَّەی سَيئات. خُلاصە إيمانمان هەيە بە فەرمايشي خوا أعمال وأخلاق لە وَزن ئەدرێ. ﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ اي چاكە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە ﴿هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ٨﴾ باكورەگاوان وشوان بن. ﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ باكورى پێغەمبەر بێ.

﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم﴾ خۆيان خەسار كرديە بێ وَزن وقيمەت بوين (فَلَن يَنفَعَ الأهل مِن هاشِمٍ: إذا كانَتِ النَّفسُ مِن باهِلَة).

﴿بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ٩﴾ ئەوە سَبَبي خُسرانيانە قسمێكيان كافرن

له حَدّي إيمان دەرچوين، صَرَاحةً تَكذيبي اياتي الاهي ئەكەن، قسمێ لەسەر مُقتَضاي إيمان ناڕۆن له حَدْ تَجاوز ئەكەن، به اِعتمادي نَسَب وشُفَعا، ئەمانه إيمانيان كەم هێز ئەبێ ناتوانن له مُتابَعەی هەوا ڕوويان وەرگێرن به ڕيوايەتێكی واهيه آياتي قَطعيُ المَتنِ والدلالة، له جهەتي دلالەتي خۆيان صَرف ئەكەن ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ له پاش أقوامي سالفه ئێوەمان گێڕا به قەرارگێڕ له أرض، ياصاحبي مُكْنه وقوەت وتَصَرُّف. ﴿وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا﴾ له أرضي ﴿مَعَٰيِشَ﴾ أنهارو جۆگەو جۆبار، جَنّاتي مَعروشات وغَيره مَعروشات، أنعام وطيور و أنواعي نباتات.

﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ۝١٠﴾ شُكري نعمەت غريزيه، حتّا حَيوانات شكري نعمەت ئەكا تَعظيمي مُنْعِم ئەكات. لام وايه (مُعْتَزلي) كه ئەڵێن: (شكري مُنعم واجبه به عقل) ئەو غَريزەيان مَقصوده إنسان لەگەڵ ئەمه كه عاقله زۆر غافل ئەبێ، شُكرانەي نعمەت ناكا، ياخود نعمەت له كەسێ تره كەسێ تر شُكر ئەكا، بۆيه خوا لۆمەيان ئەكا وه أمريان ئەكاتێ به شُكري إلاهي صاحبي نِعمەت.

وه إلاّ هەمو دونيا ئەوه نيه گەر خودا بيداته كەسێ شُكرانەي لێ طَلَبْ بكا يا منەتي لەسەردانێ. ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ﴾ تقديرمان كردن ئەوه قبل الأيجادي بالفِعله ﴿ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ﴾ به تەواوي صورەتي شَخصيەمان پێ دان. ئەو خَلق وتَصويره (كَأنَّهُ) لەگەڵ خَلْق وتَصويري (أبو البَشَر) بووه، چونكي يەك خَلقه يەك تَصويره غايەتي طَريقي جوداية: (ما خَلْقُكم ولا بَعثُكم إلاّ كَنَفسٍ واحِدة) بۆيه ئەفەرموێ ﴿ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ﴾ ئێوه لەو پێنايه به مَسجودي (مَلَكْ) حِسابن چۆن له خۆتان گەورەتريان ئەزانن؟ ئەڵێن بَناتُ اللهن؟ يا (مَلَكْ) نەبێ به رەسول ئێمه إيمان به رەسولي بَشَر ناهێنين؟ واي لەو قەومی جاهل وبێ غيرەت ومَحروم له عِزّو شەرەفي إنساني!! بَعضێ بەوەندەش اِكتِفا ناكەن

(مَلَكْ) ئەکەنە مُصَوِّري بشر (هُوَ اللهُ الخالِقُ البارِيءُ المُصَوِّرُ) ﴿فَسَجَدُوٓاْ﴾ هەمویان بەبێ تأخیر ﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ﴾ (إبلیس) گەرچی لە (جِنْ) بوو، أمَّا فەردي بوو لە ناو (مَلَكْ)، بۆیە خِطاب حَقيقةً تَناولي بۆ برد وەبە فِعليُ مُتَعَلِق بە (مَلَكْ)، اِسْتِثناء کرا. ﴿لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ١١﴾ حقيقةً (مَلَكْ) نەبووە بۆیە لەوان إِنحرافي کرد (بەد طینيي) خۆی ئاشکرا کرد.

﴿قَالَ﴾ فەرموي ﴿مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسۡجُدَ إِذۡ أَمَرۡتُكَۖ﴾ چیە نایەلێ تۆ سَجدە ببەی بویتە سَبَب ومُقْتَضي وموجِب ومُجْبِر لەو سَجدە نەبردنەت فَوْراً کە أمرم پێ کردي؟ عبارەتت فَهمْ نەکرد؟ لەبەر مَجازو اِضمارو حَذف واشتِراك وقَلْب وتَخصیص وأمر بۆ تَراخي، نەت زاني مُرادم چیە؟ خُلاصە سَببي چبو بۆ سَجدە نەبردنت (حينَ الأمر)؟ ﴿قَالَ﴾ ابلیسْ. ﴿أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ١٢﴾ من لەوزیاترم، منت لە ئاگر خلق کردیە، ئەوەت لەقوڕ. بەلێ هەرچەندە زاناندرابو کە هَێکەلی بَشَري أساساً لە قوڕە، چەندێکە زاناندراوە عَناصِري بَدَني آدەمي و سائِري حَیوانات لە مَوادي (ناریە)یە تَبَرُّدي کردوە، حتّا ئەویش لە دوو مادّەی (ناري) مُحرِق ومُحْتَرِق تَرکیب کراوە.

ئەگەر إبلیس ئاگاي لە نِزاعي مەلایاني أصوليّ ومُفَسِّر با، لام وایە خۆی نجات ئەدا. ئایا ئەو جَوابە تَسلیمیە؟ یا ناسلمێنێ ئەویش مُراد بوە بە أمر؟ کەوابێ تَخصیصي کِتابي کردوە بە قیاس ئەمەش نابێ جواب ئەدەنەوە، ئەمە تَخصیص نیە، إبطالە رفعە بۆ نص. (سَیّدي آلوسي) ئەفەرموێ: (وَفیهِ تَأمّلٌ). نَقل لە پێغەمبەر ئەکەن فەرمویەتي: (أوَّل کەسێ قیاس کردوە لەکاري دین بە رَأي خۆي، اِبلیس بوە).

أمَّا (جَعفري صادق) ئەفەرموێ: (ئەوي قیاسی أمري دیني بکا بە رَأي خۆي، خوا ڕۆژي قیامەت ئەیکاتە قَریني اِبلیس). (فَعَلی هذا) قیاس بالكُلّي مَمنوعە. لکِنْ من نازانم مَقْصَد لەو قیاسە چیە؟ مَنطقە؟ فِقهي یە؟ بەلْکو

قیاسی وا له قَضا ئەخوازیٚ، ابلیس بلا تَردُّد سجدەي ببردبا، مادام (مَلَكْ) کە نورن، نوریٚ بیٚ دوکەلٚ و حَرارەت وسوتاندن سَجدەیان بردوە، ئەبا ئەو قیاساً (لِلأدْنی عَلی الأعْلی) أدْنی تَوَقُّفي نەکردبا. کەوابیٚ بۆ قائِل بە قیاس هەیە بلیٚ (عَملي بە قیاس نەکردوە بۆیە مَلعون ومَطرود بوە، إِسْتِدلا لە کەي عَلَیْه، لا لَهُ، بووە).

لاشَك قَسەی ابلیس لە رَأْي (جَعْفَریان) نیٚزیکە ئەلیٚن: (فاضِل نابیٚتە تابِعي مَفضول). حاصِلي لە سوءي طالِعي ابلیس بو ئەو ماجَرایە پیٚش مُنازَعەی مەلایان بوون وە إلاّ خۆي نَجات ئەدا ئەیگوت: (ئەو فەرمایشی إلاهي مُفیدي ظَن بو، بۆ من، إفادەي عِلمي نەدا، تاناعِلاج إمْتِثالي بکەم). ئایا ئەو مُخالِفانە جەوابیان لە بَدل ئەدانەوە؟ ﴿قَالَ﴾ جەنابي حەق ﴿فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا﴾ بچۆرە خوار، لە بەهەشتیٚ، یا زومرەي مَلائِکەتان ئەوەش دوور نیە ﴿فَمَا يَكُونُ لَكَ﴾ بۆت نابیٚ ﴿أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا﴾ لە بەهەشت، یالە مەیاني گروهي (مَلَكْ). تەماشا کەن ئەوان لەسەر قُدسیەتي خۆیان هیچ بەهانەیان هیٚنا؟ چۆن گەردەن دادەي إطاعەت بون اْلحَقْ تَکَبُّري (إبلیس) لەو مەیانە زۆر نابەجابو ﴿فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ١٣﴾ برۆ دەر تۆ لە فرۆ مایاني، ئەگەر طینَنت باش با خۆت لە مَلائِکەتان دانەدەبڕاند ئەوەي تکبري نابەجا بکا، دیارە بیٚ أصله یا بەد أصلە نَجابەتی نیە گچکەیە گەورە نیە، ئەوەي عُنصري پاك بیٚ لەگەلٚ عِزَّەتي نَفسُ مُتَواضِعە، کەسي لا سوك نیە. وەك لە ئاثار دەرئەکەویٚ ئەوەی تَکَبُّر بکا خوا ئەي شکیٚنیٚ خوا ڕەزیل ومُهان ومُحَقَّري ئەکات ﴿قَالَ﴾ (إبلیس) ﴿أَنظِرۡنِيٓ﴾ مُهلەتم بدە مەمکوژە ﴿إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ١٤﴾ ئادەم وأولادي ﴿قَالَ﴾ جەنابي کبریائي ﴿إِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ١٥﴾ دیارە إیماني بە حَشر بووە وەتەنها ئەو (مُنْظَر) نیە. بِنا لە رِوایەت لە (إبنُ مَسعود) پاش طلوعي ڕۆژ لە مَغْرِبْ

(شَیْطان) ئەکەوێتە سَجْدە ئەڵێ: (إلاهي بۆ کێ أمر ئەکەي تا سجدە ببم؟) هەر لە سَجْدەدا دەمێنێ تاکو (دابَّةُ الأرض) ئەکوژێ. رەضاي خواي لە (إبنُ مَسعود) بێ گەلێ شتي سەیر سەیري لێ نَقل ئەکەن.

ظاهري (قُرآن) وایە ئەو ماجَرایە بە گفت وگۆی لَفظي بوبێ، نەك أقوال وأوامري تکویني یا لساني حالْ بێ. ڕەنگە قابلیەتي دەوامي حَیاتي لە خۆي دەرك کردبێ، لە قەومێ لە ناو قەومێ گروهێ عُمر درێژ دائمُ البَقاء وەك خۆی دیوە، بۆیە طَلَبي زێدە بَقاي کردیە وە إحتمالي هەیە لەو طَردو إخراجە ترسابێ کە مادَّةً ومَعْناً لە زومرەي (مَلَكْ) اخراج کرابێ، أُمێدی مَعنویاتي نەماوە (ما لا یُدْرِكُ کُلُّهُ لا یُتْرَكُ کُلّه) مُقْتضاي مادّي خواستوە خواش قبولی کردوە.

ئەمە چی تیایە خوا چۆن قسە لەگەڵ ئەم کافرە ئەکا خوا بۆ خَلقي ئەکا؟ تَکلیف بۆچی؟ کافر بۆ إیجاد ئەکا؟ بۆ أمر ئەکاتە شَیطان بە سجود بۆ آدەمي؟ نەمکرد بۆ لَعْني کردم؟ بۆ دەوامي دا؟ بۆ مُسَلّتي کرد لەسەر أولادي آدەم وحوّا؟ ئەو نَوعە سؤالە نابەجایانە گۆییا مُناظَرە یە لە بەیني (إبلیس) ومَلائکەت. بە واسِطەی شارحي چوار (إنجیل) لە (تَورات) نَقلي ئەکەن، ناشزانن ئەو شارحە کێ یە. ئەڵبەتە (شَهرستاني) کە أساساً ناقلە، ناسیوەتي. جەواب لە شارِحي مَذکور وەرئەگرن خوا (وَحي) ئەنێرێ بۆ (إبلیس) تۆ نەتناسی بوم، ئەگەر بتناسي بام، ئەتزانی، إعتراضي نایەنێتە سەر من لە هیچ کردار وکردەوەی من، من خواي بەتەنێم غَیري من خوا نیە سؤالم لێ ناکرێ بۆیە ئەیکەم. حَقیقةً ئەم جەوابە لە شَأني (أشاعِران) خۆش دێ، إمام ئەفەرموێ: (ئەگەر أوَّلین وآخرین قَول بە حُسْن وقُبْحي عَقلي بکەن لەو شُبَهاتە تَخَلُّصْیان نیە) مَعَ أنَّهُ جەوابي ئەو أسئِلە هەموي لە (قُرآن) وەرئەگیرێ وە ئەتوانم بلێم ئەگەر نَفسي خَبیثي خۆمان نەبێ، (إبلیس) چی پێ ناکرێ، (أعْدَی العَدوِّ نفسه) وەك لە حدیث ئەفەرموێ. (إبلیس) لە خُطبەی جَحیمي دا ئەڵێ: (ما کانَ لي عَلَیکم من سُلطان إلاّ أن دَعوتکم فأستَجبتُم لي). خُلاصە

اِشتِغال بەو أبحاثە اِنساني مَشغول ئەكا لە مَقصَد وروحي آیەت.

﴿قَالَ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي﴾ أصلي (غَيْ) بە مَعنا فَسادە مُدّتێك چونە، (مُعتَزِلي) ئەڵێن بە معنا غَیَبت وهلاك هاتوە مجبوریەت نیە بلّێین بە مَعْنا خَلقي ضَلال گومراهیە لە (إبلیس)دا، باوابێ چ قەیدیە!!

مُفسِّرەكان ئەفەرمون: (رب) یا بۆ قَسَمە یا سَبَبیە) وَعَلى التقدیرین (ما) مَصَدریە. نازانم قَسَمي إبلیس بە اِغواي معناي چیە؟ ئەگەر لە قَسَمي مَلعونانەي اِشارە بۆ (سببیەت) نەكا، تێی ناگەم وە نەم دیوە بفەرمون (ما) مَوصولەیە، مَعَ هَذا چ مانِع نابینم وەزۆر جوانە لەگەڵ ﴿لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ﴾ زێرا لە هەموو حالا، رعایەتي من، (اِغواي لِأجْلِه) لازمە.

﴿صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ١٦﴾ وەكي قُطّاعُ الطَّریق لە كەمینی تَرَصُّدیان ئەكەم، مَقصَد لەو ڕێ یە ڕێی (مَكّە) نیە، وەك رِوایەت لە (اِبنُ عباس) و (اِبنُ مَسعود) ئەكەن، حَدّم نەبێ بلێم ئەوەش نَوعە ڕێ لادانێكە ﴿ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ﴾ مواجَهَةً ﴿وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ﴾ پشتیان لێ ئەگرم ﴿وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡ﴾ لە تەنیشتەوە لێ یان ئەدەم.

ئەمە بە أحوالي أشخاص ئەگۆڕێ. ئەوەی دەماري شل و نەرم بێ بۆ گومراهي قابلیەتي زۆر بێ، ڕوو بە ڕوو صَراحَةً بۆیان دێ اِغوایان ئەكات. ئەوەي قوەت بێ مُدافعەي پێ بكرێ، بەحیلەو فێل و كتوي، پشتي لێ ئەستێنێ، بە إیمان و خواشُناسي گومراهي ئەكات. ئەوەی مُتوسِّط بێ نە ڕوو بەڕوو بۆي دێت چونكي زۆر بَسیط نیە وەنەلەپشتەوە چونكی زۆر بە قوەت نیە تەنیشتاو تەنیشت بۆی دێت لێی ئەداو وەري ئەگرێت، وەك قوماندانێ ماهِر لە حالي دوشمني بگات. بەو گوێرە بۆي ئەچێ ئەیشكێنێ. دیارە (شَیطان) لە حەق بَشَر لە بَشَر أهون ترە.

لە حەربي عمومي بە طَیارَە لە فَوق، بە لُغُم لە بن أرض، ئەچون بۆ دوشمن.

بۆ تَوجیهي ئەو جِهاتـە مـەلایان تَـوجیهـاتیّ حکیمانـەیان فـەرمووە، مـن زۆرم کەیف پیّ نەهاتن، ئەوەي ئارەزو ئـەکات مُراجعَـەی تَفسـیري (سَیِّد آلالوسـي) بکات. لاشَك ئەوە تَمثیله مَقصد ئاگادار کردني بَشَر، ئاگایان له جهاتی خۆیان بیّ به اِخطاراتیّ تەواو بەرِیّ دا برِۆن که له هجومي عَد أمین بن.

﴿وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾﴾ مَعَ أَنَّهُ لەسەر وان منت طَرد کـرد، دواي مـن ئەکەون، شکرانەي ئەم و ئـەو ئەکـەن، أي تـو ناکـەن! ئـەزانم مُعیـنم زۆرە لـه داخلي بەدەن یاریدەیم ئەکەن، قواي حَیواني پێش عَقل ورَسول تَمَکّن ئەکا، بە زەحمەت عَقل له ناو ئەو مَشاعِرە جێی ئەبێتەوە، تا ئەو مَحْکَمْ ئەبێ من ئیشي خۆم ئەبینم عَقلیان لیّ تێك ئەدەم ئەو جا گویّ نادەنە رەسول.

﴿قَالَ﴾ رَبُّ العِزّە ﴿ٱخْرُجْ مِنْهَا﴾ لـەو خطوراتـە لـەو زمـرەو مَقامـە کَـریمـە. ﴿مَذْءُومًا﴾ مَـذموم ومُهـان ومَلعـون. ﴿مَّدْحُورًا﴾ مَطـروداً ﴿لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ﴾ لـه بَـني آدەم ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ﴾ ئێـوە، تـابع ومَتبـوع. ﴿أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾﴾ خـوا چەپارەمان دا له مُتابَعەی نَفسي خَبیث وإبلیس، له شکوك وشُبَهاتي إبلیسانـە، آمین. جەنابي حەق بە إبلیسی گوت هەرِوە دەروە نِداي کردە آدەم وەفـەرموي ﴿وَيَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ﴾ ئەی إبلیس برۆدەر ئەي آدەم دانیشـە خـۆت وخێزانت له بەهەشتا.

بەهەشت ببێتە مَکْنَتان. له خِطاباتي سابِق باسي زَوْجـي آدەم نـەبو، لێـرە، ذِکْري، هـەروا ئـەبیّ (کـەوابیّ چ مُتابَعـەی في السَّـکني لای حَقـیر نیـە) هـەروەك ﴿فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا﴾ لـە هـەر کـویّ هـەر چـی ئـەیخۆن بیخـون، مُسـاواتە لـە سُکناشدا وایە. مَعَ أنّها لە أساسي وجود، فَرع وتابِعە، وەهەم ئەو نَوعە تَفریقـە له بەهەشت رِعایەت ناکریّ.

﴿وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ حَقیقَةً حَقیقەتی ئەو (شَجَرە) بۆ ئێمە مَعلـوم نـەبوە،

ئەوەندە فَهم ئەکریٚ لە قُرآن کەشتیٚ (مُهَیِّج) بوە ﴿فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ١٩﴾ ئەگەر نیٚزیکی کەون بە خواردن، یاخود داخلي سَدُّ الذَّرائع بیٚ. تجاوز لە حَد ئەکەن، یَعني ئەوان توشي مُزاوَجە ئەبن، بُنیاتی حَیاتي أولادیان خراپ دادمەزریٚ. ﴿فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ﴾ القاي واني کرد صَبرۆکە صبرۆکە وردە وردە تحریکي دان کەلەو دارە بخۆن ﴿لِيُبْدِيَ لَهُمَا﴾ بۆ آدەم وزوجي ﴿مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا﴾ ئەوەي لێیان بزر بوبو، وەك منداڵان، کورو کچ پێکەوە گەورە ئەبن تاَ مَبْدَأي مَیْلیان تیا پەیدا ئەبیٚ سَوْأتي یەك نابینن، باوجودي لێك مَکشوفن، أمَّا بەدڵیان دا نایٚ. لاشَك ئەو صەیە ئەیزانی ئەم (شَجَرە)یە ئەو ثَمَرەیەي هەیە، کەوابیٚ حاجەت بە تَأْویلي (ل) نیە، غایەي أوَّلي ئەمە بووە. (بِناءً عَلى هَذا) حاجەتمان بە لِباسي (نُور) نیە وەهەروەها بە لباسیٚ وەك (نینۆك).

آیاتي فِطري بە قَواعدي فِطري تَفسیري چەند خۆشە!! ﴿وَقَالَ﴾ إبلیس ﴿مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ﴾ لە نیٚزیك بوني، لە خواردني ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ﴾ جارێکی بخۆن، حاجەتتان بە خواردن نامێنیٚ، لە اِحتیاجی بە خواردن (غَني) ئەبن، حَیاتتان وەك حَیاتي مَلائِکەتانی لیٚ دێت، ئەبن بە نورانیٚ تەواو. بناءً علیه جێی تَفضیلي (مَلَكْ) لەسەر (بَشَرْ) نیە ﴿أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَـٰلِدِينَ ٢٠﴾ لە بەهەشت دا دەمێنن قَط دەر ناکرێن ﴿وَقَاسَمَهُمَآ﴾ بۆ هەردوکیان سوێندي خوارد سوێندی مۆکدو بە قووەت

﴿إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ٢١﴾ خالص وبیٚ خیانەتم ﴿فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ﴾ هینانیە خوار، هەری خەرەتاندن، مەیلی خواردنی (شجرة) بە نوعیٚ غەلەبەی لیٚ کردن ئاگایان لە حاڵی خۆیان نەما، سەرزەدەو بیٚ مبالات دەستیان کرد بە

خواردنی. ﴿فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ﴾ تامیان كرد ئەوەندەی پیّ نەچوو بەلّكو بلا مُهْلە ﴿بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا﴾ مەیل وشهوەتیان تێدا پەیدا بوو، هەرامە و(هینی) یەكتریان دیت، حسب الفطرە شەرم گرتنی ﴿وَطَفِقَا﴾ مباشرەیان كرد، شروعیان كرد ﴿يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا﴾ (سَوْأتَيْنِي) خۆیان ﴿مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ﴾ گەلای بەهەشتیان لەسەر یەك دادەنا وەك پارچە پارچەی پینە، پێكەوە ئەنوساند، تاپان ودرێژ ببیّ، بە نوعیّ دایان پۆشی. ﴿وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ﴾ لە رووی (عتاب) ﴿أَلَمْ أَنْهَكُمَا﴾ ئایا ئەدی نەهیم لیّ نەكردن؟ ﴿عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾﴾ ق زوو لە فكرتان كرد! ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا﴾ لە خۆمان دا نقص وزەرەر عائدی خۆمان بوو، بە عصیانی ئێمە خلل بە گەورەی تۆ ناگات. ﴿وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا﴾ بە تركی عقاب ﴿وَتَرْحَمْنَا﴾ بە رضا ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾ وەرە تەماشای (معتزلە) و سائری (سُنّي) بكەن، أنبیاء معصومن ئەو گوناهە صغیرە قبل النبّوتە، خێر معصوم نین. نابینی لە بعضیّ علمای (حَنَفي) نقل ئەكەن ئەوی بلّیّ أنبیاء گوناهیان نەكردیە، كافر ئەبیّ، زێرا مخالفە بۆ نصوصی قرآن.

باجاریّ وابیّ أوّلی نشأتی (نبی) (آدمە) لە موقعیّ مناسب تر انشا الله قسەی لیّ ئەكەین وە خۆمان لە تكفیری مەلای (حنفی) نجات ئەدەین وە قسەی بیّ أدەبی لە حەق أنبیای عظام ناكەین. ﴿قَالَ ٱهْبِطُوا۟﴾ ج فەیدێە مراد (آدم و حوا) بێفەرمایشی ﴿بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ لەجێی خۆیەتی، عداوەتی بەینی ژن ومێردان (إلى يوم القيامة) مُستمرە. ولاشك حضرەتی (آدم) لەگەلّ ژنی صفوەتی عَیشی نەبووە، لەبەر تَذكّری ما سبق لە عیشی جِنان، دائماً مُكَدَّرو لێك زویر بوین ﴿وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾﴾ بۆ ادم و زەوجی

تا مردن، بۆ أولادی (على سبيل بقاء النوعِ) تاقيامەت ﴿قَالَ﴾ جەنابی حەق ﴿فِيهَا تَحۡيَوۡنَ﴾ لە أرض دا دەژێن ﴿وَفِيهَا تَمُوتُونَ﴾ لە أرض دا دەمرن ﴿وَمِنۡهَا تُخۡرَجُونَ ﴿٢٥﴾﴾ بۆ حشرو نشر. ئەو بەهەشتە بەهەشتی موعودە یاجنَّتێ ترە، حقيقەتی مجهولە، وەنزاعی (معتزلە) و (أشاعرە) مشهورە، بمتوانيبايە قسمێ لە (أصحاحی ثانی) وە تەواوی (أصحاحی ثالث) لە (تورات)م ترجمە ئەكرد لێرەم ئەنوسی تا بزانن چ نوعە خرافاتێكی تێدایە، وە قران لەو نوعە خرافاتە چەند پاك وخاوێنە! (ومع هذا) ئەمرۆش أورپایی پێ ئەڵێن (كتابی مقدّس) سبحان الله (الحكم لمن غلب).﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾ بە مناسبەتی ما جرای (ادەم )وزەجی خطاب ئەكاتە بنی ادەم ﴿قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا﴾ هەرچی لە گەورە بۆ گچكە بێ، تعبير بە هەناردنە خوار بدرێ جوانە. ﴿يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ﴾ جەنابی حەق منّەت دادەنێ بە لباسێكی ستری عورەت بكا، ئەمرۆش بەشر خەريكە لە لباس دەرچێ، (خاصَّةً) خاتونی ئاوروپایی. بەڵێ (سَوۡآتَين) ديار نيە، أمّا دەوران دەوری مكشوفە، بانگی تطّاران ئەكا، گۆييا مدنيەت لە غربە، هەرچی غەربی بيكەن، لای شرقی غبی، وايە عينی مدنيتە. قسمێ لە غربيی خەريكن عەيب و عار لەناو بەشر هەڵگرن، حتّا لەلای ئێمەش فێری منداڵە مكتبليەكان ئەكەن، عيبە عيبە. لە زەمانی جاهليەت كە طوافی بيتيان ئەكرد، خۆيان ڕووت ئەكردەوە بەڕووتی طوافيان ئەكرد، ئەوە لە إسلام تبديل كرا بە (إحرام)، ئەيان گوت بەو جلكی كە گوناهی تێدا كراوە طواف ناكەين. ئەمە إيجابی ئەكرد خۆيان طواف نەكەن، خۆيان گوناهيان كردبو جلكی چی؟

﴿وَرِيشٗاۖ﴾ لباس زينەت، وەك پەری طيری جووان، طاووس و پۆڕ. لباسی زينەت لە أيّامی ئێمە بە دەرەجەێ گەيشتوە، وەقتە عالەم وێران بێ. تبدُّلی أزياء وە مۆدەی غربيان سەروماڵی إنسانی بەبادا، بۆ منعی (إسراف) ﴿وَلِبَاسُ

ﱡﭐ ٱلتَّقۡوَىٰ ﱠ تغیر بکرێ بە لباسێ کە حفظی إنسان بکا لە حرّ و برد و کشفی سوأت، لە هەموو معانێ تر أنسبە.

(إبن عباس) ئەفەرموێ عملی صالح. (عُروەی بنی الزُبیر) خشیەو حسنی حَیا، (قتاد) و (سدّی) إیمان. (زید بن علی بن حسن) (رحمه الله) لباسی حرب، (أبو مسلم) ئەمەی إختیار کردیە، لکن من لام وایە لەو مقامە جوان نیە، مەگەر (حربی مع الشیطان) مُراد بێ، ئەویش سبب وعائدی تقوایە، بەڵێ نظر بە زەمایی وی زۆر مناسبە، وە ئەگەر عام بکرێ مراد پارێزگاری بێ چ مادّی چ معنوی زۆر باشە. أمّا ثیابی صوف، لباسی نسکو تواضع لای من لێرە هەر ناگونجێ با (جبّائی) پەسندی کردبێ، زاتا (معتزلە) هەموویان میّالی عُزلَت ولباسی پەشم زۆرن، أمّا لباسێکی زۆر قابل، من زۆری ناحُبێنَم.

رۆژێ توشی پیاوێ بوم خرارێکی هەردروو بوو لەبەری کردبو، منیش تقدیری بۆنی (تزویر)م لێ کرد، ووتم ئەگەر ئەمە بۆ خوای با، باش بو، زۆر نەچوو گەلێ پێڵاوی دزیاری مزگەوتانی لێ ئاشکرا بوو. ﱡﭐ ذَٰلِكَ ﱠ لباسی تقوا ﱡﭐ خَيۡرٞ ﱠ أمّا لباسی تزویرو ریاو مداهنەو هەڵفریواندن، شەڕە هیچ خێری تێدا نیە.

ﱡﭐ ذَٰلِكَ ﱠ لباس ﱡﭐ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ﱠ بعضێ کە لە أیاتی عَظیمی إلاهی بۆیان بەیان ئەکەین ﱡﭐ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ٢٦ ﱠ تێ فکرن بزانن ئەو لباسە چۆن هاتۆتە ظهور سببی چی بوو؟ تاحەقی خوا و حەقی بەشەر لەسەر یەك بزانن، ئەوانیش بین بە عضوێ عامل لە هیکەلی إجتماعی. إنسان هاتە دونیا رووت و قووت، بادی والبشر، برسی و تینی، بێ هێز، محتاج بە گەلێ شت، محتاج بە معاونەی أفرادی جنسی خۆی لەبەر ناسکی و لطفی مزاج، تحملی ساردی و گەرمی ناکا، احتیاجی مجبوری کرد بۆ تێ کۆشین، لباس وخواردن و سکنای چۆن تدارك بکا؟ بە علم وعمل و قوەتی إنتباه وردە وردە رێی بەئیش و کار برد، لە مُغاران مەسکن، لە گیاو گۆشت خواردن، لە پێستی حیوانات لباس، دوایی

ترقی کرد تاکو بوو بە صاحبی (کارگە)، أمّا محتاج بوو بە صرفی قوەتی خۆی، دائما خەریك بێ، شتی بە قوەت و متانەت دروست بکا تا ئەوەی ئەیکرێ درەنگ احتیاج ببێ، وە بتوانێ بەقەدەری کفافی محتاج إلیه دروست بکات، ئەو وەقتە حالّی بشر زۆر باش بوو، مدنیەت وسط بو لە بەینی إفراط و تفریط. حتّا من بە فکرم دێت بعضە کەس بە ئێمەنی دوروانی دەگوت ئێمەنی باشم بۆ دروست بکە، بۆیە (مَجیدی) یەکی پێ ئەدەم تا سالّێکی لەسەر بخولێمەوە.

کەوایەکیان ئەکرد آقَلاً (٣-٤) سالّ لەبەریان ئەکرد، دوایێ لە سَیِّئاتی ئاوروپا کارخانەی گەورە گەورە دروست کرا أنواعی اَلبِسە لە خوری لە لۆکە لە ئاوریشم بە أشکالی مُخْتَلِفە پەیدابو، لە کەلاش و کالەك بووە قۆندرەی (عَلْ مودە) تا فەن تازی و تَلَفون پەیدا بوو أقمشەی جوان نازك ئەمڕۆ لەبەری ئەکەی سبەینێ ڕەنگی ئەچێ دوایێ لەباریەك دێتەدەر، لە سایەی مَدَنیەتی ئاوروپا عالەم هاوار هاواریەتی. مَقْصَد ئەمەیە إنسان تەماشا بکا ئەوەی عِلّەت و سَبَبە بۆ ئەو نعمەتانە کێ یە؟ أوّلاً خالق، ثانیاً خۆی، کێ ئەو موادە خامانە إیجاد ئەکا؟ خوا! کێ ڕێکی ئەخاو شتی لێ دروست ئەکا؟ بَشَر! کە وابێ خوا بپەرستە حەقی چاکەی بَشَر (أداء) بکە، کەسی تر حەقی لەسەر تۆ نیە! بۆ بوت ئەپەرستی؟ بۆ لەبەر دەستی کەر و گایان ڕائەوەستی؟ بۆ (مَلَك) بە "بَناتُ الله" ئەزانی؟ بۆ بە مُتابَعەی هەواو هەوەسی شَیطانی لەگەلّ ئەم گوزەرانی إنسانی دوشمنی ئەکەی؟ حَیاتی إجتماعی مُکَدَّر ئەکەی؟ بە ثَمرەی عِلم و عِرفان بۆ عالەم زێرو زەبەر ئەکەی؟ حاصلّی حالّی سَوادی (أعْظَمْ) لە بەشەر زۆر سەیرە! ئەوی باش و أمین بێ، نایەوێ، ئەوەی خراپ و خائن بێ، دوای ئەکەوێ، انسانی صادقی ناوێ، بەڕێی راستا شەقاوێ ناوێ، ناوێ . لە ڕەوشتی وا دیارە ڕۆژ بەڕۆژ خراپترە، لای من عاقیبەت غایت وخیمە، مەگەر مُحَوِّلُ الاحوال ڕەحمێ بکا بە بَشَر ڕووی وەرگێڕێ لە فیتنەبازی و سیاسەت و دەسیسە و شەڕو شۆڕ. ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ﴾ ئەو خەریکە بە

هیلاكتان دا توشی مَشَّقت و محنـەتێكتـان بكـا، ڕێ نەبەنـەوە بـۆ جَنَّـة، ئێـوە ئاگـادار بـن، بـەوَسوەسـەی ئـەو مەكـەن ﴿كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم﴾ آدەم و زەوجـی ﴿مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ﴾بە فِتنەی بردن لە بەهەشت دەری كردن، ئێوە مـەهێڵن دەركـەی بە هەشتتان لێ بگرێ ﴿يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآ﴾ لاشك ئەوەی لە أیامی ئێمە طَرَفداری (سفورن) مَقصَدیان هَتكی سَوْاتە، ئەگەرچـی وا ئـەنوێنن كـە خزمـەتی بَشَریەت ئەكـەن، جنسـی لَطیـف لـە أشـارەت و قـەیدو بەنـد آزاد ئەكەن، وە آعضایێ عامله بۆهێكەلی اجتماعی زیـاد ئەكەن لكـنْ خـوا ئاگـاداری مافی الضَمیریانە. وە ئەگەر (سفور)یشیان بە قەدەر (سـفور)ی پیـاوان بـێ، بـە حاڵی طبیعی بێ، پەردە و تواليت وەك ئێمـە بچـنە دەر ئـیش و كـاری خۆیـان بكەن بگەڕێنەوە ماڵ، اَهْوَنە، اَمّا تَعَدّیات زۆر ئەكـەن. خُلاصـە غـَیری داپـۆشنی لِباس شَرفی بَشَری غیرەت و حیا بێ ناموسی چیتریان مقصد نیە.

﴿إِنَّهُۥ﴾إبلیس ﴿يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ﴾ئەو دە جماعەتی ئەو، ئەتان بینن. ﴿مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡ﴾ دوشمنی كَمینن، نایـان بیـنن، خۆپاراسـتن و دِقـەت كـردن لـە خَواطِری نَفسی زۆر لازمە، تَأمُّـل لـە عَواقـب، یَعنـیدوور ئەندێشـەی، بـە حـەق تەماشای مَصْلَحَت و مَفسَدە كردنتان، لازمـە. وە هـەروەها أئمّـەی (سـفور) لـە لباسـێ وانـە، نایـان ناسـن، ئاگـاداری مَنوّیاتیـان نـین، بـە دڵ لـەكین دان، بـە دخواهی دین و دونیان، خۆیان بە طَرَف دار و خێرخواه نیشان ئـەدەن. غـیری رَسول ئەوەی إدعّای دیتنیان بكا درۆیێ ئەكا. رِضوانی خوای لە (شـافِعی) بـێ ئەفەرموێ: (ئەوەی زعم ببا ئەیان بینێ شادو مـانی مَـردودە و تَعزیـر ئـەكرێ. سبحان الله لە فێرومكری بَعضە (سُنّی ) یان سَلبی قُـدرەت ئەكـەن لـە إنسـانێ مُكَلّف بە أفعالی إختیاری خۆیان وە ئەلّێن (جِنْ) إقتداریان هەیە خۆیان مُتَشَكّل كەن بە أشكالی مَختَلِفە ئەگەر بلّێین خوا ئەو قدرەتەی داینێ بـۆ بـۆ إنسـان وا نالێن؟

إنسان ئەبیٚ بە خالق ئەگەر بلێین قدرەتی مؤثرە لە أفعالی سَهل و إختیاری، أمّا (جِنْ) بەو قدرەت و إقتدارە نابیٚ بە خالق، مَعَ أنَّهُ خوا بەو تشکیلاتەی تکلیف نەکردووە.

تَذکّری فەرمودەی (إمامی عُمَرْ) بکە: (اَلْحَقُّ مَعَ عُمَرْ حَیْثُ دارَ). خُلاصە دەوری إعجاز و دەوری خیالّ و أوهام تێپەڕی، دەوری علم و إنکشافی حَقایقە بۆ اهلی علمی ڕاستی.

﴿إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ أَوْلِيَآءَ﴾ قەرین و مُسَلّط کەورەو پێشەوا ﴿لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾﴾ إیمانیان نیە، یا زۆر پەڕپوتە. ئەوەی قوەتی ئیمانی هەبیٚ، شیطان نابێتە (وَلی) ئەو تَسَلّطی بەسەردا ناکا. گەلیٚ جار ئەلێم ئەگەر قرینی سۆی نَفسی خَبیثی (بَیْنَ الجَنبین) مُعاوەنەتی شیطان نەکا، چی پیٚ ناکریٚ، اَمّا وەکی کوردی ئەلّیٚ (دز وساحیب مالّ یەك بن گای بە کولانکەی دا ئەبەنە دەریٚ). نفس و شیطان ئەگەر ڕێك بکەون ئەوەی ئارەزوو بکەن بە إنسانی ئەکەن. ﴿وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَـٰحِشَةً﴾ ئەوەی بیٚ إیمانە، خراپەی ئەکەن لە جەوابدا ئەلێن: ﴿قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا﴾ ئەلّبەتە ابای ئێمە بە خۆڕاییان نەکردیە ﴿وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا﴾ (حدَّثني قلبي عن ربي) شێخ وای فەرموە، شێخ وای کردیە، بەلّیٚ (صدّق)، ولی خوایە لەخوار ویە، کەسیٚ بلّیٚ وانیە، کافری ئەکەن. ئەمەش لە ژێری دایە، أمر بە ابایان، کەوابیٚ ﴿قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ﴾ جەوابیٚ تەواوە. ئەوەی هۆش وگۆشی هەبیٚ ئەزانیٚ ئەمە باشە ئەمە خراپە ئەوە حقە ئەوە باطلە، با ابا و اجدادیشی کردبێتی، باعلما و مشایخی گەورە گەورەش فەرموبێتیان، قابلە بە غلط چوبن. ئەوەی إقتداری هەبیٚ، بۆیە ئەبیٚ، خۆی تیٚ فکریٚ، تیٚ کۆشیٚ، خۆی بەحەق بکەویٚ، نەلّیٚ ئەلّبەتە ئەگەر خوا امری پیٚ نەکردبایەن ابای ئێمە نەیان ئەکرد، ئەگەر دەلیلیٚ حەق نەبایە، ئەوانە وایان نەدەفەرموو.

حاشا جەنابی حەق أمر بە شتی خراپ وبیٚ معنا دوور لە شەرەفی بشری ناکا، بەڵکو قابلە بڵێین قابل نیە. ﴿أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٢٨﴾ نەدەبا وابڵێین. چۆن افترا بە خوا ئەکەن. ئەوانەی إدّعای کشف ئەکەن، لازمە زۆر إحتیاط بکەن، ( مع أنّە) بۆ هەڵخەڵەتاندنی عوام ئەو نوعە إفترایە، أقوای أسلحەیانە. ﴿قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ﴾ بە عدل وإنصاف. هەرشتە حەقی خۆی پیٚ بدریێ ئەوەی لایەقی مقامی(ألوهیّەتی) نەبیٚ، نسبەت بەخوا نەدریٚ، خوا نەهێننە ڕیزەی طبیعیات، ممکنی طبیعی بلند نەکەن بۆ مقامی ألوهیەت (فأقسطوا یابني آدم) ﴿وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ ڕوو بکەنە خوا لە وەقتیٚ سجود وعبادەت، یالە جێی سجدە، یالە مزگەوت. هەر مزگەوتیٚ تووشی بون، عبادەتی خوای تێدا بکەن، مەڵێن ئەمە جێی (حنفیان)ە نابیٚ ( شافعی) نوێژی تێدا بکەن، تفرقە بە مذهب ومحلّە مەکەن! ئەو خطابە بۆ بنی آدم شاملە هەتا ڕۆژی قیامەت. ﴿وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ﴾ بی پەرستن طاعەت وعبادەتتان بە خاوێنی بیٚ ڕوو ڕیاو شرك بۆ خوابیٚ. ﴿كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ٢٩﴾ وەکو أولا خلقی کردینە إنشای أولتان لەویە، گەڕانەوەشتان بۆ لای وییە، نشأتی ثانیتان ئەو ئەیکا، کەسی تر نیە. کیٚ ئەپەرستن؟ بۆ کیٚ ڕوو ڕیا ئەکەن خالصاً مخلصا عبادەتی خوا ناکەن؟ ﴿فَرِيقًا هَدَىٰ﴾ بە أتباعی رسل بە بیانی ایاتی قولی وفعلی. ﴿وَفَرِيقًا﴾ بالمقابلە ئەبایە بفەرمویٚ (أضل) زاتا ئەو (مُقّدر)ە، (زمخشری)،(خذل)ە تقدیر ئەکا، مەبادا بڵێن ئەو (ضلال)ە محض بە خلقی خوایە، أما مع الاسف گوترا ئەو فرقەیە ﴿حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۚ﴾ جێی خۆی بۆ مطابقی حاڵیانە موافقی مەیل ومشرەبیان، ظلمیان لیٚ نەکراوە. ﴿إِنَّهُمُ﴾ ئەوفرقەیە ﴿ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾

شیطانی جن وانسیان کردۆتە متولی أموریان گەورەو مطاعیان تجاوزیان لە خوا کردیە، ڕوو بۆ لای وی ناکەن ﴿وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾﴾ واحساب ئەکەن واتیٚ ئەگەن کە ئەوان لەسەر ڕێی ڕاست بە مقصد گەیشتوونە، باوجودی بەحەق ئەوانە (حقّ عليهم الضلالة)ن. ئەوانە جهلی مرکّبیان هەیە، حەق بەحەق ئەزانن، ئەوانە ئەگەر بالفعل جەنابی حەق قصدو إرادەی ضلالیان بکا، زێدە گومڕاهیان بکا، چ خراپەی تێدایە؟ ئەوەی تۆزیٚ دەرکی جەهلی خۆی بکاتن قابلی إصلاحە زۆر نێزیکە خوا شرحی صدری بکا نوری إیمانی بچێتیٚ نفوذێکی تێدا بکا. أما ئەوەی خۆی بە صاحبی حەقی مطلق بزانیٚ، أدنی شبهە و سفسطە و مشاغبە بکا بە دەلیلی قاطع وبرهانی ساطع قبوڵی إذعانی بکا، قطعاً خوا هدایەتی نادا بەڵکو بە مقتضای خواهش وئارەزووی خۆی أبواب وطرقی ضلالی بۆ ئەکاتەوە، وە حەقیش وایە وابێت، هەر حاڵیٚ کەبوو بە ملکە- لازمی خۆی بۆ ئەبیٚ پێوەی ئەنوسیٚ. ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ﴾ (سیّدی آلوسی) ئەفەرمویٚ جلکیٚ کە ستری عورەت بکا. ﴿عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٍ﴾ مسجدو الحرام وغیری وی، لە طواف،لە نوێژ، کشفی عورەت مەکەن! تفسیرمان ئەوها کرد، چونکی أمر بۆ وجوبە، لباسی چاك و بەشوکت لەبەکردنی (عندَ شيءٍ من المساجد) واجب نیە. لکن (سیّد رشيد) بە ئەوەندە ڕاضی نیە ئەڵیٚ مقام مقامی بیانی شرطی نوێژ نیە، تا اقتصار بکەین لەسەر ستری عورەت، ستری عورەت لای (وثنی)یانیش هەیە، لباسی زینەت هەرکەس بە وسعی خۆی، لە مجامعی عبادەت لازمە،﴿وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ﴾ لە أیّامی حەج وغیری حەج خواردن وخواردنەوە یاخود لزانژ لە خۆتان حەرام مەکەن. شتیٚ پاك وخاوێن ولذيذ وحلال و زلال عافیەت بکەن.بخۆن و بخۆنەوە ﴿وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ﴾ تجاوز مەکەن. بە اعتدال بخۆن و بخۆنەوە، فضل لە تحريمی حلال، لە تَبَسُّط بۆ حرام. ﴿إِنَّهُۥ﴾ جەنابی حەق ﴿لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾﴾ لە هیچ شت. لباسن،

خـواردن، خواردنـەوە، ئـەوی إسـراف بکـا توشـی نـدامت ئـەبیٚ. زۆرمـان دیـت مسرف لە لباس ولذائذ محتاجی پارچە پەڕۆی گوێچکە نانیٚ بـوو. زاتـا اسـراف عالەمی اسلامیەتی خستە دەرکەی ذللەت، تاج وتەختی گـەلیٚ کەسـی بـەتاراج دا. اسـراف لـە (زفـاف)، اسـراف لـە(ختانـە)،اسـراف لـە (موالیـد)،اسـراف لـە (زیارات)، إسراف لە نانی (تعزیە)، اسـراف لـە (لعب)و، (قومـار)و، (مسـكرات) إسراف لە (ژن هێنان)، اسراف لە (جواری وعبید)، وهكذا ئـەمڕۆش اسـراف لـە زیادیە. أمّا اسرافیان لە (خێـر) بـەجیٚ نیـە، بـەڵكو نایکـەن. أمـا اسـرافیان لـە (خێرات) نابەجایە، بۆ مـواقعی نـاڕەوا فـوق الحسـابە. ﴿قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ﴾ لباسی چاك هەرچی تجملی پـیٚ بکـری، کـیٚ حـەرامی کردیـە؟ خوانـەی کردیـە غیری خوا کەسیٚ تر حەقی تشریعی نیە، حتّا رسـولیش ئـەبیٚ لـە مـوارد وحـی إلاهی وەربگریٚ، ولو بە إستنباط بیٚ. ﴿ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ﴾ بۆی هێنانیە دەر لە أرضـی، لـە حیـوانی، لۆکـەتان، ئاوریشـم،خوری، لـە معـادن، زێـڕ و زیـو، ﴿وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ﴾ لذیذ وخاوێن وبیٚ علّەت، کیٚ ئەوانەی حرام کردیە؟ أصـل لە أشیاء، اباحەیە (خلق لكم مـا في الأرض جميعـا) ئەگـەر وجهـیٚ وجیـە نـەبیٚ حەرام نابیٚ. ﴿قُلۡ هِيَ﴾ زینەت وطیبات ﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ بـۆ وانـە ئەوان مقصودن. خۆیان عبدی خوان، ئـەوەی خـوای وان خلقـی کردیـە، حـەق وایە بۆ وان بیٚ، كأنّە إیمان سببە بۆ (إباحە)، موجب نیە بۆ (حرمـەت). (مـالي سيّدي غني عَنْ كُلِّ شَيء)، بۆ عبدی خالصیەتی. ئەوی کافر بیٚ حەقی تصـرف لـە مـاڵی خـوای نیـە، بائەوانـە لـە مخلوقـاتی شُـرکای خۆیـان بخـۆن. خـاك بەدەهەنیان! چی بخـۆن؟ چـی بخۆنـەوە؟ چـی لەبـەر کـەن؟ شـرکیان إیجـاب ئەکرد لە هەموی محروم بن، أمّا وەك (سعدی) ئەڵیٚ:

ادیمی زمین سفرەی عامی اوست

برین خوان بخا چ دوشمن چ دوست.

﴿خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ أهلی شرك وكفر بەشیان نیە. عبادیٚ بیٚ شریكن بیٚ شریك مستفید ئەبن لە نعیمی اخرەت. ئەو تقشُّف وخشونتە، كە ئەیكەن لە لباس وە لەخواردن وە لە مسكن، موافقی أساسیاتی اسلام نیە، ئەو رەبەنەتە لە مسیحیان هاتیتە ناو ئێمە.

ئێمە ئەڵێین: (امام زین العابدین) كسای (خَزّ)ی ئەكڕی بە پەنجا دینار هاوینیٚ ئەیبەخشی، وە ئەو ئایەتەی ئەخوێندەوە، وە ئەڵێین:(پێغەمبەر تشریفی هاتەدەر ڕیدایەكی لەسەر بو قیمەتی هەزار درهەم بو). إمامی (حنفی) إمامی(مالك) لباسی چاكیان ئەپۆشی. إمامی (شافعی) خواردنی زۆر لذیذی عافیت ئەكرد. بەڵیٚ بۆ پادشاهان روأسایی عظام خشونەتی عیش لازمە، نەك تَبَسّط بكەن، وببنە باعثی وێرانی بلاد و هیلاكی عباد، بۆیە خلفای راشدین مبالغەیان ئەكرد، لە خشونەتی گوزەران. ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأٓيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣٢﴾﴾ خوا فطرەتی عبادی خۆی ئەزانیٚ ئاگاداری مەیل وطباع وطبیعیاتە، بۆیە بە گوێرەی فطرەت احكام دائەنیٚ، ئەوانەی بە ظاهری عقلٚ، وضعی قوانین ئەكەن، خاڵی نین لە مەیل و إفراط و تفریط و علی الأكثر حكم بە خلافی طبع ئەكەن. لاشك هەر شرعیٚ هەر قانونیٚ ضدّی طبیعەت بیٚ سەرناگریٚ، رعایەت ناكریٚ طبعاً نسخ ئەبیٚ. أمّا شرعی إلاهی موافقی طبع وفطرەتە لە غایەتی تعدیلە ئەوەی بزانیٚ علمی هەبیٚ، لەو تفصیل وبەرینە إستفادە ئەكا بەڕێی ڕاست وعدل متوّسط، لە بەینی إفراط وتفریط دا ئەڕوا، زینەتی خوایی، طیّباتی رزق لە خۆی حرام ناكا وە بیٚ اسراف و تقتیر ئەپۆشیٚ، ئەخوا، ئەنوشیٚ، بۆ صلاحی دین و دونیا ئەكۆشیٚ. ﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ﴾ لباسی فاخر و رزقی خۆش و پاكی حرام نەكردیە. هەر فواحش گوناهی قبیح زێدە ئەوەی تعلقی بە (عَوْرَت) بیٚ ﴿مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ ئەوەی ئاشكرا بیٚ لە فواحش، ئەوەی بزر بیٚ، ئەمە قانونی إلاهیە، قانونی بشر بوونە.

تخونی خەڵك مەبە، مَحَلی ادابی بە علنی، مەکەنە نهانی! ئەوەی عائدی شخصی خۆتە هەرچی ئەیکەی بیکە (لا بأس)ە! کەسیٚ أساسی تربیەی شخصیەتی أحوالی روحیەی باش نەبیٚ بۆ هیأتی اجتماعی باشوو بیٚ زەرەر ئەبیٚ؟ حاشا ثمَّ حاشا!!

أولا تهذیبی أخلاق، ثانیا تدبیر المنزل، ئەوجا سیاسەتی مدنیە ومعاملاتی إجتماعی عمومی. ﴿وَٱلۡإِثۡمَ﴾ مطلق لە گوناهان با عائدی شخصی خۆت بیٚ! بەڵام زۆر مستکرهو، مُستهجَنْ، و مُسْتَقْبح، وناشیرن نەبیٚ ﴿وَٱلۡبَغۡيَ﴾ ظلم، تجاوز لە حد، تعدّا لە خەڵك. ﴿بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ قەیدیٚ لازمە بۆ بغی (لا ینفك) بغی بە حەق نیە، تا اخراج بکریٚ، بەڵام (سیّد رشید) ئەیکا بە قەیدیٚ إعتراضی أما توجیهی لای (حقیر) وجیە نیە. ﴿وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا﴾ حجەت و برهان و دەلیل قرانی عظیم الشأن چ إعتنائی بە دەلیل و برهان ئەکات؟ حتّا بالفرضِ والتقدیر ئەگەر دەلیل بوو لە شرك دەلالەت بکا کە خوا لە خلق و إیجاد تدبیری عالەم هاوبەشی هەیە، قبوڵە. (بِناءً عَلَیه) ئەو أیەتە موافقە لەگەڵ رای ئەوانەی کە ئەفەرمون، حتا (بیضاویش) لەوانەیە ئەگەر نَظَر مؤدی بوو بۆ کفر، صاحبی مَأجورە، وەك حضرەتی رسالەت پەناه ئەفەرمویٚ: (کەسیٚ اجتهاد بکا وە إصابەی حەقی ببیٚ دوو اجری هەیە. ئەوەی سعی بکا جهدی خۆی صرف بکا وە اصابەی نەبیٚ أجریٚکی هەیە). فەرمودەی ئەوانەش فی الحقیقە لەسەر فَرضی مَحالە.

تنبیە:– رۆمانیی ئەگەر قوەت، وشجاعەت، و قهارەتیٚ خارقیان لەکەسیٚ دیبایە، ملحقیان ئەکرد بە زومرەی آلهە، هەر نەیسە ئەوە فی الجملە معنایەکی هەیە، لکن شرکی عەرەب إتخاذی ئەو (أصنامانە) بە (آلهة) یا (مُمَثِّلْ)، هیچ معنای نەبوو هەواییٚ محضە جهالەتی پووتە. وە شِرکی مُتصَوّفە (وَمَنْ عَلی شاکلَتِهِمْ) ئەگەر تدقیق بکریٚ نوعیٚکە لە شرکی (رۆما) لەوان وەرگیرایە. فلان،

مَظهَری، صِفاتی خوایە، مرآتە. یاخود خوا چویتە ناو زگی، وەك (مَرْیَمە) شأنی أمری (کُنْ فکان)ی داوەتیێ، ئەوانە گەلێ ظالمترن تجاوزاتیان (فَوقَ العادَّە)یە. ﴿وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٣٣﴾ قَولی (علی الله) بێ عِلم، بە درۆ، مصیبەتی گەورە بوو، بۆ إسلام بوە مداری تَسَلُّطی مَردَی (تَشَیُّع) و (شیّخ). سوادی أعظم لە (أمة) دوایان کەوتن، بەو درۆیانە بڕوایان کرد، وەرگەڕان، حتا نەکەڵکی دونیایان پێوە ما، نە کەڵکی دین، بوە مَنشَأي کُفر، أما کُفري بالإیمان، إیمان بە دەستی قدرەتی إلاهی.

ئەتوانێ علمێ وەك علمی خۆی، قدرەتێ وەك قدرەتی خۆی، امری (کُن فَکانَ) بداتە زاتێ خۆشەویستی خۆی. ئەوی إنکاری ئەمە بکا إنکاری قدرەتی خوا ئەکات. ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ﴾ لە امم و، أقوامی مختلفە، عشائر، قبائل و، دووەل و إمارات، ای بە هیلاك چوین، ای حالاً موجودن، ای لەمەودووا ئەبن. ﴿أَجَلٌ﴾ مُدەیەکیان تیا هەیە، ئەو سونەتی إلاهیەش بَیان بکا پی یان بلێ بەڵکو إنتباهێکیان ئەبێ، خۆیان لە هیلاك نجات ئەدەن. عُلَمای (سیَرْ) یەك لەوان (ابن خلدون) ئەفەرمون:( هەروەك شخص لە اولی عمری تا اخری ادواری هەیە، کذا امة ادوار و اطواری هەیە. دەوری نَشأت، دەوری نُما، دەوری إستیلا، دەوری تَوَقُف، دەوری انحطاط دەوری فەوتان، هەروەك مردنی اشخاص أسبابی هەیە، هلاکی قَومیش اسبابی هەیە).﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ﴾ هەر ملتە اجلی بۆ هات لیّی نێزیك بوو ﴿لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ﴾ مُدەیێ، مِقدارێ لەزەمان.﴿وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ٣٤﴾ (مَعَ أنَهُ) لەو وەقتەدا ممکنیانە چارەی خۆیان بکەن، لەو وەقتە پێش کەون بە تەواوی اصلاحی خۆیان بکەن، کأنَهُ أجلیان هێشتا نەهاتوە، یا لەو مُدَّە خۆیان تاخیری اصلاحی خۆیان بکەن کە پێی دەوام بکەن.

ئەو اقوامی کە بە هیلاك ئەچن یالەبەر تَزَهُد وخشونەتی عیش وإنتظاری

مردن و قیامەت ورياضەت وتعذيبى نفسە، ياخود لەبەر فحشيات وإنهماك وإسراف فى الشهوات والّذائذ وە ظلم وشرك وكذبى على(الله) يە. هەردوو نوعە قوم لە إصلاحى شئونى دونيا لە محافظەى ملت و دولت و وطن غافلێ ئەبن. حاصڵى يا بە إفراط يا بە تفريط ئەفوتێن، بۆ رێى وسط ناگەرێنەوە، نەبە اياتى رسل نە بە (نصح)ى ناصحان أهميەت وإعتبار نادەن و ناکەن. ئەو جا يا بە عذابىسماوى يا بە تسلّطى إعداى أقوامى قوى مەحو، نابودو، پەرێشان وأسيرو، زەليل ئەبن. گەلێ قوم يا لەبەر إعتقادى دينيان (ئەمە إرادەى خوايە ئەبێ وابێ، مقابلەى قدرەت و إرادەى خوايى ناكرێ، خوا لەسەر هەموو شت إقتدارى هەيە، ئەگەر حەزى كردبا ئەوانەى دفع ئەكرد ئێمەى نجات ئەدا).

يالەبەر كسالەت وعطالت وبێ غيرەتى وبێ همەتى وبێ دەمارى بەو ذللەتە راضىئەبن بەڵكو أولفەت بە ذلّت ئەگرن، نفرەت لە عزّەت و شەرەف ئەكەن. ئەوانە أصلاً علاجيان نيە بەصورەتى قطعى محكومى إنقراضن. بعضێ لەزەمانى أسارەتيان ئاگرى غيرەت وقەوميەت لە دڵيان گرئەخوا كە يادى مجد وشەرەفىأسلاف خۆيان ئەكەن، پێچ ئەخۆنەوە، يەك ئەگرن بە تدابيرى حسنە، بە سعى وكۆشيش، بە إتحادو إتفاق، لە ژێر نيرى أسارەت دەرئەچن، نائلى شەرەفى رابوردويان ئەبن. وەك حەربى (صرب و قەرەداغ)،(يونان) (بلغار)، (رۆمانيا) مدّەيێ ژێر دەستى عثمانى بون، عاقبەت نجاتيان بوو. وەئێمە ديمان يەكى يەكى لە أزمنەى قريب، إستقلالەيتيان ساندوە. حتا دەوڵەتى عثمانيان مغلوب كرد. ئەى عشيرەتى نجيبى قريش! ئەى قومى نجيبى عەرەب! ئەى كوردى پر نجابەت! ئەى سائرى عناصرى إسلام! ئەى بنى آدم! أقوامى زەليل! تێ فكرن هەم لە ئايەتى قران هەم لە ئايەتى أكوان تێ كۆشن دڵتان لە عقائدى باطلە صاف كەن، روو لە مدنيەتى (فاجرة) وەرگێرن، رووكەنە مدنيەتى فاضلە، تاكو رَمَقَكتان ماوە، بەڵكو إعادەى صحت ئەكەنەوە. مع الاسف قومێ لە عناصرى إسلام كە إنتباهى بوو، بۆ نجات سعى كرد، وا ئەزانێ

تا لە دینی إسلام دەرنەچیٚ نائلی مەرام نابیٚ، ئوٚبار بـە ملـی مـەلایان، شـیٚخان دینی إسلامیان لە ئەساسی فطرَت تیٚك دا بە عقائدی مُزَخرَفەی ثقیلە پڕ لە غل و غش مسلّمانانیان لە ئوجی عیزت هیٚنا حضیضی ذلت.

إنسان إختیاری نیە، هەرچی هەیە بە محضی إرادە و خلقی خوایە، رابطە لە بەینی کائنات نیە، مؤثر لە صفحەی کائنـات مفقـودە، ئـەمڕۆ، سـبەی قیامـەت دادیٚ، دونیا پیٚنج و دوو ڕۆژیٚکە، ئەمرین، سعی بۆچیە؟بە هیمـەتی مشـایخان، بە کرامەتی أولیایان ئیشمان چاك ئـەبیٚ! (عیسـی) دیٚتـە خـوار لـە ئاسمانـان، مهدی ظاهر ئەبیٚ، ئەوسا دونیا ئەبیٚتە هی ئیٚمە، کافر نامیٚنن. ئەمڕۆش لەسـەر ئەو هەموو آیات و عبرە ئاگادار نابنەوە (إن الله لا یغیر ما بِقَوم حَتی یُغَیِّـروا مـا بأنفسهم) حاشا دەست لە إعتقاداتی باطلە هەڵناگرن، ولیٚ خوٚیان لە عداوەت و غل وغش پـاك ناکەنـەوە. ئەگـەر کثـرەتـی نفـوس سـعەتی أراضـی رەقابـەتی دوەلی نەبایە، ئەمڕۆ ئەو بقیەی باقیەش نەدەما (إنا لله وإنا الیە راجعون).

فوائد:— عمری أمم و دوەل بە چەند تقدیر ئەکریٚ؟ گەرچـی ( إبـن خلـدون) تقدیری کردیە بەقەدەر عمری طبیعی شخص، أما وانیە، وە (إبن خلـدون) لـەو تقدیرە معذوورە، زیٚرا لە ازمانی سالفە چەند دەولەت تشکیلی کردوە وە أکثری نەگەیشتیتە صەد ساڵ فضل لـە عمری طبیعـی، حتـا پـاش (ابـن خلـدون) لـە افریقا، لە هندستان، لە افغانسـتان، لـە إیران، لـە تورکسـتان، چـەند دوەل و، أمارات ظهوریان کرد مستولی بون، بە مدّەییٚ کەم، أدواریان تەواو بو، فەوتان. (أجل) یەکە یان دوو؟ (أشاعرە) و (معتزلە) بەڵکو (حکیم)، طبیعـی لـەو نوعـە مسائلە (معتزلی) حکمیان لە حکمایان وەرگرتـوە، خوٚیـان صـاحبی رأی نـین. لەو دوو قولە کامیان صوابە؟ جواب مشکلە! چونکی هەریەك تەماشای وجهـیٚ ئەکا، غیری وجهی نظری آخر، یەکی تەماشای علمی أزلـی إلاهـی ئـەکا، یـەکی تەماشای أسباب وعِللي ظاهرە ئەکا، لاشك حیوان، إنسان کلّی آن قابلی مردنە، کەواقعیش بو، جاریٚ واقع ئەبیٚ، ئەگەر ئەو شخصـە لـەو آنـە دا نەمردایـە بـەو

عللەتە ئایا ئەژیا؟ یا ئەبا هەر بمریٚ؟ جەوابی قطعی زەحمەتە، ظاهری أحوالی لە صحّەت وعافیەت وقوەتی کافی، بە قوەت ئەبینی کە ئەژیا!

ئەمرۆ علمی بشری زۆری تەرەقی کردیە،چاك وایە تەماشای ئاثاری علمی بشری بکەین، تاکو ئێمەش ببینە بشر.

علمی ازلی چۆن تعلّقی کردیە؟ لە لوح المحفوظ چۆن نوسراوە؟ (يَمْحو الله ما يشاء ويُثْبِت) چۆنی ئەکا؟ لە ئێمە مجهولە!!! تا واقعە نەبیٚ، نازانین، نازانین علمی إلاهی چۆنی تعلّق بەو مسألە کردیە.

(حکیم) تەماشای قوەت وآلەتی حافظە وصرفی قوەت ئەکا، بەو گوێرە مدّە دائەنیٚ بۆ تەواو بونی قوەت، أمّا ئەگەر إسراف بکریٚ لە صرفی قوەت، یا آلەتێکی بشکیٚ حفظی قوەتی پیٚ نەکریٚ، مدّە کەمتر ئەبیٚ.

بە واسطەی (طبّي) ڕاقی گەلیٚ أمراضی فتاکەیان تەهوین معالجەیان ئاسان کردوە. حتّا ئەمرۆ معارضەی وەباو، طاعون ئەکەن، أجنّە ومکرۆبی أمراضیساریە ئەکوژن، بشر لە صحّەت وعافیەتی عمومی دا إدامەی حیات ئەکا.

خلاصە: بۆ ئێمە سعی وتێکوشین وکشفی أسراری طبیعەت. خوا ئەوەی ئەیکا، خۆی ئەیکا، عائدی خۆیەتی، سعتی علم وقدرەتی إلاهی نەکەینە مانع وعائق، بیکەینە پێشڕەو بۆ سعتی علم وقدرەتی بشری وتێکۆشین.

بنا بە تقریری بعضیٚ لە (حکمای) غرب تا ئێستا کەس بە أجلی طبیعی نەمردیە، هەموی إخترامە، ناصاعیش وەك کوشتن وسوتانە. مردنی طبیعی آخر دوری حیاتە وەك نوستن بۆیە خەبەری ئەبیٚ مریح بیٚ نەك مؤلم. ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ﴾ ئەو ندایانە پاش پەیدابونی خلقی آدم وپەیدابونی أولادیەتی، بۆیە خوا نداء ئەکا بۆ هەر قەومیٚ، بە عنوانی (بني آدم). ﴿إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ﴾ لە غیر نابیٚ. ئەگەر لە خۆتان پێغەمبەران هاتنە سەرتان،لاتان. ئەو (إمّا)یە ئەفەرمون إشارە بۆ جوازی إرسالی رسل، یعنی واجب نیە وەك معتزلی ئەلێن. ﴿يَقُصُّونَ

عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي﴾ أحكام وشرايعی إلاهيتان بۆ ئەنوێنن خەبەرتان ئەدەنێ، بۆتان بيان ئەکەن ﴿فَمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ لە کفرو سێئات بە زەریفی إیمانی هێنا. ﴿وَأَصۡلَحَ﴾ عملی خۆی إصلاح کرد، أعمالی چاکەی بەجێ هێنا، ﴿فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ۝٣٥﴾ نەترسیان لەسەر، نە بێ کیف ئەبن. لە عذابیدونیاو قیامەت لە إنقراض وأسارەت وزەلیلی وڕەزیلی محفوظ ئەبن. ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ إیمانییان پێ نەهێنا. ﴿وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ﴾ قبوڵیان نەکردو گوتیان ئەو تکلیف وتکلفە بۆ ئێمە نیە، ئێمە شتێکی ترین، رسل بۆ عوامە، ئێمە لە سەرآمەدانی علم وحکمتین، لە أنجاب وأشراف وعظماین. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ (نار)ی دونیاو آخرەت (نار)ی ذلَّت ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ۝٣٦﴾ مادام وانە، لێی ناچنەدەر. ﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ عمداً بڵێ خوا وای فەرمووە، ئەمە حکمی الهەیە، ئێمە رأساً، أحکام لە (حَيٌّ قَيّوم) وەرئەگرین، ئێوە لە مردیان. ﴿أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ﴾ إفترا نەکات، أما تکذیبی آیاتی خوداوەندی بکا بڵێ وانیە ئەمە هیچ نیە هەڵبەستراوە، إفترایە بەخوا کراوە.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە ﴿يَنَالُهُمۡ﴾ ئەیانگاتێ. ﴿نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِۖ﴾ لەوەی بۆیان نوسراوە، لە ڕزق لە مُدَّیکا کە لەسەر مسرحی دونیا نەختێ یاری وگەمە ئەکەن. ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا﴾ أکثر بە رُسُلی (موت) تفسیری رُسُل ئەکەن، لەبەر ربطی(حَتّی) بە (ماقبل)ی، أمّا لە (حَسَنْ) روایەتە تفسیری بە (ملائکە)ی حشر و حساب. ئەو ملائکەتانە ﴿يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ﴾ حەق وحسابیان تەواو ئەکەن پێ یان ئەکەن بۆ (نار)ی (جَهَنَّم) سوقیان ئەکەن، حقا ئەو تفسیرە لەگەڵ ﴿قَالُوٓاْ﴾ رسلەکان پێ یان ئەڵێن ﴿أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ﴾ لە

کوێن ئەوانەی عبادەتتان ئەکردن، لە دونیا هاناتـان ئەبردنـە بـەر،متجاوز بـون لەبـەروان لەخوا،نـەتان ئەپەرسـتی؟ بـە أمیـدی شـرکاو شـفعاتان لـەوی نەدەترسان!!! زۆر موافقە، وەنهایەتی نَیْلِي نصیبی دنیوی نظر بە بقای نوع، قیامی قیامەتە. ئەوەی تفسیری بکا بە (ملك الموت) و (توفاه) بەروح کێشـان، إحتیاجی هەیە بە ماوەیەکی درێژ، لە مردن تاقیامەت تامَجْنیـان وقولیـان پێـك کەون. ظاهری تفسیری (رشیدی) ئەو قسـە لـەوەقتی روح کێشـان ئـەکرێن،أمّا ئەگەر بە دقّـت تماشـای بکـەی خـۆی نیـە ﴿قَالُواْ﴾ لـە جـواب دا ﴿ضَلُّواْ عَنَّا﴾ لێمـان بـزر بـون نـازانین لـە کـوێن. ﴿وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ شـاهدیان لەسـەر خۆیان دا إقرار وإعترافیان کرد. ﴿أَنَّهُمْ كَانُواْ﴾ لەدونیایێ ﴿كَٰفِرِينَ ٣٧﴾ خۆمان ئـەمانزانی لـە عنـاد وتکبّـر وحُبّـی ریاسـت وشـهوات وإسـتلای أعـراض وأمـوال وأنفسی عوام، حەقمان بزر کردوە ﴿قَالَ﴾ جەنابی حەق رأساً یـا بـە واسطەی (ملـــك) ﴿ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ﴾ لەگـــەڵ أقـــوام وطوائـــف وقبـــائلێ. ﴿قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم﴾ رابردبوون لە پێش ئێوە، ئەوانە ﴿مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ﴾ کافرەکانیـان ﴿فِي ٱلنَّارِۖ﴾ بچوونە ناو ئاگر ﴿كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ﴾ تـابع ومتبـوع، یـا متبـوع وەکـو (أبو مسلم) ئەڵێ. ﴿لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ﴾ خوشکی خۆیان نظری خۆیان، کلّی بە وجهێ لعنیان لەوی دی ئەکرد، یا أمّتێ مؤخّر لعنی لـە أمّتێ مُقّدم ئـەکرد. ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا﴾ هـەمویان خربونـەوە گـردبونـەوە لـە ئـاگری دا ﴿قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ﴾ خلف لـە حقـی سلف متبـوع لـە حـەقّی تـابع، ئـەوی دوایێ ئەچێتە ناو ئاگر. دیارە قادەو سادەکان پێشدان جهنّم مُشرّف ئەکـەن، ئـەوجا مَرأسەکان داخـل ئـەبن ﴿رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا﴾ ئێمـەیان گـومڕاە کـرد ﴿فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا﴾ دوو چەندانە، یەکێ مقابلی ضلالیان، یکێ مقابلی إضلالیان ﴿مِّنَ

﴿ٱلنَّارِ﴾ عزابێ کە لە ئاگرەوە بێ. ﴿قَالَ﴾ جەنابی حەق ﴿لِكُلٍّ﴾ (منكم) تابع ومتبوع ﴿ضِعْفٌ﴾ ای متبوع دیارە ای تابع لە قولی متبوعان وەرئەگیرێ ﴿وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾﴾ نازانن کە ئێوەش إستحقاقی ضعفتان هەیە، خۆتان بە معذور ئەزانن وەمعذوریش نین ﴿وَقَالَتْ أُولَىٰهُمْ لِأُخْرَىٰهُمْ﴾ کە جوابیان بیست ﴿فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ﴾ لە جهەتی کە متری عذاب. زێرا دەرکەوت ئێوە بەهەوەسی خۆتان تابعی ئێمە بون. ئەگەر أمّە إتفاق بکا رئیس چی پێ ئەکرێ؟ حتّا شیطان ئەڵێ من لەسەر ئێوە قوەتم نەبوو، ئەوەندە بوو بانگم کردن، ئێوە دوام کەوتن. ئەتوانم بلێم سیّئاتی رؤساء علی الإطلاق لە أتباعە.

﴿فَذُوقُوا ٱلْعَذَابَ﴾ (مُضاعفَةً) وەکی ئێمە. ﴿بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٣٩﴾﴾ بەمەیل ومحبەت وإختیاری خۆتان دوای ئێمە کەوتن تقویەی ئێمەتان کرد. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا﴾ ئەو آیاتی کە رسل بۆیان ئەفەرموون ﴿وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا﴾ لەبەرە تَکَبّر وتَجَبّرو خود پەسندید، إحتقاری رسل وایاتیان،لە ایات دوور ئەکەوتنەوە ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ﴾ دەرکەی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوە (ملکوت)ی سماواتیان نیشان نادرێ، تابزانن چ نظامێکە چ صنعتێکە بە چ صانعێ بدیع ئەو بدایعە إیجاد ئەکرێ،ترتیب ئەدرێ، بێ فکرو،خیاڵی صحیح ئەمێننەوە وەك حوشترو، بهائم نازانن ئەو علویّاتە چ أیات وأسراری تیایە.

﴿وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ﴾ بهائم وچونە بەهەشت؟ ممکن نیە ! ﴿حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ﴾ عرض کران-کورد بە هەموی ئەڵێ (حوشتر)- (جمل) لای (عرب) زۆر خۆشەویستە دائما لە خیاڵیانە ئەوندەیان لەبەر چاو گەورەیە کردویانەتە (ضرب المثل)ی گەورە، (مع أنّە) تەماشای ناکەن،چۆن خلق کراوە. ئەوانە ناچنە بەهەشت، تاکو حوشتر نەچێتە ناوکونی دەرزی، کە (مثل)ە لە تەنگی.

خۆ ئەوە محالە، کە وابێ چۆنە بەهەشتی وانیش محالە .لاشك باریك بونی (جَمَلْ) وەك دەرزی فراوان بونی کونی دەرزی کە (جَمَل) جێی تیا ببێتەوە، محالە، زێرا تخلّل وتکاثُفیش دەرەجەی هەیە، بعضێ مناسبەیان لە بەینی حوشتر وکونی دەرزی نەدۆزیوەتەوە، حەز ئەکەن (جمل) بکەنە (حبل) حبلی سفینە، وەچەند قراءتی هاتوە هەمووی بە معنای (حبل)ە. (إبن عباس) (إبن جرير) (مجاهد) (عکرمە) (شعبی) بە ضمّي (جيم) وفتحی(ميم)ی مُشدَّديان خوێندۆتەوە (جُمَّل) وەکی (قُمَّل) وەهەم (إبن عباس) و (إبن جرير) وكذا (عبد الكريم) و (حنظلة) بە ضمّي (جيم) وفتحي (ميم)ی مخَفّفيان قراءَت فەرمووە، (جُمَل) وەك (نُفَر) دیسان لە (إبن عباس) نقل کراوە ضّمي (جيم) وسكوني (ميم) وەك (قُفْلْ) وە (جُمُلْ) بەدوو (ضَمَّة ) وەك (نُصُب). (أبو سمّاك) بە فتحی (جيم) وسکونی (میم) وەك (حَبْل). لكن مناسبەی ئێرە لەبێ مناسبەییە، بۆیە لەگەلێ حالّی وان زۆر مناسبە. ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾﴾ أصلی (جُرْم) لێ کردنەوەی میوەی نەگەیشتوە میوەی نەگەیی ئەگەر نەخورێ خۆی بە فساد ئەچێ، ئەگەر بخورێ نەصاغی ئەدا ■■■ بە فساد ئەبا. ئەوەی ئیشی نا بەجا بکا لێی ببێ بە (خوو) بەو نوعە خوا جزای ئەداتەوە ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ﴾ فرش. أمّا چ فرش! لایەقی متکبّران ﴿وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾ پەردە، پەردەی ئاگر خلاصە ئاگر إحاطیان پێ ئەدا. ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾﴾ جمهوری مفسّرین، حتّا (سيدين) ئەفەرمون ئەوانەی تکذیبیایات بکەن، ایاتی إلاهی بخەنە پشت گوێیان، دەرکەی ئاسمان بۆ أعمال وأرواحیان ناکرێتەوە، بۆ مسلّمانان کە مردن، دەرکەی ئاسمانان ئەکرێتەوە، أرواحی پاکیان بلّند ئەکرێ، تاکو ئەچێتە ئاسمانی حەوتەمین، کافر نە عَمَلیبلّند ئەبێ بۆ ئاسمان،نەبەرەکەتی بۆ دێتە خوار، أمّا مؤمن عملی بۆ ئاسمان ئەچێ لە ئاسمان بەرەکەتی بەسەردا

ئـەبارێ. (ئـيتر خـۆت مختـاری، كاميـان قبـولّ ئەكـەی، قبـولّی بكـە!!!).
﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ به اياتی خوا ﴿وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ زاتا إيمانی بیّ عملن زۆر قيمەتی نيـە. ﴿لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ﴾ جملـەی معترضـەيـە، أمّـا زۆر بەجیّ يە. هەر ئەو كەسە بەحالّی خۆی بە وسعی خۆی ئەوەی بۆی هەلّكـەوت لە چاكە بيكا، نەك هەرچی چاكە، ئەبیّ بيكا، ئـەوە لـە دائـرەی إمكـان دانيـە. ئەوانە دەركەی ئاسمانيان بۆ ئەكرێتەوە لە علـوم ومعـارفی (تَرَقّـي) فكريـان لـە أفلاك حركە ئەكا، دقايقی صنعی إلاهی (بقدر الوسـع) دەرئـەخا. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ﴾ خۆيان صاحبن مـالّی خۆيانـە. ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٤٢﴾ دەرناچن ﴿وَنَزَعۡنَا﴾ هەلّمان كەنـد دامـان ڕنـی ﴿مَا فِي صُدُورِهِم﴾ لـە دلّيـان دا ﴿مِّنۡ غِلّٖ﴾ حقد،عداوەت،حسد،إستكبار. لای (حقير) ئەو نزعە لە داری دونيايە وە لەحەق (رسل)ە، نەك لە حەق يەكو نزعـی فی الجنّـە، يـا لـە محشـرو معنـای ايەت (ونزعنا ما في صدورهم من غل إخوانـا علـى سـرر متقـابلين)يە، سـبب بـە خاوێنی دلّيان لەحەق (رسل) چاوی دلّيان كراوەتەوە،اياتيان بيسـتوە ،أبـوابی سمايان بۆ كراوەتەوە،إيمانیّ خالصيان هێناوە، أعمالی باشيان كردوە، نـائلی ئەو دەرەجە عاليە بوين. ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ﴾ لـە ژێـر قصـورو باغاتيـان، ڕوبارەها جَريـان ئـەكا ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا﴾ ئـەوەی ذكركـرا لـە إيمان وعملی صالح بـەو واسـطە نـائلی ئـەو نعمـە بـوين. ﴿وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ﴾ إنسـان هەرچـەند عاقـلّ بـیّ بـە تـەواوی ڕیّ بـە مقصـد نابـا، بۆيـە (معتزل)يش ئەلّێن: (بشـر إحتيـاجی بـە رسـل هەيـە، ولـو عقـلّ حـاكميش بـیّ بەلّكو لەبەر إختلافی عقول وميول بعثی رسل، لە ضروورياتە بۆ هدايـەتی بشـر). ﴿لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ﴾ بالخاصە ئەو اعترافەيان وە تـەذكّرو تَشَـعُّری ئـەو

نعمەتەیان لەگەلّ مختاری ئێمە زۆر مناسبە. ﴿وَنُودُوٓاْ﴾ لە طرف حضرەتی باری ﴿أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ﴾ ئەو بەهەشتەتانە ﴿أُورِثۡتُمُوهَا﴾ انّە میراتە، ای کافرەکانیشتان دراوەتیّ، یاخود پێتان عطا کراوە. ﴿بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾﴾ رەنگە (اشاعرە)ی خۆمان ئەوەیان زۆر پیّ ناخۆش بێت خوای تعالان مقاوەلەی لەگەلّ عبادی خۆی کردیە، روح ومالّ لە ئێوە، بەهەشت پیّ دان لە ئێمە، إیمان و عملی صالّح مستلزمە بۆ دخولی جَنَّة، هەروەك كفر وفجور مستلزمە بۆ دخولی (نار). (معتزلی)ش إنکاری فضلی إلاهی ناکەن (الحَسنة بَعَشْرِ أمثالِها) عَینی فضل و كَرَمە، عبد حەقی لەسەر خوا هەیە، أما حەقی ذِلّ و فَقْرو مَسْكنەت، نەك حەقی عزو قهرو غلبە. ﴿وَنَادَىٰٓ﴾ ظاهر وایە ندا یەکیان پاش سرورو صبوری بیّ کە دوای ندای حەق بۆیان حاصلّ بووە. بانگ ئەکەن ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ﴾ ورثەی بەهەشت. ئەو ندایە ثابت و مُحَقّقە وەك شتیّ رابردوو، بانگ ئەکەنە ﴿أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ﴾ بۆ إظهاری شَماتە و حَسرەت پێدان ﴿أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا﴾ لەسەر زبانی رسل ئەوەی فەرموویان لە وعدی إلاهی، پێی گەیشتن نائلی بوین ﴿فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ﴾ لە خِزی و عذاب و هَوان ﴿حَقّٗا﴾ پیّ یان گەیشت.

ئەوانە لەبەر بیّ مبالاتی، انە وعیدی إلاهیان بە وعد زانیە، زاتاً إیمانیان بە وعدو وعیدی نەبووە.

﴿قَالُواْ نَعَمۡۚ﴾ پێمان گەیشت چێشتمان. ﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ﴾ بانگی کرد بانگ دەریّ ﴿بَيۡنَهُمۡ﴾ لە بەینی أهلی جحیم، مقابلی ندای أصحابی جنان، ئەگەر (بَيْنَ الفریقین)با، ظاهر وابوو بفەرمووێ (بَيْنَهُما). لام وایە (سیدی الوسی) لێرە إنصافی نەفەرموە. چیان ووت؟ ﴿أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾ (علی الدوام بلا

إنقطاع). ﴿ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ﴾ منعی خۆیان یا خەڵکی ئەکەن ﴿عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە ڕێی خوا ﴿وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًا﴾ طلبی خواری، خوارکردنی، ڕێی ڕاست ئەکەن، ذمی ئەکەن، إلقای شُبهات ئەکەن، بە إلقاآتی شعریە تشویە ئەکەن، لەبەر چاوی خەڵکی ئەخەن. لاشك خواری لەگەڵ ڕاستی ڕێك ناکەوێ.

(سبحان الله) بشر کەی بە ڕاستی بە ڕێی ڕاستیدا ئەڕوا؟ أکْثَرْ ئەبێ خوارەکەێك و پێچەکەێکی بۆ بکەی، ئەوجا قبوڵی ڕاستی ئەکا، بۆیە مزخرفات و خرافات وغلّ وغش ئەکەوێتە ناو دین، حەق بە نوعێکی لێ دێ، قابلی تصفیە نابێ. ڕۆژێ ئەو شعرەیان خوێندەوە

(ڕاستی موجبی رضای خوداست

کس ندیدم کی گم شده ازرهی راست)

باوکم فەرموی: (ڕاست ئەکا، کەسی نەدیوە بەڕێی ڕاستدا بڕوا، تاگوم بێ).

﴿وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ۝٤٥﴾ کفری بالآخرة إطلاقی عنان ئەکا بۆ هەمو فحشیات و سیئات، وە گوناه زۆر بەتام ئەکا، بێ خَطَرە، بێ کَدَرە، بێ ترسی وجدانی و بێ ألمی ضمیرە. ﴿وَبَيۡنَهُمَا﴾ (فریقین) اصحابی (جنة) و اصحابی (نار) ﴿حِجَابٞ﴾ هەر چەند عظیم بێ نابێتە مانع لە وصولی نِداء. ئەمڕۆ لە سایەی علمی اهلی هونەر بە (تەلەفۆن) لە ئەمسەرو ئەوسەری دونیا بانگی یەك ئەکەن ،وەئەبینێ بە (تەلەفزیۆن) صورەتی یەکیش ئەبینن. بە (مکرفۆن) چەند هەزار کەس گوێ یان لە بانگی بانگدەرانی نوێژ ئەبێ، وە بە (ڕادیۆ) گوێ یان لە دەنگی قرآتی قرآن خوێنان ئەبێ لە شارەکانی زۆر دوور. چەند خۆشە! کە (شێخ محمد رفعت) ( امیر القُرَّاء ) کە قرآن ئەخوێنێ لە إذاعەی (قاهرە) ئێمە لێرە لە شاری (کۆیە) گوێی بۆ ئەگرین، حقا ئەگەر بڵێین قراءتی ئەم (شَیْخە) موافقی قراءتی واقعی قرآنە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ). وە (ساریە) و لەشکری لە (إصْطَخْري) فارس گوێ یان لە فەرمودەی (إمامی عمر)

بۆ لەسەر منبری مدینە کە فەرموی (یا ساریَةُ الْجَبَلَ الْجَبَلَ)! (فما ذلك في الدارِ الآخرةِ على اللهِ بِعَزيز) ﴿وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ﴾ ناشُکری نەبێ پیاوێ نەبوو، بچێتە سەر ئەم (أعرافە) بزانێ چیە، وە خەبەرمان بداتێ ئەو رجالانە کێن؟ ولو بە (عنوان)! تاکو بیان ناسین. حتا بعضێ تفسیری بە (معرفە) ئەکەنەوە، بعضێ ئەڵێن نفسی (صراط)ە، (ومن العجایب) بعضێ ئەڵێن (جبل ی أحُد)ە وە حدیثیکی نقل ئەکەن (إبن جریر) نقلی کردوە، وە (سید رشید) باسی لێ نەفەرمووە، ئایا ئەو قائلە آیەتی (یسئلونك عن الجبال)ی لە یاد نەماوە؟ یاخود (أحُد) إستثنا ئەکا لە نَسْفاً؟ یا ئەڵێ جمع نایگرێتەوە؟ طبیعی ئەتوانێ حدیثی لەسەر بێنێ! خۆزی قائلی ئەو نوعە قولانە بناسرابان تا بمان زانیبا لە چ طَبَقەێکی دان. ئەگەر بنۆڕینە معنای لغوی دەرئەکەوێ، جێگایەکی بلندە، ئەوانەی لەسەر وین اهلی (جنّە ونار) ئەبینن ﴿یَعۡرِفُونَ كُلَّۢا﴾ لە فریقین. ﴿بِسِیمَىٰهُمۡۚ﴾ بە علامەتیان ئەیان ناسن ئەو نیشانانە چین؟ (دوای بیانیان ئەکەین). ئەو رجالانە کێن؟ أنبیای عظامن؟ نەخێر! علماو فقهان؟ نا! خصوصی (عبّاس) و (حمزة) و (علي) و (جعفر)ن؟ خێر! عدولی قیامەتن؟ لا! ئەوانەن بێ إذنی باوکیان چوینە (غزا) لەرێی خوا کوژراون؟ کلاّ! ئەوانەن کە یەك لە داك وباب لێیان راضین؟ حاشا! قەردارن؟ یۆك! أهلی فترەتن؟ نەی نەی! أولادی مشرکین؟ هایهو دوورە! أولادی زینان؟ خیلێ خیلێ دوورە! ملائکەتن؟ ئەوەی پیاوبی ئەمەی نالێ!! ولو پیاوێ وەك (أبو مسلم) إختیاری کردبێ هیچە! مساکنی جنّتن هەی هەی! (ئەوانە پاش نجات بونیان لە (جحیم) ئەخرێنە بەهەشت و وایان ناو ئەبن).

ئەو ماجرایە وەك (إبن جریر)، وسائری مفسرین وەك (سَیّدَین)، پێش دخولی (دارین) وجماعتێکن لە أهلی إیمان حسنات وسیّئاتیان مساویە، موقوفن لە جێگایە، دوایێ جەنابی حەق لێیان خۆش ئەبێ بە محضی مرحمەتی خۆی ئەیانخاتە بەهەشت. خۆ ئەو قسە بە قووەتە جمعێ لە صحابە وتابعین وایان

فەرمووە بەڵێ من ئەوە إنکار ناکەم باجمعیّ هکذای لەسەر (أعراف) بن خوایە محضی کرم، بیّعذاب دان داخلی جنّتیان بکا، بەلاّم لام وایە لەم آیەتە ئەوانەش مراد نین. ئەدی ئەوانە کیّن؟ (دوای عرض ئەکریّ). ﴿وَنَادَوْاْ﴾ أصحابی أعراف ﴿أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ﴾ گەورەکان. دیارە ئەم گفتوگۆیە لەگەڵ هەموو بەهەشتیەکان ناکریّ. ﴿أَن سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ﴾ دوعایە، یا اخبارە.

﴿لَمْ يَدْخُلُوهَا﴾ حالاً نەچوو بوونە ناو(جنّة) یعنی (أحد الأصحابین)، یا هەردووك. ئەوە شاهدە وەك باسمان کرد ئەو مباحثە لە (عرصات)ە. ﴿وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴿٤٦﴾﴾ (حسَن) و (أبو علي) تفسیری (طمعیان)، بە (یقین) کردیتەوە، وەك (طمعی) حضرەتی (خلیل الرحمن)، لەبەر ظاهری طمع وە لەبەر ﴿وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَٰرُهُمْ تِلْقَآءَ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾ دیارە ڕەغبەتیان نیە تەماشای (جهنّمیان) بکەن، چاویان لە أهلی (جنانە) پیّ یان خۆشە هەر تەماشای ئەوان بکەن. ﴿قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾﴾ لەگەڵ وانمان کرمەکەوە، لەناو ئاگری ئەو جمعە نامبارەکە. ئەڵێن رجالی (أعراف) ئەوانەن بە حسنات لە (نار) تیّ پەڕیون، بە سیّئات نەگەیشتونەتە (جنّة)، أمّا ئەوە سەهلە گەرچی (سیّدَین) إختیاریان فەرموە، ئەو مقامە مقامیّ هائلە جیّی إنتظارە هیبەتی (کبریائی) إستلای کردیە، هەر کەسیّ بیّ، حتّا رسلی عظام کە چاوی بەو گروهە کەوت، ئەو دوعایە ئەکات، (مع أنّە) بعضیّ ئەفەرمون مقصد دوعا نیە، إستعظامی حاڵی ظالمانە. ﴿وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلْأَعْرَافِ﴾ عینێ ئەوانەی لەسەر أعرافن وئەوانەی جمعیّکن لە أهلی توحید وإیمانی قوی. لە أوائلی رسالەت إیمانیان هیّناوە، ئاگایان لە حاڵی فقراو ضعفایەکانی مؤمن وحاڵ وحکایەت و(همز)ەو (لمز)ە وکوشتن وبرینی بەدەسەلاّتەکانی أئمەی کفر صنادیدی ضلال وإضلال متکبّران وحسودەکان وعنودەکان وصلدەکانی سادەکان هەیە، دەربارەی ضعفا چیان

کردیەو چیان گوتیە، لە خاطریانە. ﴿رِجَالًا﴾ لە رواسای کفر وەك (أبی جهل) و (ولیدی بن مُغَیَّر)ەو (عاصی بن وائل) و أمثالیان کە هەم قِران بون لەگەلّ رجالی (أعراف). ﴿يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَٰهُمۡ﴾ سیماو علامەتی فارقی دونیا. بەسیماو علامەتی فارقی دونیا لەویّ، ئەیاننناسنەوە کێنە؟ فلانی بن فلانە. ئەوەش إشارەی تیایە بۆ عینیت وتَمَیُّز وتَشَخُّصی ئەوانەی زیندوو ئەکرێنەوە، کە علامت علامته، شخص شخصه هُوَ هُوَیه.

﴿قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ﴾ خدم وحشم مالّ ومندالّ کفایەتی ئێوەی نەکرد، لە دونیا پێی مغرور بون، لێرە چ کەلّکیان نەبوو. توخوا ئەو قسە، قسەی أهلی فترەتە؟ أطفالی مشرکانە؟ قەردارانە؟ تأمّل بکە چ مناسبەی هەیە لەگەلّ أقوالی سابقە؟ ﴿وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ٤٨﴾ (تکبُّر) و (تَعَظُّمتان) یا ئەوەی خۆتان پیّ هەلّ ئەشەنگاند لە الهە، لە فدیە، لە شفعاء چ فائدەیان بۆئێوە بۆ؟ ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ﴾ ئەو فقراو ضعفای دونیا، أقویاو أغنیای قیامەت. ﴿ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ﴾ سوێندتان ئەخوارد ئەتان ووت ﴿لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ﴾ خوای تعالان ادنی رەحمەتێکیان ناگەینیتیّ نائلی خێریّ نابن. ﴿ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ﴾ خطابی أصحابی أعرافە لەگەلّ (مشار إلیه) بە (هؤلاء) ﴿لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ٤٩﴾ نە ئێستا نە (بعد دخول الجنّة). أمّا (شێخی عربی) ئەفەرموێ: (أهل الله خوف وحزنیان لە دلّ دەرناچیّ تانەچنە ناو جنّە، ئەو وەقتە ئەلێن الحمد لله الذي أذهب عنّا الحزَن). حقّا ئەو أمرە لەکەسیّ ناوەشێتەوە چاکەو خراپەی مساوی بیّ، بەلّیّ لە رِجالي وەك (صدیق) و (فاروق) وسائری شرفای سابقین، ئەوەشێتەوە، مع أنّە أمر أمری تشریفیە، نە إیجابی وتکلیفیە لام وایە لەبەر ئەو أمرە بعضیّ تفسیری ئێرەیان کردیە بەوجمعیّ بیّ وجە نامنتظم دوور لە موقع، لەبەریّ معنای نەمان نوسی. (سیّد

رشید) لێرە زۆر مضطربە، قسەی أول وآخری لە معنای رِجال وسیما، یەك ناگرێ. ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ (بعد الإستقرار في الجنّة والنار) ﴿أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ﴾ بابە عنوانی (یا أهل الجنە) بێ! (ومن جملتهم) ئەو ضعفایانەی ئەزیەتیان ئەدان گەپیان پێ ئەکردن لە حەقیان ئەیان گوت (لا ینالهم الله برحمة) ﴿أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ﴾ إفاضە، طبیعی لە أعلی، بۆ أسفل ئەبێ. ﴿أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ﴾ لەمأکولاتی جنّة.

ئەم إفاضە یە شی هاسانە. کە نفطی(بابا گوڕگوڕی) لە کرکوك جریانی پێ درا، بۆ (حیفا) وساحلی بحری سپی ناوەڕاست، بۆ دار القدرة، جێی تعجّب نامێنێ. لە (هندستانەوە) بە طیّارە أرزاقیان ئەهێنا لە أطرافی(ڕەواندن) بۆ عسکریان فڕێ ئەدا. (بەڵام مع الاسف ئەو فیضە لە دونیا بۆ ئێمە نیە، لەو نوعە قدرەت وخارقە، محرومین) ﴿قَالُوٓاْ﴾ اصحابی جنان ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ لەگەڵ غایەتی (کرم) و جود(احسان) و (ڕەحمی) ﴿حَرَّمَهُمَا﴾ ئاو ورزقی جنّة. ﴿عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ۝٥٠﴾ ئێمەش مع الاسف کافرین جاهلین، بە قواعدی طبیعەت، عاجزین لە تسخیری قوای بۆیە لە إفاضەو إفادەی، محرومین، تائێستا لێمان حەرام بووە، لام وایە تا إنقراض ئەو حرمەتە دەوام ئەکا!!! ﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ﴾ دینێ الاهی کە أمری پێ کردبون. حەقی وابوو کە حرمەتی بگرن وقبوڵی بکەن، بالعکس إتخاذیان کرد ﴿لَهۡوٗا وَلَعِبٗا﴾ کردیانە گەمەو گاڵتە. ئەوەی قبوڵی کرد با قشمەریان پێ ئەکرد. یادینێ هکذای کە خۆیان بۆ خۆیان إختراعیان کردبوو، دینێ هیچ وپوچ، کەچی صرف هەمەتیان بۆ إدامەو إشاعەی ئەکرد، پێی کیف خۆش ومسرور بون. ﴿وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ﴾ حیاتی دونیای دنی، حیاتی حیوانی، ئەوانی مغرور کردبوو، بەزینەت وئارایش

ومزخرفی هەڵخەڵەتابوون ئەیان گوت: (هەر ئەمە حیاتە چیتر نیە) لەبەر ئەوەخوایان لە فکر کردبوو فکری حیاتی عُلیایان نەئەکرد. ﴿فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ﴾ لە فکریان ئەکەین، بیریان ناکەینەوە ﴿كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا﴾ جزا لە جنسی عملە. ئەگەر ئەوان إیمانیان بە خوای بێ شریك و ڕۆژی جزا بوبا، لە فکر نە ئەکران، لە نعیمی جِنان محروم نەئەبون ﴿وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ٥١﴾ بۆیە ئێمەیان لە فکر کردبو إعتمادیان دابوە سەر (شرکا)یان وە إیمانیان بە (رسل) نەبوو، لەبەر غِلّ وغِشّ وتَکَبُّر، إطاعەیان نەئەکرد، گوێ یان نەئەدا ایاتی کە بۆیان ئەخوێندنەوە. بنا بە قولی بعضێ مفسرین لە (فالیوم ننساهم) وەلەسەر قولی بعضێ لە (الذین أتخذوا) وە، رأسا فەرمایشی خوایە. وەلای (حقیر) مکنە تائیرە کلامی اصحابی جَنَّةْ بێ،(فَعَلَیْه) (نِسیان) لە جێی خۆیەتی، وەإضافەی آیات بۆ (نا) یان لەبەر (مُلابسە)یە، یاخود مراد لە أیەت علامتە، یعنی علامەت نیشانەی فقرو مسکنەتی ئێمە، بووە سببی إنکاریان بۆ رِسالتی رسل وە إنکاری کتابیان. ﴿وَلَقَدۡ جِئۡنَٰهُم﴾ (کفر)ەی ئەو أمّەتە وکذا سائری أممی دی. ﴿بِكِتَٰبٖ﴾ قرآن بۆ ئەوانی کافرن لە أمەتی دعوتی (خاتم الرسل) ﴿فَصَّلۡنَٰهُ عَلَىٰ عِلۡمٍ﴾ بیانی معانی لە عقاید وأحکام وعبر ومواعظ، تفصیلی لەسەر علمێ معقول ومقبول وئاگاداری طبایع وأمزجەی أقوامی بشری، هەر کەس تکلیفی بە گوێرەی خۆی، کردمان. ﴿هُدٗى وَرَحۡمَةٗ﴾ حاڵی ئەو کتابە مُفَصّله، هدایەت و رحمتە، یاخود کتابێکە بۆ هدایەت و رحمەت ناردراوە. ﴿لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ٥٢﴾ بالفعل یا قابل بن کِبْرو (انانیەت)یان نەبێ، یا بتوانن (نزع)ی بکەن ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ﴾ ئەو کافرانە نە لە دونیا ﴿إِلَّا تَأۡوِيلَهُۥ﴾ عاقبەتی ئەو کتابە بە عاقبەتی صاحبی ئەمڕۆ سبەی

أمری ئەو قرانە ئەفەوتیٚ ئەو دینە سەرناکەویٚ. حتّا سوادی أعظم لە قومی نجیبی عەرەب إنتظاری عاقبەت کاری حضرەتی رسولیان ئەکرد ئەیان گوت: (ئەگەر بەسەر عشیرەتی خۆی غالب بوو، ئێمەش إیمانی پیٚ ئەیٚنینن وإلاّ هیچ، ئەڕوا لە کۆڵمان ئەبێتەوە). ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي تَأۡوِيلُهُۥ﴾ محقق بزانن ئەو قرانە ئەو دینە بە تەواوی سەر ئەکەویٚ، عاقبەتی لە دونیا دەر ئەکەویٚ، عالەمیٚ لێی إستفادە دەکا، نائلی هدایەت ورحمتی ئەبن، أمّا بۆ ئەو کافرانە، لە قیامەت ئاشکرا ئەبیٚ. ﴿يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبۡلُ﴾ پێش یومی تأویل. لەوڕۆژەدا دەڵێن ﴿قَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّ﴾ بۆیان تبیٚن ئەکات لە ڕۆژی جزا، حضرەتی (محمد) و سائری رسلی، کە ئەو تصدیقی رسالەتی کردبوون. ﴿فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشۡفَعُواْ لَنَآ﴾ نجاتمان بدەن تکامان بۆ بکەن ﴿أَوۡ نُرَدُّ﴾ ئایا لەمە دەگەڕێینەوە بۆ دونیا؟ ﴿فَنَعۡمَلَ غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ﴾ لە دونیا، أعمالی قلبی وجوارحی. ﴿قَدۡ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ خۆیان لە جمادات کەمتر کرد شرفی نفسی بشریتان دۆڕاند، ماڵی خۆیان کوێر کردەوە، تیای چوون، زەرەریان کرد. ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم﴾ لێیان بزربوو. ﴿مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٥٣﴾ اصنام وشفعاء وشرکاو أولیایان هەموی باطل دەرچو. ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ﴾ واجب الوجود بیٚ شریك. ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ (وحده) بیٚ ناصرو معاون. ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾ شەشە أوقات. دیسان خاڵی نیە لە مُساهلە، زیٚرا لە بدئی خلق ناوی (وقت ویوم) بردراوە، وەممکنە بیکەینە لە مقداری شەش ڕۆژ بە حسابی ئێستاتان. جەنابی (حەق) عمومی علویات وسفلیاتی إیجاد کرد، بۆچی (دَفْعَةً) خلقی سماوات وأرضی نەکرد؟ (مع انهُ ) مختارە قدیری علی الإطلاقە!!! بە بعضیٚ نکاتی واهیە جوابیان فەرمووە، لکن (حقیر) ئەڵیٚ: (صانع خۆی ئەزانیٚ

صنعی چۆن ئەبێ بەچەند ئەبێ). عالمی نظری لای وایە ئەوەی خیاڵی بکات، ممکنە ببێت، أمّا عالمی عملی، فرقی مخیّلات وحقایق ئەکات. (تورات وتوراتیّون) ناوی رۆژەکان تعیین ئەفەرمون، أمّا خلافیان هەیە، إبتدای خلق لە رۆژی یەك شەممەیە؟ یا لە رۆژی شەمو و دوو شەموە؟ سەیرێ تر، لە (إبن عباس) نقل ئەکەن ناوی ئەو أیّامانە: (أبو جادْ، هَوَّازْ، حُطّي، كَلَمونْ، سَعفَصْ، قَريشات)ە. من ئەو قسەیە هیچ تێ ناگەم!!! مەگەر ئەو کَلماتانە لە عزاماتی أجنّان بخوندرێتەوە!!! ﴿ثُمَّ﴾ پاش خلقی سماوات وأرض ﴿ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾ اعتدالی بوون قراری گرت، غالب بوو لەسەر عرش، (اریکە)ی حکمداری. تدویر و تدبیری أموری عالەم (وحده لا شریك له) بە قوەت وقدرەت وإرادەیْ کاملی خۆی إدارەی ئەکا، نە لە خلق، نە لە تدبیر و إدارە، شریکی نیە، خالقی (کُلْ) هەر ئەوە، مدبّر الکل هەر ئەوە، لە خلق ماندوو نەبوە، تا رۆژی شەموو بچێتە سەر عرش لەسەر گازی پشت درێژ بێ إستراحت بکا. ولو بلّێین دانیشتن بۆ خوا (عقلا) دروستە، مقصد ئەوەیە کە عرض ئەکرێن: (عرش فلك الأفلاکی یونانیان نیە، ئەگەر بالفعل موجود بێ، شتێ ترە). زاتا لە نظر حکمای جدید (فلکیّونی) نوێ، جرمێ خرن دوو سطحی مستوی لێك جوداو بەرانبەر محیط بە أرض، مرکزی مرکزی عالەم، مفقودە! ئەو نظامە واسعەیە، چەند هەزار منظوماتی تیا هەیە. (منظومەی شمسی) ئێمە بە نظر، گەلێ لەوانی تر بچووکترە، بەو نظریّة ئەگەر مراد (سماوات وأرضی) ئێمە بێ لە أرض تاکو ((نبتون)) بەڵکو تاکو (پلوتو)) حسابی (ستّە أیام)ی خۆمان زۆر جوان دێت، چونکی هەر منظومەیە خصوصیەتێکی لە زەمان دا هەیە، أیّامی بە مقدر لەگەڵ ئەوانی تر جودایە أهمّی مهمّات بۆ إدارەی (زَمانیّات) تصرّف لە (زەمانە)، بۆیە (عَقِبْ الإستواء) ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ﴾ە ئەفەرموێ شەو بەسەر رۆژدا دەدا، دونیا تاریك ئەبێ وکذا رۆژ بەسەر شەودا ئەدا، روناك ئەبێ، ئەگەر چی بۆ إفادەی هەردوو معنا دوو قراءت هاتووە. أمّا لام وایە لە أوّلی فطرەت

نوری (نیرۆن) بەقوەت نەبووە، تاریكی لە غلبة دابووە، بۆیە ئەفەرموێ ﴿يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾ بەسرعەت دوای ئەكەوێ غلبە بەسەر موقعیا بكا ﴿وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ﴾ دوو قراءت هەیە. قراءتی مشهور (قراءتی جمهور) سین سەرسا، رێ سەررا، میم سەرما. سین بەرسو، رێ بەر روو، میم بەر موو، تێ دوو ژێر تین، تێ دوو بەر توون. بۆ قراءتی أول (خَلَقَ) تقدیر ئەكەن، ممكنە (دبَّرَ) یا (سَخَّرَ) تقدیر بكەین.

خلاصە رۆژو مانگ وئەستێرە هەمویان بە أمر وإرادەی ئەو، نەرم كراوو مُطیعین، هەریەك لە توقعی مُناسبی خۆی داندراوە، آثاری مطلوبی لێ تَرَتُّب ئەكات. أجرامی عُلْویَش وەكی ئێمە (أعنی) سفلیات مُسَخَّرو مُدبَّرن، مُسَخِّر و مُدبِّر نین ﴿أَلَا لَهُ﴾ (وحدە). ﴿ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ إیجاد وإدارە هەر بۆ ئەوە، كەس هیچ شت مداخلەی نیە، كەوابێ كێ ئەپەرستن؟ أمێدتان بە كێ یە؟ ﴿تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٥٤﴾ متعالیە بە وحدانیەت لە تفردّ وألوهیەت وربوبیەت، مُقَدَّس ومُنَزَّهة لە نقص، لە شریكی معاضد یا معاند، صاحبی خێراتێ زۆرە. جەنابی حەق لەسەر عەرشی عظمت وإقتدار حكمڕانی خۆی ئەكات (وحده ولا شريك له) با هەر سلف وخلف خەریك بن لە بەینی تفویض وتأویل، خوا ئەزانێ معاند ومراد لەو استوایە زۆر ئاشكرایە حاجەت ناكا بەو هەرا هەرایە. بەڵێ ئەگەر تەنها تەماشای (إستوی علی العرش)ی بكەی،إشكالی تیایە (خاصَّةً) إستوای قرآن مقابلی إستلقای (تَوْرات)ی مُحَرَّفە.

﴿ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ﴾ ئەو خوایەی كە شأنی ویتان زانی لە ایەتی پێشو،هاوار ببەنە بەر ئەو لە بەر وی بپاڕێنەوە عبادەتی ئەو بكەن ﴿تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً﴾ بە أومێدی شفاعت و فدیە لێ مەگەڕێن، بەناوی بێ ناوك هەڵمەخەڵەتێنن بۆ غیری ئەو خۆتان ڕەزیل وزەلیل مەكەن، هەر بۆ ئەو ذللەتی خۆتان بنوێنن، بەئاشكرای بە نهانی، بۆ ئەو گەردەن كەچی كەن، شیرە شیر و نیرە نیر

مەکەن، گۆیا ئێوە حاڵتان هاتۆتیٚ؟ جلال وعَظَمَتُ وخَشْيَتُ وهیبەتی خوا کە لە دڵاندا شین بو، إنسانی تَحَرێُر ئەکا، ماتومَبْهُوت ئەبیٚ لە هیچ شت تجاوز لە حد مەکەن ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾﴾ ئەوەی خوا خۆشی نەویٚ، خائب وخاسرە. مقصد لەو (خُفية) ئەوە نیە کەسی گوێی لیٚ نەبیٚ. لە شریعەتی إسلامیە حدود دانراوە بۆ دَعَواتی جَهْرِيَة وخُفِيَة، ئەو حدودەش واجب الرعایتە، مؤمن ئەبیٚ دوای قواعدی شرع کەویٚ، نەك مقتضای میلی خۆی ﴿وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَـٰحِهَا﴾ خوای تعالی ئەو أراضیەی بۆ ئێوە إصلاح کردیە لەسەریا معیشەت بکەن منافعی لیٚ وەرگرن، زۆر واسعە زۆر بە وارداتە،ئەگەر لەگەڵ یەك یەك بن، بەشی هەمووتان ئەکا (مع زیادة). ئێوە بە عطالت وبطالت، بە طمعی إستلا، بە بەهانەی ترقیاتی مدنیَّە، بە إکتشافات وإختراعاتی آلاتی جهنمی، أرضی بە فساد مەبەن!! تێکی مەدەن!! ﴿وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ لە بینی خوف ورجا، خوا بپەرستن، بەدوو رکاعت نوێژ مغرور مەبن، ترستان هەر لەو بیٚ، أومێدتان هەربەوبیٚ، چاکەبکەن ﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾﴾ وەچاکە کردن باغر مەبن لەچاکە زیادکەن، تاکو رەحمەتی إلاهیتان پیٚ بگا!! ئەڵێن ئەبوایە (قريبةٌ) بیٚ چونکی خبرە لە (رَحْمَةٌ) سیَدی آلوسی سیزدە وجە لە (إبن هشام) نقل ئەکا هیچی خالی نیە لە خلل. من ئەڵێم: (بە إنصاف تەماشا کەن فرقی (قريب) و (قريبە) چیە؟ لە قریب چ فسادێکی تیایە؟ ئەو لوغەتانەی کە بە دەرەجەی عەرەبی فرقی تذکیر وتأنیث ناکەن چ نقصیان پیٚ گەیشتوە؟ فی الحقیقە لە گەڵیٚ جیٚ قرآن بعضە قیودی (لُغَةٌ) ئەشکێنیٚ أمَّا علمای (نحو) بەمەیلی خۆیان تأویلی قرآن ئەکەن، نەك تصفیەی لسان ومسألەی تذکیر وتأنیث، حقاً لغەیان تێك داوە!!! خاصَّة تحویل وتأویلی عددی بێتە سەر! لام وایە عەرەب لە أوَّلی بەناو فرقی یان لەبەینی نێرو میٚ ئەوەندە نەکردوە، (جارية) (عائشة) (هند)

ئەگەر پیاو با ئەیان ووت (جاء جارية) ئەگەر ژن با ئەیان ووت (جاءت جارية) وكذا لە سائری أعلامی مشتركە، ئەوەباشە، دوایێ تَوَسُّعیان كرد تاگەیاندیانە (شمس) و (قمر)ن أما ئەو زوبانی لە اساساً فرقی جوهری بكا لە بەینا، حاجەتی بە تذكیر وتأنیث فعل وئەوانە نیەن (ئەستێ) هات (پیربالێ) هات. (سبحان الله) بۆ تطبیقی قاعدە بعضێ خۆیان لە رەحمەتی خوا دوور كردیە، لێرە تأویلی (رَحْمَةْ) بە (مَطَرْ) ئەكەن، خوا ئەزانێ ئێرە جێی باران نیە نەبارانی رەحمەت نە بارانی غَضَبْ).

﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ﴾ ناردنی با وەك تعاقبی (لیل ونهار) بۆ سكّانی أرضی مُهِمّە زۆر نافعە، باجاربەجار زەرەری ببێ. خوای ئێوە ئەو خوایەیە بائەنێرێ ﴿بُشۡرَۢا﴾ بە (ب)ێ، بە (ن) نشراً، كأنّە موژدە ئەدا. ﴿بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦۖ﴾ پێش باران. لێرە تفسیر بە باران حقیقە بێ یا مجاز، زۆر بە موقعە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ﴾ بە سوكی زانی هەڵیگرت ﴿سَحَابٗا ثِقَالٗا﴾ هەورێ گران وئاودار، هەوری ئاودار وبێ ئاو زۆر ظاهرە، لێك تفریق ئەكرێن. ﴿سُقۡنَٰهُ لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ﴾ هەورەكە دەئاژوێن بۆلای وڵاتێ مردی، تینو، دێمەكار ﴿فَأَنزَلۡنَا بِهِ﴾ (فی البلد) یا لە هەور. ﴿ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ﴾ بە ئاوەكە ﴿مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ﴾ ئەوەی لەوێ هەبێ، چ حبوبات چ أشجار لاشك مادّەی ئەو ثمراتە لە أرض و هەوادا موجودە، بەو ترتیب وضعی إلاهی كە دایناوە. ئەو موادە لە أرحامی أجارامی نامیە دا گردەبێتەوە، میوەودانە، وەكی پێشی لێ ظهور ئەكا، ئەوە هیچی لە كتمی عدمەوە نیە.

﴿كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ لە أجزای أصلیە كە لە دونیا هیكەلی لێ ترتیب درابوو، مردی لە أرضی دێنینە دەر، ئەگەر كەسێ لە كتمی عدم خلق كا، ئەوە إعادەو زیندوو كردنەوە نیە، خلقێ سەربەخۆیە. لەو تشبیە لازم نایێ مساواتی

من كل الوجوه، تابلێین إنسانیش به ئاو و بارانی لەناو قەبریان شین ئەبنەوه، وائەزانن ئەو قەبرانە ئەمێنن ئەو أجزایانە لە ناویاندا بە محفوظی ئەمێنن!!! هایهو (رُبَّ لَحْدٍ صارَ لَحْداً مراراً) هەزار هەزار قەبر تێك چوو خۆڵی هەیكەلی صاحبیان نشر بوو، بەڵكو بوونە شتێ تر. ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ٥٧﴾ به سبب ئەو بیانە تێ فكرن له عالەمی تطورات! ظاهری ئەو خطابە عامّە بۆ مؤمن وجاحد. ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ﴾ وامەزانن هەر أرضێ بارانی لێ بباریێ ثمراتی باش ئەبێ، بەڵكو ئەمە تابعی گڵ چاكیه. ئەو مملكتی گڵی باشی بێ قوەتی إنباتی كافی بێ، بارانی بە موسم ومُنتَظَم لێ بباریێ ﴿يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ﴾ ئەوی تیای شین ئەبێ ﴿بِإِذْنِ رَبِّهِۦ﴾ إذنی تكوینی. چاك و به بەرەكت ئەبێ. ﴿وَٱلَّذِى خَبُثَ﴾ چەقێن وبێ تام ﴿لَا يَخْرُجُ﴾ نباتی. ﴿إِلَّا نَكِدًا﴾ هیچ وپوچ وبێ تام. ﴿كَذَٰلِكَ﴾ به و نوعه ﴿نُصَرِّفُ ٱلْأَيَٰتِ﴾ تكراری ئەكەینەوه به تكوین وبه عبارەت. ﴿لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ٥٨﴾ ئەگەر خۆیان بە صالح زانی، مواعظی إلاهی تأثیری تێ كردن،لە حسنات نمایان بو، شُكری الاهی ئەكەن لەسەر پاكی فطرەتی خۆیان وتێك نەچونی، ئەگەر قصورێكیان دیت لە خۆیان لە خۆیانەوەی بزانن، خەریكی اصلاحی بن، وەك (زُرّاع) أرضی بێ قوەت (تسمید) ئەكا، به سعی تربیه، إصلاحی نباتات وثمراتی ئەبێ ئەوەی بالكلی به فساد چوو، جێی أومێد نیه (درو تخمنی أمل ضایع مكردان)، وفی الحقیقه إرسالی رسل بۆ تحریر وتكریر وتعمیمی ایاتی ربّانی، لە أعظمی نِعَمی خوداوەندیه. ئەگەر ئەو رجالانه ئەو مصلحانه ئەو هاورێیانه نەبان، بشر إستوای لەسەر ئەو مقامه رفیعانه نەدەكرد. ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا﴾ جەنابی حەق سوێند ئەخوا كه ئێمە (نوح)مان هەناردوه به (رسول)ی. ﴿إِلَىٰ قَوْمِهِۦ﴾ (نوح) وەك له (تورات) وەرئەگێرێ (اِبنِ لامَكْ بن مَتُّو شالَح بِنْ أخنوخْ بنُ یادَدَ بنُ

مَهْلَلْئیلْ بنْ قینانْ بن أنوّش بن شیت بن آدمْ (علیه السلام)) بنا لە روایەتی (إبن إسحاق) و (إبن عساکر) لە (إبن عبّاس)، (نوح) لە زەمانی (آدم)ی بە وەلد بووە. نازانم قسەی نسّابان بۆ چی وا پەرێشانە؟ ئەو دقایقی تأریخیان لەچی وەرگرتیە؟ بعثتی عام بووە بۆ هەموو بشر؟ معلوم نیە!!! بەڵکو ظاهری (إلی قَوْمِهِ) نفی (عموم) ئەکا! دوای بڕانەوەی بشر غیری (من آمن بِهِ) ئایا پێی ئەڵێن عمومی دەعوەت؟ بەڵێ (منطقی) ئەڵێن: (ئەگەر لە أنواعی حیوان غیری إنسان نەما، دروستە بڵێی ((کل حیوانٍ إنسان))). عمومی دەعوەتی ببێ یا نەبێ خلل بە مقامی رسالەت پەناه ناگەینێ، بەینی عُمومَیْن، فرقێ زۆر هەیە، با جن وملك وجەماداتیش داخل نەبێ، مع انە ئەو نوعە إیمانە لای من (مزخرفە). ئەمە سەیرە ئەڵێن: (پێشدان ناوی سکن بوە یاعبدالجبار بووە، پاشان لەبەر زۆر گریان ناویان لێ ناوە نوح، لاشك ئەو قسانە توررەهاتی اِشتیاقیّونانە، گوێ مەدەنە ئەو هذیانانە، گوێ بدەنە فەرمودەی ﴿فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ هەر ئەو بپەرستن ﴿مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾ کەس نیە. ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەگەر خالصا نەیپەرستن ﴿عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ٥٩﴾ ڕۆژێ گەورە. گەورەی وگچکەی، سعادەت ونحوستی أیّام (بما فیها)یە، ڕۆژ هەر ڕۆژە، ڕۆژ لە مشرق هەڵدێ لە مغرب ئاوا ئەبێ. ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ﴾ رجالی أشراف لە قومی خۆی. ﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ﴾ بێ شائبە. ﴿فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٦٠﴾ گومراهێ ئاشکرا لەناویا بزربووی ﴿قَالَ﴾ نوح ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ ئەی رجال. ﴿لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ﴾ أدنی ضلالێ بەمنەوە نیە فضل لەوە ﷺ تێی دا ببم. ﴿وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦١﴾ ئەوی رسولی خوداوەندی عالم بێ چۆن لە ضلالەت دا ئەبێ؟ بەڵکو لە غایەتی هدایەتی دا ئەبێ کە ببێتە هادی غیر. ﴿أُبَلِّغُكُمۡ﴾ پێتان ڕائەگەێنم ﴿رِسَٰلَٰتِ رَبِّي﴾ ئەو سپاردەی کردیمە، هەرچی ئەو بفەرموێ

ئەوتان پێ ڕائەگەیێنم. ﴿وَأَنصَحُ لَكُمْ﴾ ئەوی صەلاحی ئێوەی تیایە، پێتان ئەڵێم. خالصم، پاکم بێ غشم لەگەڵتان. ﴿وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٢﴾﴾ بە عقڵ، بە وحی، بە وجدانێ پاك، ئەزانم ئەوەی ئێوە نایزانن. ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ کتابێ. ﴿عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ﴾ لە خۆتان. نابێ ڕسول لە بشر بێ؟ (مَلَكْ) تان ئەوێ؟ یا خوا خۆی بێ؟ بیبینن؟ (سبحان الله) ! قسەی هەمویان لە زەمانی حضرتی (نوح) تا زەمانی حضرەتی (خاتم الانبياء) یەکە. ﴿لِيُنذِرَكُمْ﴾ ئەو (رجل)ە ﴿وَلِتَتَّقُوا۟﴾ لە خراپە خۆتان بپارێزن. ﴿وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٦٣﴾﴾ ئەگەر ئیمان بێنن. ﴿فَكَذَّبُوهُ﴾ اشراف قەومی إستمراریان کرد لەسەر تکذیبی، زاتاً سَوادی أعظَمْ لە اُمَمْ حَقیَةً دین و ئاینیان نیە، تابعی گەورە گەورەکانی خۆیانن. من گەلێ جار لە (وعظ) عرضی سامعان و گوێ دێران ئەکەم و کردوومە (حەیفە بۆ ئێوە، ئێوە سەریەخۆ هیچ دین و دأبتان نیە، تابعی ئاغاوات و مأمورینن).

﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ﴾ مؤمنەکان ﴿فِى ٱلْفُلْكِ﴾ لە کەشتی سەلامەت دەرچون و غرق نەبوون. ﴿وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ رئیس و مرؤس ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾﴾ کور بوون، بصیرەت و تێ فکرینیان نەبوو، (نعوذ بالله مِنْ عَمى الأبصارِ والبَصائِرِ). ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ﴾ عشرەتێ بوون بە ناوی بابەگەورەیان مشهوربوون. ﴿أَخَاهُمْ هُودًا﴾ برای خۆیان، بۆ خۆیان. ئەڵێن (هود) کە (یَعرُب)ە (أبو العَرب)ە چوار کوڕی بوە(قحطان– أبواليَمن–، مُقْحطْ، قاحِط، فالفي– باوکی قَبیلەی مُضَر). دووەکەی تر بێ نسل بوین. وە ئەڵێن (هود) کوڕی (شالخ) کوڕی (أَرْفَخْشَدی) کوڕی (سامی) کوڕی (نوح)یە. بعضێ ئەڵێن: (نوح) کوڕی ئامۆزای باوکی (عاد)یە، نازانم، من ئەو قسانە ئەنووسم لە

تفسير، وەرى ئەگرم، ئيعتماديشم لەسەريان نيە! ﴿قَالَ﴾ فەرمووى ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ﴾ (وَحْدَهُ). ﴿مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾ وەك حضرەتى (نوح) فەرمووى. ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ ٦٥﴾ ئايا خۆتان ناپارێزن لە سببى عذابى إلاهى؟ شِرك، إنكار، گوناه. ﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ﴾ لە قصەى (نوح) نەيفەرموا (كَفَروا) إشارەيە بۆ كثرەتى كافران. لە شێوە كلام دەرئەكەوێ قومى (هود) نَظَر بە قومى (نوح) أهوەن بوبن زێرا وان. ئەلێن ﴿إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٖ﴾ زۆر خَفيفُ العقلى نالێن في (ضَلالٍ)، ﴿وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٦٦﴾ لە زومرەى وان. ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي سَفَاهَةٞ﴾ فضل لە رسوخ و إحاطە. ﴿وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٧﴾ درۆ ناكەم لەو دەعويە ﴿أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي﴾ بێ كەم و كورت. ﴿وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ٦٨﴾ بێ غل و غش و خيانەت و ميلو رئاسەت. ﴿أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ﴾ بۆ قەومێ حر ئەوە نعمەتێ زۆر گەورەيە. چ خۆشە أمت گەورەى دين و دونياى لە خۆى بێ!!! ﴿لِيُنذِرَكُمۡۚ﴾ طَبْعى بَشَرى وايە، بێ ترس، روو ناكاتە حەق و چاكە. ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ﴾ لە أرضى ﴿مِنۢ بَعۡدِ قَوۡمِ نُوحٖ﴾ ئەوانى هيلاك كرد ﴿وَزَادَكُمۡ فِي ٱلۡخَلۡقِ بَصۜۡطَةٗ﴾ لە خلقى خۆتان (مِنْ حَيْثُ البُنية) يا لە بەينى خەلك قوەتى زياد كردينە. رِواياتيش زێدە بَسْطيان داوەتێ خاصە روايەت لە (أبى هريرە) زۆر مبالغەى تيايە لە قوەتيان. (سيد رشيد) رەحمەتى خواى لێ بێ ئەفەرموێ لە تفسيرى (مَأْثور) رِوايەت هەيە دائر بە طولى قامتيان وە بە قوەتيان، هيچيان إعتماديان لەسەر نيە إحتجاج بە هيچيان ناكرێ. ﴿فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ﴾ نِعَمى خواى. ﴿لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٦٩﴾

بە أدای شکری ﴿قَالُوٓاْ﴾ لە جەوابدا ﴿أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ﴾ ئایهو! ئەوە دوورە! نەدەیا خۆت ماندووکەی بەو دەعوەتە بێیە سەر ئێمە، قط ئەو نابێ، ئێمە تەنیا خوا بپەرستین؟ ﴿وَنَذَرَ﴾ ترك بکەین ﴿مَا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا﴾ لە (أوثان). چۆن ابای ئێمە ئەو ضمانەیان پەرستی بێ وە ئێمە ترکی عبادەتیان بکەین؟ هەر خواپەرستین؟ ئەوە نابێ! چ دەڵێی؟ ئەمانترسێنێ لە عذابی خوا؟ ﴿فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٧٠﴾ ئەگەر لە ڕاست گۆیانی، بێ مَنَّة بە، فەرموو، چیمان بەسەر دادێنێ، بێنە.

﴿قَالَ﴾ حضرەتی (هود) ﴿قَدۡ وَقَعَ عَلَيۡكُم﴾ بەسەرتاندا هات تقرری پێ کرد﴿مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ لە طرف خوای حقیقی خۆتان. ﴿رِجۡسٌ وَغَضَبٌ﴾ عذابی، پێ گرمە و لرمە، وەك رعد، عذابێ، پیس. خلاصە هەر معنایێ لە لوغەت بۆ (رجس) ئەڵێن، لەگەڵ عذابی وان مُناسَبەی هەیە. عذابێ ناشیء لە رقی إلاهی نعوذ بالله، عذابێ إستئصالی ناکاوی بێ. ﴿أَتُجَٰدِلُونَنِي﴾ مخاصمەو مناظرە لەگەڵ من ئەکەن؟ ﴿فِيٓ أَسۡمَآءٖ﴾ ناوی بێ ناوك ﴿سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم﴾ بوتێ لە بەردی بتراشن ناوی لێ بنێن (صمود) یا (صمد) ئەبێتە سیّدی غنی مُنزّه لە حاجەت مرجع وپەنابەر؟ حاشا وکلاّ عمومی بشر سجدە بیا بۆ کەر، کەر هەر کەرە، بە قەلادەی مرواری وتەختی زەررین گاجوت نابێ بەخوا، نابێت بە معبود، لەگەڵ گای گاڕانێ، گای بن نیری، هیچ فرقی نیە.

﴿مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا﴾ بە واسطەی ئەوانە بۆ ئێوە ﴿مِن سُلۡطَٰنٍ﴾ هیچ قوەت وقدرەتیان بۆ ئێوە نەدەدا، چیان لێ وەرئەگرن؟ چیان لێ فێر ئەبن چ قانون ونظام وشریعەتێکیان بۆ داناون؟ ئەوانە چ عەقڵێك ئەدەن بە ئێوە؟ چ رۆحێکتان ئەهاوێنە دەرون؟ أتخاذیان ئەکەن بە مثلی أعلی؟ لە أوغری وان دەست لە خوداوەندی زەمین وزەمان هەڵ ئەگرن؟ سبحان الله لە بشر چیە!

حقًا له عجايباتي خلقه ! اى وايان هەيه بـه نـوكى قەڵـەم حكم لەسـەر كائنـات ئەكا واگومان ئەبا عرش وكورسى وزەمين سماء به نوكى قلمى ئـەو ئەگـەڕێ!
﴿فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ٧١﴾ تا بـزانين چيتان بەسـەر دێ!
﴿فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ﴾ لـه أهلـى إيمـان ﴿بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا﴾ ع وجهـێ تـر لـه أسبابى طبيعى نيه، حتّـا شـتێ صـورى وەك (فلكـى نـوح) ﴿وَقَطَعۡنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ﴾ دوايمـــان بڕانـــدن، كەســـيان لـــێ نـــەماوە. ﴿وَمَا كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ٧٢﴾ حتّا له وەقتى عذابيش دا خيـاڵى إيمانيـان بـه دڵ دا نـەهات. عذابى ئەو قومه به چى بوو؟ لێره بيانى ناكات، ئێمەش لێره چـى لـێ نـاڵێين، هەڵى ئەگرين بۆ موقعى خـۆى. ﴿وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ﴾ (ثمـود) قبيلـەێ بووه له عەرەب. ناوبراون به ناوى باپيريان (ثمود بن عامر بن آدم بن سـام بـن نوح) مشهور بوين. قيلێ ئەڵێ (ثمود بن عاد بن عوص بن إرَم) بووه. (عمرو بن علا) ئەڵێ لەبەر كم ئاوى وڵاتيان ناوبراون به (ثمود). موقعى ئەو قبيلەيه پێـى ئەڵێن (حَجَر) له بينى (حجاز وشام تا وادى القرى). (صـالح) لـەو قومـه بـووه، كوڕى (عبيد) كوڕى (آصف) كوڕى (ماشح) كوڕى (عبيد) كوڕى (حـاذر) كـوڕى (ثمود)، به جاحێرى بويته (رسول) حتّا بعضـێ ئـەڵێن: (لـه نێزيكـى إحـتلام و بلوغى ناردراوه بۆ سەر ((ثمود)). (سيّدى آلوسى) ئەفەرموێ: (نقـل كـراوه لـه (نووى) مدّەى بيست ساڵ لەناويان بووه لەمكّه وەفاتى كردووه، عمرى پەنجاو هەشت (٥٨) سـاڵ بـووه). بـێ شـك إمـامى (نـووى) فەرمويـەتى (والله أعلـم)!
﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ﴾ وەك پێغەمبەرەكانى پێشوو فەرمويانـه ﴿قَدۡ جَآءَتۡكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡۖ﴾ ايـەتى گـەورە لـه طـرف خواتان بۆ هـاتووه. ﴿هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗۖ﴾ ئـەو إضـافة بـه خـۆڕاى نيه، ئەبێ له بەينى حوشتران إمتيازێكى هەبێ بيكا به حوشـترى خـوا (بيّنـەى

إلاهـى). ئـەوجا غرائـب وعجـائبى روّاتـى أخبـار قصـص وحكايـەتى حكايـەت خوێنانى بىّ تمير لە بەينى صادق وكاذب، مەيدانيان بۆ واسع بوو، ئەڵێن: (بنـا لە دەعوەتى قومى (صالّح)ئەو رسولە صالّحە دوعاى كرديە لەناوبەردێ معلوم ومُعَيَّن (حوشترێ) قەوى و زەلام هاتەدەر وە دەرحالّ زاوە حوشترى گـەورەى هێناوە، طول وتفصيلێ زۆريان هەيە). أمّا (سيّد رشيد) رەحمتى خواى لێ بـێ ئەفەرموێ: (چى صحيحيان نيە ببێ بـە حجّـەت ودەليـل كـە ئـەو حوشـترە لـە بەردێ يا لە هضبەيێ خلق كرابێ، وەك لە «أبـى طفيـل» نقـل كـراوە)! طبيعـى ئەمەى پياوێ نابێتە طُفيلـى(أبـي طُفيـل) ! أمّـا ئـەبێ: ﴿فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِيٓ أَرْضِ ٱللَّهِ﴾ (مرعـى). ئەڵبەتـە (ناقـة الله) زەرەر بـە مزرەعـەو باغـات نـادا، وە خواش وا نافەرموێ. ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ﴾ (بوجە من الوجوە) بەخراپە تخـونى مەكەون دەستى مەدەنێ. ﴿فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٧٣﴾ ئەگەر (مَسّي بالسوء)ى بكەن. ئەمـە نابێتـە معنـاى (كَونَهـا آيـة)! لام وايـە (سيّـد رشـيد) لـەو معنايـە إصابەى نەفەرمووە، وەمادام روايەتى صحيح نەبێ لە روسلێ صـادق دائـر بـە خلقى ئەو حوشترە لە بەرد، وەنقل نەكرابێ، ئێمەش إعتبار بە (أبـي طفيـل) و (سَدّيّ) وئەوانە ناكەين، بۆ جزم وتصديقى ئەو جورە خلق وإيجادە، أمّـا ئـەبێ ئـەو حوشـترە شـتێكى واى بـوبێ كـە شـايانى بـێ ببێتـە (آيـة الله، ناقـة الله) ومعجزەى رسولێ وەكى (صالّح). ئەگەر روايەتى صحيح ومعتبر لەو نوعە أمرە مهمّە لـە (رسـول الله) نقـل كرابـا بـڕوام ئـەكرد إيمـانم پـێ ئـەهێنا. خلقـى ئـەو حوشترە بەو نوعـە لـە خلقـى (عيسـى) عجايـب تـرە، بـەڵكو فەرخۆڵەكـەى لـە (شبە)ى ئەوە! ئەگەر وابا قـرآن چـۆن تصـريحى پـێ نـە ئەفـەرموو؟ لـەكتبى صحاحى حديث چۆن نقل نە ئەكرا؟ ئەگەر كەسێ ئارەزووى خوێندنەوەى ئـەو حكايەتانەى هەيە تەماشاى تفسيرى (إبن جرير) و أمثالى وى بكـا. مـن نـاتوانم ئـەو (مزخرفانـە) لێـرە بنوسم! ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ﴾

دوای (عاد)، نه خلفای (عاد). ﴿وَبَوَّأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ قەرارگیری کردینە لە أرضی بە قوەت وقدرەت وعلمی معماری ﴿تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا﴾ لە جێی راست ونەرمانی أرض خانوی بڵند ومحتشم دروست ئەکەن ﴿وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا﴾ چیایان ئەکوڵن، لە ژێرییان خانوان ئەکەن بۆ زستان، (یافرضه). ﴿فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ﴾ شکری نعمی خوای بکەن. ﴿وَلَا تَعْثَوْاْ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ۝٧٤﴾ یعنی لە أرضی دا فسادو ئاشوب مەکەن، وە إسراف وتکبّر لە فساد مەکەن، یا تکبّر مەکەن لە أرضیدا، حالی ئێوەش وابێ (مفسدین). خلاصه أدای معانی ترکیباتی عەرەبی بە کوردی زۆر مشکلەیە، لەگەڵێ جێ ئەبێ انسان خلاصەی بیان کا. ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ﴾ عاتیّ ومتکبّرەکان بە دعیەو قەپۆز بڵندەکان ﴿مِن قَوْمِهِۦ﴾ إی (صالح)ی ﴿لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ﴾ بۆ ئەوانەی إیمانیان هێنابو لەوان، وە بەبێ هێزیان ئەزانین ﴿أَتَعْلَمُونَ﴾ بە یقین بروا ئەکەن؟ ﴿أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ لە طرف خوای خۆی ناردراوە؟ لەو دەعوایە راست ئەکا؟ ﴿قَالُوٓاْ﴾ بەلێ ﴿إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ۝٧٥﴾ زێدە لە إیمان بە رسالەتی بەوەی پێی هەناردراوە لە طرف خوا، إیمانمان هەیە منقادین بەجێ دێنین، یعنی تەنها إکتفا بە إیمان ناکەین، زاتا لە أوائلی رسالەت مۆمنەکان وابوین، إعتماد لەسەر مجرّدی إیمان دوایێ پەیدا بووە. ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ﴾ لە رووی کبر وعنادەوە ﴿إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ۝٧٦﴾ کە ئەڵێن لە طرف خوا سوپاردە کراوە، ناڵێن (بما أرسل به) نەك وەم بچێ کە منکری حەقن. لە عبارەتیان دەرئەکەوێ قەومێ زەکی بوین. ﴿فَعَقَرُواْ

ٱلنَّاقَةَ﴾ چار پەلیان شەل کرد ، کوشتیان، کوشتیانەوە، هەمویان پێی راضی بون، کأنّە هەمویان کردیان.

﴿وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ﴾ إستکباریان کرد لە أمری خوای دەعیەیان نەینا قبولّی بکەن. ﴿وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ﴾ لە عذابی ألیم وعظیم. ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٧٧﴾ لێرە وادەرئەکەوێ ئەو قومە بێ أدب نەبوین، أوّلا نەیان ووت لە (ضلال) دای، ووتیان لە سفاهەت دای، بەصریحی نالێن ئەگەر لە صادقانی درۆی ناکەین باوجودی مەرامیان بەو عبارەتە پێك دەهات.

﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ﴾ لەرزە لەرزێ بە شدّەت کە دلّە کوتکەی بدا ﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ٧٨﴾ لە (دار)ی خۆیان لە (دیار)ی خۆیان مردبون بێ حرکە کەوتبونە سەر ئەژنۆ لەپورووز کەوتبون. ﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ﴾ حضرەتی (صالح) رووی لێ وەرگێڕان ﴿وَقَالَ﴾ لەبەر خۆیەوە ﴿يَٰقَوۡمِ﴾ خانەخوشتۆرینە ! مالێ وێرانینە ! ﴿لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَالَةَ رَبِّي﴾ بە تەواوی ﴿وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ﴾ نصیحەتم کردن بێ خیانت، إنذارم کردن لە عاقبەتی کفر وإستکبار، بە قسەتان نەکردم. ﴿وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ٧٩﴾ بۆیە إتباعتان نەکردم. (سبحان الله) حالّی بشر! لە أوّل وآخر هەر وایە هەرکەسێ راست بێ لەگەلّیان خێر خواهیان بێ ، بێ حیلە رێی راستیان نیشان دا لە خراپە بیان ترسێنێن خۆشیان ناوێ رقیان لێ ئەبێتەوە. ئەوەی خوار بێ لەگەلّیان خواهیان بێ بە (دجّال)ی وە (حیّال)ی رێی راستیان بۆ خوار کا بەقسەی خۆشکەلّە خۆشکەلّە دلّخۆش وإقناعیان کا، خۆشیان ئەوێ دوای ئەکەون. عناصری إسلامیە خاصّە (کورد) بەو دەردە زۆر مبتلان، بۆیە لە هەمو عناصری بشر پەرێشان تر و رەزیل ترن (نعوذ بالله من الخذلان)!

﴿وَلُوطًا﴾ كوڕی (هاران) كوڕی (آذەر)ی برازای حضرەتی (إبراهیم). (بعد الهجرة) لە أرضی (بابل) بۆ (سوریە) مامی یعنی حضرەتی (إبراهیم) لە فلسطین قراری گرت، (لوط)یش لە (أردن) دامەزراو دایمەزراند. ﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ﴾ قەومێ منهمك لە سفاهەت. نە ئاگایان لە خوابوو، نەلەبووت وأصنام بوو، بەس تەماشای (صنمی) سادە روویان ئەكرد. بە چاوی خبائث لەبەر ئەوە نظم وشێوەی دەعوەتی (لوط) وەك ئەوانی تر نەبوو حتّا بە بعضێ بۆ عاملی ئەو قومە أهلی (سدّوم) بو قرابتیان لەگەڵ حضرەتی (لوط) نەبوو! ﴿أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ﴾ معهودێ غایەت قبیح! ﴿مَا سَبَقَكُم بِهَا﴾ بەو فاحشەیە ﴿مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٨٠﴾ فەردێكی ئافەریدە، حتّا لە حیوانات ئەو فاحشەیەی لە پێش ئێوە نەكردیە، بەڵكو ئێوە بەو خباثتە لە عالەم پێش كەوتینە. ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ﴾ أمثالی خۆتان ﴿شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ﴾ كە لە أصلی فطرەت (مێ) بۆ لەزەتی إشتهائی لەگەڵ نتیجەی حسنە كە بقای نسلە خلق كراوە، ئێوە لە مێ تجاوز ئەكەن، محضا بۆ إستیفای شهوەت ئەچنە سەر غلمان ومُردان، ئەوە عارێ زۆر گەورەیە رەزالەتێكە حیوان قبولّی ناكا. ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ۝٨١﴾ تجاوزتان كردیە نەتەنیا و بالكلّی إعراضتان لە ژنان هینایە، بەڵكو لە هەموو سیّئات وقبایح لە ئەندازەتان تێ پەڕاندیە. ئەو شناعەتە لە چیەوە پەیا بوو شیوعی كرد؟ توجیهی سەیر سەیریان فەرمووە، أمّا ظاهری سیری أنام ئەبێ لە حضارەت ومدنیەت پەیدا بوبێ، ئەوانە زۆر مُتَرَفّە بوین غەمی چیان نەبووە لە غلبەی كەس نەترساون خەریكی بەزم و رەزم و رەقص و سەما و سەرە بوین تابعی هەوا و هەوەس بوین ،تاكو گەیاندیانە ئەو حاڵە، ألآنیش ئەو فحشیاتە لەناو دێهات وعشائر وقبیلە و بدوی صحرا نیە، لە شارستانان جێی كەیف

وصفا هەیە نەك بەكەمی بەزۆری، وە بعضیَ أماكنی مقدّسە لە خدمەتی ئەو فاحشەیە، سبقی خدماتی هەیە. ﴿وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ﴾ عذرو بهانەیان چیە؟ جەوابی دەنەوە، بڵێن چی؟ هیچ جەوابیان نەبوو. ﴿إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم﴾ (لوط) (وَمَنْ آمَنَ بِهِ) ﴿مِّن قَرْيَتِكُمْ﴾ لەشاری خۆتان ﴿إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾﴾ ئەوانە إنسانیَ پاك وخاوێنن، لەسەر پاكی إستمرار ئەكەن، تخونی ئەو نوعە پیسیە ناكەون، دەریان كەن! مناسبەیان لەگەڵ ئێمە نیە! ئێستاش ئەو نوعە قەشمەریە زۆرە، كەسیَ نوێژ بكا، نەخواتەوە قومار نەكا، پێی ئەڵێن:( بەڵیَ ئەفەندی أولیایە! بە پێڵاوەوە ئەچێتە بەهەشت، ئەڵبەتەش بۆ ئێمە تكا ئەكات!).

﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ﴾ عائلەو أولادی، (ریثا) و (یغوثا) خلاصە أهل وبَیتی ظاهری مؤمن، لەبەر عموم ئەفەرمویَ ﴿إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ﴾ ئەگەر أهل عبادەت با لە ژن و بەس، ئەو إستثنایە نەدەبوو، وە غیری ئەو أهل و بَیتە چ كەسی تر إیمانی پیَ نەهێنابوو، تا ئەوانیش بەبەر أهل بخەین.

﴿كَانَتْ﴾ ژنی (لوط)ی ﴿مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾﴾ لە باقیەكانی بە هیلاك چوون بوو. ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا﴾ بارانیَ عجیب وەك بارانی معهود نەبوو، ئەوە چبوو بەسەریاندا ئەباری؟ لێرە تعین نەكراوە، وە دوایی بیانی ئەفەرمویَ، ئێمەش بە قەدەر ذكری (قرآن) تفسیر ئەكەین، حتا لە قصەی حضرەتی (صالح) باس شربی ناقەی نەفەرموو! ئێمەش تعرضمان بۆ نەكرد! لە كویَ فەرموی(إنشا الله) لەویَ باسی ئەكەین. ﴿فَٱنظُرْ﴾ (أیها الناظر المعتبر!) ئەوەی چاوی إعتباری هەیە تەماشاكا ﴿كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾﴾ ئاگاداری خۆتان بكەن وە بزانن (لِواطە) لە ژن وپیاو یەكە،

یەك وظیفەی هەیە.

لە أصول مقرّرە حفظی (نسل) بەڵگەیێکە لە ضروریاتی دینە وەحتّا (غریزیە) لە حیوان بەڵکو نباتات. (لِواطە) ئەگەر تعمّم بکا نسل ناهێڵێ، لەو جهەتە لە (زنا) خراپترە. وەکەسی تەماشای سیَری عالەم بکا ئەبینێ ئەزانێ ئەوانەی ئەبن بە (مفعول) دەماری نێریان ئەبڕێ کەڵکی ڕێزی رجالیان نامێنێ. حاصڵی شرعا و فطرتاً شتێ زۆر خراپ و بەدە. قوم ئەبێ تربیەی منداڵان بدەن کە ببنە پیاو وعضوێ عامل و کامل لە هیکلی إجتماعی. هەرچەندە أحادیثی زۆر وارد بووە بۆ زجر ومنع لەو خبیثەیە، لکن خەڵکی بە مواعظ گوێ نادا وەناگەڕێتەوە، خاصّە ئەمڕۆ حُرِّیَّتە، ئەوەی بە هەوەس وکیفی خۆی ئارەزومەندی بکا و بدا، چی لەسەر نیە، قانونی دولی معافی کردووە، چارە بە غیری تربیەی چاك چیتر نیە. ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾ چۆوە سەر نظمی سابق. (شعیب) لە جملەی رسلی (عەرەب)ە. ئەوانە چوارن (هود، صالح، شعیب، خاتم الرسل صاحبی قرآن).

(فی الحقیقە) ناوی پێغەمبەران بە سوکی نابردرێ، أمّا ئەگەر أساساً کلمەیێ موصەغر بوو بێتە ناوی زاتێ دوای بوبێ بە رسول، چۆن بووە هەروا ئەخوێندرێتەوە، أصلا تصغیر و تحقیری لێ فهم ناکرێ، با (شعیب) تصغیری (شعب) بێ، زەرەری نیە. (مَدْیَن) باوکی قبیلەیێکە بەناوی باپیرە گەورەیان بردراون، (مدین) کوڕی (إبراهیم)، یا ناوی شخصێ بووە إیمانی بە حضرەتی (إبراهیم) هێنا وەقتێ هاویشتیانە ناو ئاگر. بعضێ ئەڵێن (مَدْیَن) کلمەیێ عەرەبیە ناوی ئاوێکە کە ئەو قبیلە لە دەوری بوون، یاناوی شارەکەیانە. خلاصە لەبەر إختلافی زوبان إنسان بە حقیقەتی ناکەوێ، خصوصی عصبیەتی قومی ودەسیسەی إسرائیلی هەمو شتی تێك دا. ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ﴾ (وَحْدَهُ لا شریكَ لَهُ). ﴿مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ﴾ فی الحقیقە. ﴿قَدْ جَآءَتْكُم

بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ ئەو بیّنە چیە؟ نە لە (قرآن) نە لە (حدیث) ذکر نەكراوە. كەسێ دەعوای رسالەت بكا بێ معجزە، بە صورەتی قطعی تكذیب ئەكرێ، چ لە پێش حضرەتی خاتم چ لە پاش ئەو بێ، ئەوە شتێكە لە دەماغی بشری مركوزە. ئەگەر بەیّنەی زوبان بڕی نەبایێ چۆن ئەی فەرموو بە تفریع؟ ﴿فَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ﴾ بیّنە بە معنا برهانی عقلّی لە أوّلی رسالەت نایەتە عقلّی قوم، قومێ مستغرق لە جهل. تأویلی (بیّنة) بە (موعظة) بێ بێنە ناكرێ. بعضێ ئەلّێن: ((بیّنە نفسی خۆیەتی))، لەو قسە ناگەم! إی حضرەتی (نوح) تێ ئەگەم. أمّا شتێ لە قولی ئەوانەی كە ئەلّێن (شُعیب) كۆر بوە وە دار وەكاظی نەبووە إعتمادی بداتە سەرێ، فهم ئەكرێ، یعنی كۆر بووە بێ دار عصا هاتوچۆی كردیە وەك چاو صاغان، بەلاّم ئەوەش هیچ نیە!!!

لە أوائلی مندالّیم كۆرێ هەبوو لە شاری (كۆیە) (مەلا رۆستەم)یان پێ ئەگوت دزی ئەكرد مالّی ئەبڕی لاشك كەس شكی نەدەكرد كە ئەو كۆرەیە ئەتوانێ دزی بكا، تادەفعەێ بعضە جلكی ژنان بەشەو لە خمخانەی خۆی خمی ئەدا غافلاّنە دێتەوە مالّی خۆی، جلكەكان زەریف ناگوشێ قطرە قطرە خم ئەڕژێتە سەر عاردی لە خمخانە تا مالّێی، سبەینێ شوێنیان بردە سەر مالّی (مەلا رۆستەم)، گەلێ مالّی دزیاری لە مالّەكەی دەركەوت، حتّا دەفعەێ بەشەو ئەچێ بۆ دێی (شێخ مەسوری) ئەبیێ دەنگی پیاوێ لە أهلی دێ وولاّغ لێ ئەخوڕێ ئەوا دێ بۆ (كۆیە) (رۆستەمی كۆر) خۆی ئەخاتە كەمین تا پیاوەكە نێزیك ئەبێتەوە دەنگی لێ ئەدا هجومی ئەكاتە سەر ئەیگرێ رووتی ئەكا ئەیبەستێ وولاّغەكان ئەداتە پێش خۆی بۆ دێیەكە ئەڕوا، ئەو حكایەتە بۆ أهالی ئەگێڕێتەوە، بعضێ ئەچنە سەری، كورە فلاّن چت لێ قەوماوە؟ فلاّنی دەنگ مەكەن تا ئەچینەوە دێ، لەوێ حكایەتتان بۆ ئەكەم! نزدەم هاتنە سەر رێ چەندپیاوێ بە قوەت دەوریان لێ دام گرتمیان بەستمیان وولاّغەكانیان برد، (مەلا رۆستەم) ئەلّێ لە قورت نێم والله هەر ئەمن بوم بەتەنیا رووتم كردی

لە ترسان ئەوەندە هۆشت نەما تەماشام بکەی کۆرم؟ چاو صاغم؟ کێم؟ کێ نیم؟.

زۆر کۆر هەن لە کۆرانی شاری (کۆیە) باوجودی زۆر ناهەموارە، بێ دار، بەسەربەستی ئەگەڕێن. کۆرێ هەیە لە دێی ئێمە (پێبازۆك) ناوی (لطیفە) دەچێتە کاروان، بۆ شاری کۆیە دێت دەچێتە (بیتوێن) چ پەکی لەسەر دار ناکەوێ، حتا وا ئەبێ مەڕێ بزر ئەبێ ئەگەڕێ لەناو مێگەلی خەڵکی مەڕی خۆی ئەناسێتەوە.

خلاصە ئەوانەی بە منداڵی کۆر ئەبن یا زگ ماکن، زۆر بەحس ئەبن ذهنی غریبیان ئەبێ، أمّا (عافانا الله) ئەوانەی بە گەورەیی کۆر ئەبن، زۆر شپرزەو ذهن کۆرو ناشارەزا ئەبن، بەدەست راکێشان نەبێ رێ دەرناکەن، دار عصا کەڵکیان ناگرێ.

دیارە قومی (شعیب) زۆر خیانەتیان کردیە لە پێوان وکێشان، بۆیە لە أوّلەوە ئەو أمرەیان پێ ئەکا. ﴿وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ﴾ هەرکەسێ بێ لە خۆتان لە غیری خۆتان. ﴿أَشۡيَآءَهُمۡ﴾ هەرچی بێ. بە بیع وبازار، یا لە أمانت ورهن وإستعارە. (بخس) بە معنا (نقصە). ﴿وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَاۚ﴾ بە شرائع وأحکامی إلاهی. رسالەتی ئەو زاتە پاش هاتنی گەلێ رسل بووە، طبعاً ئەوانە إشتهاریان بۆ بووە. ئەو قەومە، کە قەومێ ئەڵێن لە أولادی (إسماعیل) بوون، ئەڵبەتە شتێکیان لە شرعی (إسماعیل و إبراهیم) ئەزانی، وەك زەمانی (نوح) نەبوین، فەرقیان نەکردبێ لە بینی إصلاحێن یەك طبعی، یەك شرعی. ﴿ذَٰلِكُمۡ﴾ ئەوانەی ذکر کران ﴿خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾ چاکترە بۆ ئێوە، لە قازانجی نقصی کیل و وزن وبخس ورێگری. ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٨٥﴾ بەخواو رسالەت. چ نەبێ ئێوە لە أولادی (إبراهیم)ن، هێندە دوور نەکەوتینەوە، یا ممکنە بوبن بە ملحد مشرکی غلیظ مُتَکَبِّر مُعاند (معاذ

الله) ئەگەر بالمرە کافر بوین، خێرتان زیادیتان لای خۆتان، هەر لە خیانەت وفساد دا ئەبینن، کەوابێ ئەو شرطە شرطێ زۆر بەجێ یە، إضطرابی مفَسّرینان پێویست نیە لەسەر إیمان بە (شعیب) وە إیمانیشیان پێ نەبووە ! ! !

تەماشای تفسیری (سیّدین) بکە چەند قسەی سەیر سەیریان تیایە ! !

﴿ وَلَا تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ ﴾ ئێو نەهیە پاش إنتشاری دەعوەتە فی الجملە).

ئەوانە وەك صنادیدی قریش رێ بەندانیان ئەکرد نەیان ئەهێشت خەڵکی بچێتە خزمەت (شعیب)، ئەوی ضعیف با تهدید وتخویفیان ئەکرد بە قتل. ﴿وَتَصُدُّونَ﴾ سعی لە وەرگێرانی ﴿عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ی ئەکەن. ﴿مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ﴾ کە مرتدیان بکەن لەسەر رێی حەقیان نەیێڵن. ﴿وَتَبْغُونَهَا عِوَجًاۚ﴾ خواراتیان ئەخواست بۆ رێی راست. إلقای شکوك وشبهاتتان ئەکرد،ذەمی (شعیب)،و ئاینی ویتان ئەکرد تاعالەم نفرەتی لێ بکەن. (سبحان الله) ئەو نوعە تزویرە چەند مشهورە ومؤثرە، قَدحْ وذَمّی شخصێ ئەکەن، إنسان بلا محاکمە نفرەت لەو شخصە ئەکا ئەیکرمێنێ حەز لە چارەی ناکا حتّا ئەوە لە بەینی أهلی علم زۆر منتشرە، لە أوّلی نشأتی علم ذەمی کەسێ وەك (شێخ علی أبن سینا) زاتێ وەك (أبن تیمیة) ئەبێی لە بعضە مامۆستایەك، رقت لێیان ئەبێتەوە، ئەگەر خوا رەحمت پێ نەکا لەسەر ئەو بغضە ئەمێنی لە علمیان محروم ئەبی، بۆیە من وصیەت لە تلامیذی خۆم ئەکەم: (بەو نوعە ذمّە هەڵ نەخەڵەتێن ئەگەر خۆتان لە تألیفاتی ئەوانە شتێ خراپتان دیت، قبوڵی مەکەن! وە بە ئەوەندە، لە قسەی چاکیان خۆتان محروم مەکەن، مەسەلەیێ ترکیە ((بالقی باشنن قۆقار- ماسی لە سەریەوە بۆگەنی ئەبێ)).

لام وایە لەبەر زێدە مناسبەی قَولەکانی لەگەڵ قومەکەی جەنابی رسولی کبریا دەربارەی حضرەتی (شعیب) فەرمویەتی (خطیب الأنبیاء).

﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ كُنتُمۡ قَلِيلٗا﴾ (مِنْ حَيْثُ العَدَد) یا (مِنْ حَيْثُ العُدَد) یا هەردووکی. ﴿فَكَثَّرَكُمۡۖ﴾ زۆری کردن زۆری پێ عطا کردن، زەلیل بون کردنی بە (عزیز). تَذَکُری ماضی لە شێوەی إنسانیەتە، بەلاّم کەم کەس لە خۆشی لە عزیزی یادی زەمانی ناخۆشی و زەلیلی ئەکات، بەڵکو وا مغرور ئەبن ئەوەی لە زەمانی منکوبی مساعدەی کردینە لە سایەی ئەو بوینە شتێك، وەك سەگ بە قاپیا ئەرزین،گەزی چی جاوی چی ؟ ﴿وَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٨٦﴾ وەك قومی (نوح) وەك (عاد وثمود). تەماشاکردنی أحوالّی أمم بە چاوی إعتبار زۆر بە فائدەیە بۆ قەومێ کە ئارەزوی عزو بقا بکات. کەسێ لە روحی (تأریخ) بگات ئەزانێ (تأریخ) چەند بە فائدەیە! ئەوانەی ذمّی تأریخ ئەکەن حقیقة لە روحی تأریخ نەگەیشتون! ﴿وَإِن كَانَ طَآئِفَةٞ مِّنكُمۡ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ﴾ لە توحید وأحکام. ﴿وَطَآئِفَةٞ لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ﴾ بە هیچی بەلاّم ألآن فەرقی (بین الطائفتین) زۆرە، طائفەی (کفر) فضل لە (کفر) رێی هدایەت ئەگرن خەریکن ئەوانەی مسلّمانێ وەریان گێڕن.

﴿فَٱصۡبِرُواْ﴾ (أيها المؤمنون)! صبرو ثبات بکەن غیرەت.بنوێنن، ئەگەرچی کەمن زۆر ئەبن، ئەگەر چی ضعیفن، بە قوەت ئەبن، ئەگەرچی بێ دەسەلاّتن، بەدەسەلاّت ئەبن. ﴿حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ بَيۡنَنَاۚ﴾ بە حکمێ عملی. شبە نیە نصرەتی ئێوە ئەدا. ﴿وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ٨٧﴾ مەیل وحەیف تیا نیە. فی الحقیقە ئەو خطابە جلیلە روحێکی حماسە ئەداتە أهلی إیمان أملیان بە قوەت ئەبێ، ئەوە لە (مختاری) حقیرە، وە دروستە خطاب بێ لەگەڵ (کفّار) وەخطاب بێ لەگەڵ (فَريقَيْن)[1].

---

[1] – تەواو بوو جزأی هەشتەم، رۆژی پێنج شەمەو ١٩ی ربیعی ثانی ٢٦ حزیرانی رۆمی (١٣٥٥ هجری قَمَری)، ١٩٣٦ میلادی.

أوّلــی ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ﴾یــە. کــە ئــەو خطابــە پــڕ حماسەتیان گوێ لێ بو تأثیرای غَضَبیان هاتە جۆش سوێندیان خوارد، أمّا نـازانم بەچـی؟ ﴿لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ﴾ بلَـدی خۆمـان. کَأنَّهُ حەقی (شعیب) و أتبـاعی تیانـەماوە. ﴿أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا﴾ یـا دەرتـان ئەکـەین یـا ئـەبێ بگەڕێنـەوە. وە مقصـدی أهمیـان ئـەوەبوو،یعنی تهدید بـە دەرکردنیان، بۆ خاطری قبولّی کردنی إرتـداد بـووە، وە نـەیان ئـەزانی ئەوانـە روح و أولادو مەفتەن فدای إیمـانی حـەق ئەکـەن، وە بشاشـەتی إیمـان لەدلّدا ناچێتەدەر وە ممکنـە بلّێن لـەو خطابـە هـەر نـوعێ بـێ هاتـە خـاطریـان گـەر (شُعَیب) و إتباعی والێ بگەڕێن، جوستە جوستە زیاد ئەکەن، أخر الامر یا ئێمە دەرئەکەن یا ئەبێ تَبَعیەتی بکەین. بناءً عَلَیْه (علاجی واقعه قبل از وقوع بایـد کرد)، ئەبێ یا دەریان کەین یا وەرگەڕێن و بێنەوە ناو ملتی خۆمـان. ئەوانـەی ئەلّێن (أنبیاء) معصوم نین لە (کُفر) قَبْلَ النبَوه، بـە امـری ئـەو ملتـە إسـتدلال ئەکەن لەسەر کفری حضرەتی (شُعَیب)، أما ئەوە إستدلالێ هیچە ! قەیدی چیە ئەوان وایان گومان بردبێ ئاگایـان لـە خصوصـیاتی (شُعَیب) نـەبوبێ خـاصـةً إیمان وجدانیە لە کَیفیاتی نَفسە وە ممکنە ئـەویش و گـەلێك لـە اشـرافیان ئـەو سَیِّئاتانەیان نەکردبێ! ! ! من (یقین)م هەیە ئەوەی شـریکی ملـتی (کُفـر) بـێ، نابێتـە پێغەمبەر، ئەبێ بە مؤمن ئەبێ بە إنسانی باش ئەگەر دَناسَتی کُفـر زۆر تأثیری تێ نەکردبێ، بە دەعوەتی رەسولێ یابە هۆشی خۆی قبحی ملـتی کفـر درك ئەکا لێی ئەگەڕێتەوە، لکن ناگات بە منقبەی رسالەت. ﴿قَالَ﴾ حضرەتی (شُعَیب). ﴿أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾﴾ ولو پەشیمانی ناحُبێنین ئێوە جبراً دەرمـان ئەکەن، یا لە دین وەرمان ئەگێڕن، ئەمە ممکن نیە، ناتوانن نەدەرمان بکەن نە مُرتَدْ، صبرو ثبات ئەکەین رووحمان بەخت ئەکەین سەرمان داناخەین ئەو ذلتـە قبولێ ناکەین.﴿ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ إفترای صرف درۆ، بـێ وجـەوبێ معنـا.

﴿إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم﴾ ناڵێن ( في مِلّتنا). ﴿بَعۡدَ إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ﴾ بالكلی یە لێی دەرچوین، خوا لەو ملتە ئێمەی نجات دا، بگەڕێینەوە ناوی؟ ئەمە چۆن ئەبێ؟ حاشا قط نابێ محاڵە!!! ﴿وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ﴾ (أي إليها). ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ﴾ مەگەر خوا حەز بكاو إرادە بكا، خۆ خواش ئەو إرادە ناكا أصْلاً وَلَوْ حَسْبَ الظّن لە دائرەی إمكان دابێ. چۆن خیاڵ ئەكرێ جەنابی حەق رەسولی بە حەق بنێرێ مۆیدی بێ بە معجزە قسەی لەگەڵ بكاووحی بۆ بنێرێ جمعی لە فطرەت بە فساد نەچوەكان إیمانی پێ بێنن، دوایێ ئەوە خوا إرادە بكا ئەوانە بگەڕێنەوە ناو كفرو ضلال و فساد؟ حاشا ئەوە حَقیقةً لە إمكان دا نیە! ﴿وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ﴾ علمی ئەو إحاطەی بەهەمو شتێ دایە بە ڕاستی ئەو ئەزانێ چی ئەبێ چی نابێ؟ چۆن ئەبێ، چۆن نابێ، چ ممكن، چ محاڵە! شتی وا هەیە لای اهلی علم ممكنە لە فرضی وقوعی ظاهراً چ إستاحالە نابینن،(مَعَ أنهُ)لای خوا فی الحقیقة مُمكن نیە. گەلێ أمور إمكان و إمتناعی خَفیە، مەلایانی بە دِقّەتیش تیای بە غَلَط ئەچن ﴿عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ﴾ تَوكّلْ و إعتمادمان لەسەر خوایە صَبرو ثبات ئەكەین! بە پشتوانی خودا مُقابلە ئەكەین! ناڕۆین لە وەتەن! وە نایێینەوە ناو ملتی ئێوە! (وَمَنْ يَتَوكّلْ علی الله فَهوَ حَسْبهُ) ﴿رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ﴾ فصلمان لە بەینا بكا بەسیە، یا ئێمە، یا ئەوان ﴿وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ ٨٩﴾ لاشك نصرەتی حەق لەسەر باطل ئەدەی! بەندەكانی ڕاستی خۆت ضایع ناكەی. ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ﴾ مُقابلی ئەو جَلاددت و صَبرو مَتانە، شلیان كرد، خۆ بە خۆی ئەیان گوت ﴿لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا﴾ ببن بە ژێراكێشی وی دوای كەون ﴿إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ٩٠﴾ ڕئاسەت و گەورەیتان لە كیس ئەچێ وەك شاعر ئەڵێ:-

(مَرا مَرگ بهتَر أزین زیندەگی كی سالار باشَم كُنَم بَنْدگی)

﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ﴾ زەلزەلـە=بلـەرزەك. زاتـا ئـەوەی بترسـێ بـەو لـۆزە لـەرزە، ئـەمرێ. ﴿فَأَصْبَحُواْ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩١﴾﴾ وەك قـەومی نـا صـالحی (صالح). ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَا﴾ دارو دیاریان وا وێران بو كأنّه ئەو مُكَذِّبانە لەو بلدە إقامـەیان نـەكردبوتیای دەولەمەند نـەبوبون گـوزەرانێ خۆشیان تیا نەكردبوو،یعنی أثرێكی وایان نەمابووكە دەلالەت لە عیمرانێ بكا. قـەومێ بـە خیانـت لـە كیـل و وزن و نقصـی حقـوقی عبـاد خـەریك بـن، دەولەمەندیش بین بێ أثر ئەبن، (بَیت الظالم خراب ولـو بعد حـین). ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيْبًا كَانُواْ هُمُ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٢﴾﴾ عكسـی عمَـل. لای خۆیـان وابووئەگـەر إمانیان پێ هێنابا خسارەت مەند ئەبون ئەبونـە ژێردەست، وەك (صـنادید)ی (قریش) وایان گومان ئەبرد ئەگەر تبعیـەتی (رسـول الله) بكـەن رئاسـەتیان لـە كیس ئەچێ ئەبنە ژێر دەستی (بنی هاشم)،(مَع أنّه)زۆری پێ نەچووبونە (مَلِك) إسـتیلای رقـابی هاشمینیـان كـرد (لا الـه الا الله). ﴿فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ﴾ رووی لـێ وەرگێـڕان، پـاش تەماشـاكردنی كـەلاكیان. ﴿وَقَالَ يَٰقَوْمِ﴾ بـەلام نـە لـەرووی أسف وەكی (صالح)ی! ﴿لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى﴾ ئەوانەی پێی هـەناردم ﴿وَنَصَحْتُ لَكُمْ﴾ نصیحە ئەكەم بۆ نفعی ئێوەبو، مقصد چیتر نەبوو،بێ غل و غـش نصیحەتم ئـەكردن، گوێتـان نـەدامێ، تـا بـەو نوعـە بـە هـیلاك چـون. ﴿فَكَيْفَ ءَاسَىٰ﴾ چۆن محزون ئەبم تاسف ئەكـەم؟ ﴿عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٩٣﴾﴾ خصوصی كفری عنادی، كفری فسادی.با بمرن! قیروسیا، جهنّمیان لێ پڕ بێ. بنایە رأی (سید رشید): حضرەتی (صالح)یـش ئـەو فەرمایشـەی فـەرموە، وە حضرەتی (شعیب)یش لەگەلّ ئەو قسە (وَلٰكِنْ لا تُحِبّـون النّاصـحین)ی فـەرموو بەقاعدەی (صَنْعةُ الاحتباك بدیع)ی، هەر كلامە، شتێكی لێ حذف كراوە.

بەلام ئەو إحتباكە، زۆر دورە! هەر (قَوْل)ە (قَوْل)ی زاتێكە، یەك جملە نیـە

قَرینی یەك بن، وە فصل خراوەتە بەینیان بە قصەی (لوط)، کەوابێ ئەو إحتباکە بێ إشتباکە، بەڵێ ئەگەر لە کلامی یەکێکیان جارێ ئەو جملە جارێ ئەم جملە ذکر کرابا ئەبوە إحتباك.

دقت بکەن معاملەی مَلأی قَومی (شعیب) لەگەڵ (شعیب)، زۆر مطابقە لەگەڵ معاملەی مَلأی (قریش) لەگەڵ خاتم الرسل، أما لله الحمد قومی رَسولی أکرَمْ بەو نوعە عذابە مُتأصل نەبون، بعضێ بونە طعمەی شمشێری ئابدار، باقی مسڵمان بون، ئەوەش یەکێکە لە رەحمەتی (رَحْمَةً لِلْعالمین). ئەو پێغەمبەرانەی قومیان بە عذابی (سماوی) فەوتان، خۆشیان وتبعەشیان نەماون، کتابیان وأحکامیان تحریر نەکرا، ئەو زەواتانە ئەگەر لە (قرآن) ذکر نەکرابان، بێ ناونیشان ئەمان. ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ﴾ شارێ بلدێ ﴿مِّن نَّبِيٍّ﴾ هیچ رسولمان نەهەناردوتە سەر قومێ لە أهلی (قری) ﴿إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ﴾ أمّا أخذێ تأدیبی، بۆیە ئەفەرموێ﴿لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾﴾ بەڵکو ئەگەڕێنەوە لە خراپە، ئەپاڕێنەوە لەبەر خوا، إصلاحی حاڵی خۆیان ئەکەن لە بطشی إلاهی، لە هجماتی دوشمن أمین وئاسودە ئەبن، ئەوی أهلی إعتباریا بە زەریفی ئەگەڕایەوە خۆی بە قوەت وجوان ئەکرد بە عدالت وە إعماری بلادی ئەکرد، ئەوەی بێ إعتباریا لەبەر إنهماکی فی الشهوات ئاگای لە خۆی نەبا أخذی تأدیبی تأثیری تێ نەئەکرد لە فسادو شرور زیادی ئەکرد مستوجبی هلاك ئەبو ﴿ ثُمَّ﴾ لەسەر ئەو حاڵە ﴿بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ﴾ لە جێی خراپە کە لایەقی بونن چاکەمان دائەنا، بأس وخراپەمان لەسەر هەڵ ئەگرتن ئەکەوتنە رفاهو خۆشی ﴿حَتَّىٰ عَفَواْ﴾ زۆر ئەبون نمایان ئەکرد، ئەوجا بالمرە لە رێ دەرئەچون، مغرور ئەبون. ﴿وَّقَالُواْ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ﴾ ئەو چەرخ ودۆلابی فلکە، لە دونیا ساردی وگەرمیش ئەبینن، توشی هەرزانی وگرانیش ئەبین (فیوم لنا ویوم علینا) (وَیَوْمٌ نساءُ ویمٌ نسرٌ)،

باوکانمان(آباء)یشمان وابوین ناخۆشی وخۆشیان پێ گەیشتوە، تقلباتی زەمانەیان دیوە. ئەورۆ ڕۆژتانە تۆڵەی آیّامی محنە بکەنەوە! خلاصە بۆ وقایە، بۆ إصلاحی شئون بۆ تأمینی إستقبال تێ نەکۆشیون، أهمیەتیان نەداوەتێ، غافلێ تریوین. ﴿فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٩٥﴾ ناگەهانی گرتنمان ئەوان بێ ئاگابون لەبەر رووچوون لە جهالەت تفکیریان لە سوءی عاقبەت نەبو. ﴿وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ﴾ إیمان بە وحدانیەتی إلاهی مبدأو أساسی نجاتە چونکی جهەتی وحدەتە، وحدەت غایتێ متینە، أما کە شرك هاتە ناو شرکی دینی مذهبی إعتقادی، ئەو رابطە سست ئەبێت هەر کەس لە رێی إمامی خۆی معبودی خۆی سعی ئەکا غایت وأمل مختلف ئەبێ، ئەو قومە پەڕاگەندە ئەبن وقابلی إتحاد نابن. (تقوا) چیە کە ببێتە باعثی سعادەت وفتحی أبوابی برکات؟ تەنها نوێژو ڕۆژو نیە! پستەپستی تسبیحات سرتە سرتی صلوات، های هوی حای حوی حالێ وجذبە، بۆ ئەو فتوحاتە کەڵك ناگرێ، بەڵکو دەرکەی بەرەکەت ئەبەستێ. (تقوا) لە فَحشیّات وسَیّئات (ما ظهر منها وما بطن)،لەمایەی فسادو فتنە وخلاف خۆپاراستن سعی بۆ طاعەت وعباداتێ کە موجب بێ بۆ إتحاد وإتفاق. ئەگەر أهلی (قری) هەر قریەیێ بێ، ئەو إیمانەیان بینابا ئەو تقوایەیان کردبا ﴿لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ أنواعی بەرەکەت مادّی ومعنوی علوی وسفلی، لە طرف خوا بۆیان ئەکراوە، نائلی سعادەتی دنیاو اخرەت ئەبون. بە صورەتی قطعی بزانن إیمانی راست تقوای حقیقی باعثی ترقیاتی دنیایە هەروەکو موجبی سعادەتی أُخرایە. حکماء ئەفەرمون مبدأ واحدە، هەرچی وەحەدەتی زیاتر بێ، مناسبەی لەگەڵ مبدأ پترە فیضی مبدأی زیاتر بۆ دێت (یَد الله علی الجماعة). هەر قومێ إختلافیان زیتر بن، لە خوا دوور ترن، بۆیە بێ هێز ئەبن، بەبن ئەکەون ﴿وَلَٰكِن كَذَّبُواْ﴾ بێ إیمان وبێ تقوامان ﴿فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٩٦﴾

أعماليان، موجبه، مستلزمه، بۆ أخذو عقاب وگرتن، إنفكاكی نيه، به إعتقاد قطعی علاقه له بينی كائنات نابیٚ! ﴿أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ﴾ مؤمن وكافر. ﴿أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَٰتًا﴾ شدّەت و عذاب، حاڵيشيان وايه ﴿وَهُمْ نَآئِمُونَ ٩٧﴾ نوستوون له خەوی غفلّەت دان چۆن أمين ئەبن؟ قومیٚ ولو إيمانيشی بەخوا نەبیٚ ئەگەر نوعه هۆشێكی هەبیٚ چۆن أمين ئەبیٚ له مصائبی دهر؟ وەكی (حاجی قادری كۆيی) ئەڵیٚ:—

(أمين مەبه له سبەينیٚ كه چت بەسەر دیٚ
حوادثاتی زەمانه كه نايەته تخمين)

﴿أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى﴾ لەوەقتی (ضحی) كه ضوءی رۆژه له أوائلی رۆژ بڵاو ئەبیٚ بەسەر أرضدا دیٚ بەتەواوی روناكی ئەكا ﴿وَهُمْ يَلْعَبُونَ ٩٨﴾ (لَعب) بەكاریٚ ئەڵێن كه فاعلی بەكردنی، مقصدی جلبی نفع ودفعی مَضّرەت نەبیٚ، بۆ لَذّەت، ياخود غافڵانه له وقت بەسەر بردن، بيكا. (سيّد رشيد) ئەفەرمویٚ: (رياضەتی بدنی لعب نيه، ولوپێشی بلّێن لعب). ئەوانه ئەگەر أمين بن سبب وموجب بۆ ئەو أمنه چيه؟ قوەت ومكنه وثروت و سامانه؟ ئەمه خۆی نيه! كەسیٚ له تداولی أيام بفكریٚ تأريخی أنام بێنێته بەر نظر، بەو حاڵی حاضره هەڵناخەڵەتیٚ، بەڵكو بۆ دەوام ئەبیٚ سعی بكا، به إحترازو إحتراس تربیٚ. مرحوم (سليما نظيف بگ) والی موصل ئەيفەرموو: (دروست كردنی بناییٚ عظيم زَمَحْتَمْ سهله، بەلاٚم لازمه له أوّلەوه دوشونميشی إدامه بیٚ)، يعنی إدامه زەحمەته، إعتنای زۆر پیٚ ئەویٚ. فی الحقيقه زۆرمان ديت، زۆرمان بيست دەوڵەتیٚ تشكلی كرد گەوره بوو توسّعی كرد، مع الاسف أخلافی ئەو مەردانه، إدامەی نەتوانی، عاقبەت پەڕاگەندەبوون ومەحو نابووت بوون.. ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِ﴾ تدبيرو سياسەتیٚ خفی. ﴿فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ٩٩﴾ ئەوانەی أمين ئەبن له مكری خوا، چيان بيستووه

كە إعتمادى بكەنە سەر؟ چۆن خوا قواعدى مقررەى خۆى بۆيان تێك ئەدا؟ بە مُجَرَّدى إيمانى بىٚ ثمر إنتسابى بىٚ نِسبَتْ آمين ئەبن؟ يا إعتماد ئەدەنە سەر خوارق؟ بەمندالّى (تصريف)مان ئەخوێند پێيان نيشان ئەدابن (شاذ) (قاعد)ە تێك نادا، نازانم بۆ تێى ناگەين؟ سوادى أعظم بە تەماى (كَرامَتْ) لێى گەڕاون، تصريف خوێن ومفسرەكانيش فرقيان نيە، بحرى علوم ومعارف محيطە بە تأريخى عالەم كە هاتە باسى (خَوارِقْ) چى لە فكر نامينىٚ هەموو قواعدى علم وعمل تێك ئەدات ﴿أَوَلَمۡ يَهۡدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ أَهۡلِهَآ﴾ يعنى بۆ ئەوانەى أرض بە ميرات ئەگرن لەپاش فەوتانى ئەو أهلەى كە پێشدان بەرحيات بون إعمارى أرضيان كردبوو، بيان وئاشكرى نەكردوە؟ تَبَنِّى نەبووە؟ ﴿أَن لَّوۡ نَشَآءُ أَصَبۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡۚ﴾ چيان لە أقوامى سالفە زياترە؟ بۆچى ئەوان بە گوناهيان گيران؟ بۆ ئەمانە ناگيرێن؟ ﴿وَنَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾ وەك أسلافيان عقلّ وهۆشيان لىٚ تێك ئەچىٚ دلّيان ژەنگاوى ئەبىٚ بە نەوعىٚ كە ئەوى خێر بىٚ ناچێتە ناويان، ئەوجا خوا چاپيان لەسەردا ئەنىٚ ئاگايان لە مصالح نامينىٚ. ﴿فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ١٠٠﴾ كە گوێى دلّ كەڕ بوو، هيچ نابيىٚ. فى الحقيقە ئەو ايەتە كريمە زۆر قيمەت دارە ئەبا موسلّمانان گوێى لىٚ رابگرن بەدلّ تێى بگەن، مقابلى ايەتى إلاهى، بە قسەى خۆشكەلّە خۆشكەلّە هەلّنەخەلّەتێن، بە رواياتى واهى واهى دەست لە اياتى إلاهى هەلّنەگرن ﴿تِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰ﴾ غابرەى غامر تفاصيل، تأريخيان لەبەر طولى زەمان و بە ئافات بە هلاك چونيان مجهول. ﴿نَقُصُّ عَلَيۡكَ مِنۡ أَنۢبَآئِهَاۚ﴾ ئەوەى بۆ أهلى إعتبار كەلّكى هەبىٚ، أخبارى مُحَقَّق ومُقَرَّر، بىٚ خرافەتى حكايەت خوانان. ﴿وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ﴾ گەلێك لەو بلادى بائدەيە. ﴿رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ لە (نوح) تا (شعيب) هەموى صاحبى معجزە بوين، با بە خصوصى إى بعضيكيان ئەزانين چيە؟ كە نەمان

زانی لازم نیە تأویلی (بیّنە) بکەین! ﴿فَمَا كَانُوا۟﴾ سوادی أعضم لە أهلی (قری). ﴿لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ مِن قَبْلُ﴾ پێش إظهاری معجزە. ولو ایاتی مقترەحەی خۆیان بۆ هاتبێ، إیمانیان نەهێنایە، لەسەر تکذیب ماون، إصراریان زیاد بووە.

﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٠١﴾﴾ ئەوانەی راسخی فی الکفرن، قابلیەتی إیمانیان نەماوە، مُحَقق بزانن دلّێ (أدنی) قابلیەتێکی إیمان وعرفانی تیا بێ تیای مابێ، خوا لە طبع وچاپی کفری نادا! کفر لەو دڵەدا خلق ناکات. أسباب وعِلَلی دلّ رەقیان ظاهرە معلومە ﴿وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم﴾ لە اهلی (قری). ﴿مِّنْ عَهْدٍ﴾ عهدی فطری، یا ئەو عهدە کە لەگەڵ رسولیان ئەکرد، ئەگەر ئەو معجزەی طلبی ئەکەین بۆمان بێنی، إیمان دێنین، لام وایە ئەمە ظاهرە. یاخود عام یعنی هیچ عهدیان نەهێنایتە جێ، ئەو بەلآیە لە هەموو بەلآیان گەورەترە، أثری سوءی لە أیّامی ئێمە ظاهر بووە. سەرامدانی سیاسەتی أوروپا بەدەرکەوت حتّا أدیاو فلاسفەی خۆیان ئەڵێن: (قطعاً أعتبار بە عهدو حلف ومیثاقی دوَلِ غرب نیە)، زێرا هەموویان تابعی مصلّحەتی خۆیانن لدی الایجاب عهدو ناموس وشەرەف و وەفاو صداقەت ودۆستی ئەوهاوێنە ژێر پێ. فی الحقیقە لە رووی بێ ناموسی وبێ عهدی غرب بەسەر شرق غلبەی کرد.

ئەوانەی بێ عهد بن إیمانی چی و چاکەی چی؟ ﴿وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَٰسِقِينَ ﴿١٠٢﴾﴾ ئەوەندەمان لێ دیتینە، بەراستی فاسقن، لەگەڵ فسق عهد ناشکێنن.

(سبحان الله العظیم) عظمای إسلام ئەو ایەتەیان بیستیە، بەلآم مَعَ الاسف تا ئەو اخرە، تێی نەگەیشتن کە رجالی سیاسەت بێ عهدن، پێیان هەڵخەڵەتان، عَزوەی أخوَّت ورابطەی دینیان لەگەڵ یەك شکاند پساند، بەگژیەکا چون

ولەباڵێ يەك هاتنە دەر (باوڕ بكە ئاڵانيش زۆر كەس بڕوايان پێ ئەكات)!

ئەو قلب و دڵانە لاشك نوعە طبعێ الاهيان لەسەر دانراوە، سبببيش عينى سببە (نعوذ بالله من الخذلان)! ﴿ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ عطف بە (ثُمَّ) زۆر موافقە. رسالەتى رسلى سالف الذكر طرازێكى هەيە، رسالەتى (موسى) طرازێكى ترى هەيە. وە (بعث)ى أخص لە رسالەت (من حيث المعنى) عنايەت وإهتمامى لە عام بە قووەت ترە. حاصڵى لە پاش ئەو رسلى كرام وإبادەى قەوميان، بايەكێ لەوان وەك (شعيب) معاصرى زەمانى رسالەتيش بوبێ، زەرەرى نيە، چونكێ بەو جهەتە سبقى بووە، (موسى)مان نارد ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ﴾ مشهور وايە (موسى) لە (مو) بە معنى (اوساى) بە معنى (دار) وەرگيرايە چونكى آلى فرعون ئەويان لەناو صندوقێ دار بەئاودا دراى گرتەوە، ئەبێ پێش بەئاودا درانى ناوى لێ نەندرابێ، بەڵام لە هامشى تأريخى عمومى توركى ئەڵێ: «موسى» كلمەيێ مصريە لە (مَه سَوْيە) بە معنى چوجق=منداڵ.

(فرعون) لَقَبى ملوكى قُدَماى مصرە. معناى أصلى چيە؟ وەلە چى وەرگيراوە؟ فِرْعَونى (موسى) ناوى چى بووە؟ (سيِّد رشيد) ئەفەرموێ: (لە آثارى مصرى چى وا بەدەر نەكەوتووە شتێكى تيابێ بەيانى ئەوانەى تيابێ)، وادياره بە قسەى مەلايەكانى عەرەب راضى نيە. ئەو زاتە لە (عمالقە) بووە ناوى (وَليد بن مِصْعَبْ بنِ ريَّان) بووە، ياخود ناوى (قابوس) بووە بەو (كُنيە) يە (أبوالعباس) قيل (أبو مُرَّه) قيل (أبو الوليد) مشهور بووە. (سيِّدى الوسى) لە كتابى (نَقَّاش) و (تاج المِقراض) نقل ئەكا فِرْعَونى موسى باوكى حضرەتى (خضر) بووە، قيل ئەڵێ (كوڕى خضرى بووە)، ئەمانە قسەى قورقوڕو هيچ وپوچ وبێ سند و ثبتن. بەڵام دواى تفسيرى ئەو جزأە هەر لە زەمانى (سيِّد رشيد) أهرامى فرعونى(موسى) كشف كرا، رێ دۆزراوە ناوى معلوم بوو، لە موقعێ مناسب انشاالله شتێكى لێ ئەنووسين.

ملأی فرعون أشراف وأرکانی دەوڵەتیە، بۆچی نافەرموێ (وَقَوْمِهِ)؟ (سیّد رشید) ئەفەرموێ چونکی أهلی (مصر)یش لە ژێر أسارەت دابوون (لیس لهم من الأمر شيء) چیان بەدەست نەبووە مُحقَّر بوون، نهایت ظلم لەسەر بنی إسرائیلی زیاتر بووە. وا دەرئەکەوێ کە سلالەی حکمداری لە (مصر)یان نەبوە،(سبحان الله) تا ئەمڕۆ کەسێ لە خۆیان نەبوویتە حکمداریان، (محمد علی پاشا) مۆئەسس وخانەدانی ملك وسلطنەت حاصرە (أرنهوت) بووە، بەلاّم بۆ مصریان لە مصریان چاکتربووە.

﴿فَظَلَمُواْ بِهَا﴾ بەواسطەی ایاتی الاهی ظلمیان کرد، لەکێ؟ لە خۆیان یا لە بنی إسرائیلی، یعنی زێدە شدّتیان لەسەر کردن کأنّە ظلمی سابق بە ظلم حساب نەبوو ﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾﴾ وظیفەی ظالم تێکدانی أموری چاکە، عاقبەتی فسادیش وێران و مەحوو نابودیە ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰفِرْعَوْنُ﴾ ئێرە جێی (ف)یێ نیە لام وایە بۆیە (زُمَخْشَري) قسەی لێ نەکردیە، بەلێ ئەگەر لە پێش (فظلموا بها) ذکر کرابا جێی گفتوگۆ بوو، چونکی هەردووك ئەصلّحان، بەلکو بە مناسبەی قصص (ف)یێ أنسب بوو ﴿إِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾﴾ هەناردراوم بۆ سەر تۆ لە طرف خوداوەندی عالەم ﴿حَقِيقٌ عَلَىٰٓ﴾ حرفي جرّە بە تخفیفی (ێ)یە لە قرائەتی مشهور، لە قرائەتی نافع و مجاهد بە تشدیدی (ێ)یە، ئەمە معنای ظاهرە. ﴿أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ﴾ حقیق بە جدیرو لایق ئەڵێن (علی) بە معنا (ب)یە یعنی ئەمن لایقم بە (أنْ لا أقولَ)، نەڵێم لە جهەت خوا إلاّ حەق، ئەوی بیڵێم حەق بێ، غیری حەق نەڵێم. بعضێ تضمینی بۆ ئەکەن و (علي) لەسەر معنای خۆی بێ یعنی جدیر وحریص وثابتم لەسەر ئەوە. مُحقّق ومُدَقّقەکانی وەك (زُمَخشري) و (بَيْضاوي) ئەیکەنە (قلب) قلبی معنوی، (حقیق) بەمعنا واجب بوونی واجبە، یعنی لەسەر قولی حەق واجبە سعی بکا لەوە کەمن بیڵێم غیری

وی نەلێم، حقّا ئەوە زۆر دوورە! مبالغەیێ ناشیرینە! (قطبي رازي) ئەڵێ هیچ معنای نیە، (سیّد رشید) ئەڵێ تَكَلُّفة، گەرچی (سیّدي آلوسي) سعی كردیە بۆ توجیهی كردیتیە إستعارەیێ (مَكْنِيٌّ) و (تَخییلیّە)، بەلاّم إستعارەیێ ناموجە تخیلێ مشوّە. حاصلّی عبارەتی قرآن و ئەو معنایە یەك ناگرن! لازم بوو (سیّدی الوسی) اتّباعی (موسی) بكا بلێ (حَقِيقٌ عَلَى أنْ لاَ أقُولَ عَلَى اللّهِ) بۆ توجیهی كلامی (إلاّ الْحَقّ) دوای (زمخشری) و (بیضاوی) نەكەوێ.

﴿قَدْ جِئْتُكُم﴾ فرعون وملاّی ﴿بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ ئێوە بەو شكۆە و گەورەی یە، بیّنەیێ كە لە طرف خوای ئێوە بێ چەند عظیم الشأن بێ؟ ﴿فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾﴾ مقصدی بالذات لو إرسالی (موسی) نجات دانی بنی إسرائیلی بووە، دەعوەتی وی بۆ فرعون وملاّی، وسیلەیە ﴿قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ﴾ لە طرف خوای عالەم، نەك خوای ئێمە. ﴿فَأْتِ بِهَآ﴾ بیهێنە مەیدان لە حضوری من ئاشكرای كە ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾﴾ لە دەعوای رسالەت وإتیانی معجزە. ﴿فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ﴾ ئەڵێن ئەو عصایە لە داری بەهەشت ولە (مَدْيَنْ) بووە. چۆنی هاتیتە دەست؟ حكایەتی زۆرە. لكن قلبی عصا بە (ثُعْبان) عائدی قودرەتی إلاهیە، داری دونیاو داری بەهەشت فەرقی نیە، دار طبعاً نە لە دونیا نە لە بەهەشت نابێتە مار، كەوابێ ئەو خرافاتەی پێ ناوێت! بەڵكو ئەو دارە لە داری دنیا بێت بۆ معجزە خۆشترە! ﴿فَإِذَا هِيَ﴾ مع أنە دارێ عادی بوو ﴿ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾﴾ بێ تَخَيُّلُ وأخذي بالعيون ﴿وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ دەستی هێنادەر دەستی مبارەكی سپی بوو، بۆ ناظران (تَلألؤي) ئەكرد بریسقی ئەدا كأنّە ئەدرەوشایەوە، مع أنە خۆی وەكی (طنطاوي) ئەڵێ: (زۆر أسمەر بووە)، رەنگە لە وەقتی شوانی رەنگی مبارەكی گۆرابێ. ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ﴾ (تصدیقاً للفرعون) ﴿إِنَّ هَٰذَا﴾

بەڕاستی بە حەقیقەت ئەوە ﴿لَسَٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٩﴾﴾ ساحریٚ زۆر مەلایە لە فنّی سحر. سحر چیە؟ مەلایانی خۆمان زۆر قسەیان لیٚ کردیە. ئەگەر راستیت ئەویٚ نە ئەوان زانانوویانە، نەمن. مُجْمَلاً ئەزانم کە أنواعی خوارقی سحریە تعلیم وتَعَلّم ئەکریٚ، دخلی صاحبیٚ تیایە حیلە کارێی زۆرە. لە تأریخیٚ جمعیٚ لەوانە هاتنە شاری (کۆیە) شتی زۆر عجاییبیان ئەکرد، أمّا بانگیان ئەکرد أهلی کۆیە پیٚمان هەڵمەخەڵەتیٚن! ئەوکارانە پڕوپوچن، لیٚرە أربابی خۆی نیە وەالاّ بۆفمان دەرئەچوو. ئەوەی حەز لە تفصیلات ئەکا تەماشای تفسیری (فخري رازي) و (سیّد رشید) و (طنطاوي) بکا!! ﴿يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ﴾ بەسحر بە تفرقە باوێتە ناو مصریان، ئەوانی تریش لە طاعەت دەرچن، هجرەت بکەن، دوایی لەخارجەوە قووەت ببەستن، لەولاّتتان دەرکەن.﴿فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿١١٠﴾﴾ رأی تان چیە؟ چی ئەفەرمون؟ بعد المشاورە، رأی موافق بدەن، بەو گوێرەیە عمل بکەین ﴿قَالُوٓا۟﴾ عرضی فرعونیان کرد ﴿أَرْجِهْ وَأَخَاهُ﴾ خۆی وبرای تأخیر کە، رایان گرە، دەربارەی وان حکمی قطعی مەکە! ﴿وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ﴾ شارانی پڕ حکمەت ﴿حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾﴾ وەك پۆلیسی ئیٚستا ئەچن لەدەرەوە أهالی دیٚنن بۆ مرکزی حکومەت، ئەوانە بنیٚرە ﴿يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿١١٢﴾﴾ زۆر مەلا بن لە فنّی سحر، کە سحّار بن، (ئەمەش قراءَتە)!! حاشری نادرن ﴿وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ﴾ بەخۆشی خۆیان، بیٚ جبری پۆلیس. ﴿فِرْعَوْنَ قَالُوٓا۟ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾﴾ کأنّە ثابتە، بۆیە لیٚرە إستفهامیان ترك کردووە. عددی سحرە چەند بووە معلوم نیە! (والجهل بە لایضر والعلم بە لا ینفع)، بۆیە قرآن ذکری نەفەرمووە! ﴿قَالَ﴾ فرعون ﴿نَعَمْ﴾ ئەدی. ﴿وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾﴾ بە منافعی مادّی ومعنوین سەر

ئەفراز و نائلی قربی شاهانە ئەبن، وەك أركانی دەوڵەت لە زومرەی مُقَرَّبانی بارەگاه حساب ئەكرێن.

﴿قَالُواْ﴾ سَحَرە ﴿يَـٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ﴾ عصای خۆت لە أوّلەوە باوێ ﴿وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴿١١٥﴾﴾ تۆ مُخَیَّر بە، لای ئێمە فەرقی نیە! ﴿قَالَ أَلْقُواْ﴾ ئێوە أوّلاً ئەوەی ئەیهاوێن بیهاوێن. ﴿فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ﴾ ئەوەی فرێیاندا سەر أرض ﴿سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ﴾ چەشم بەندیان كردن زۆریان ترساندن ﴿وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴿١١٦﴾﴾ كافیە كە خوا بفەرموێ: (گەورەیە). ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ﴾ نازانم (سیّدی الوسی) بۆ چی ئەفەرمووێ: (بواسطة الملك كما هو ظاهر)؟ لە عبادەت دا إشعار بە واسطە نیە! وە لە حەقیقەتیشدا پێی ناوێ! ﴿أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ﴾ بێ تردد ودەغدەغە. ﴿فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿١١٧﴾﴾ هەری ئەلووشی ئەوەی، ئەوەی بە درۆ ئەیان كرد، ئەگەر (ما) موصولە بێ! یاچاوی كردنەوە حیلەیان ئاشكرا بو إفكیان بەدەركەوت، زائل بوو مختاری (شێخی عربی) و (سیّد رشید) عصای(موسی)حبال وعصیّی سحرەی هەڵنەلووشیە، بەڵكو بە مجرّدی إلقای عصا، سحرەكەیان بەتاڵ بوو، ئەو تخیُّلەی بە سرعەت إزالە كردیە. (لغةً، معنای (لقف) تناولی شتە بە سرعەت وحَذاقەت، وەمجازاً لە تناولی أموری معنویە إستعمال ئەكرێ، ئەڵێن: (تَلَقَّفَ العلم أي تَلَقَّاه بسرعَةٍ وحَذَقٍ)، مُجَرَّدی إلقای عَصای موسی ئەو تأثیرەی بەچی بوو؟ چۆنی كرد؟ شێخ ئەڵێ (نازانم!). ئەوە ایەتێ إلاهی (حقیقە) شتێ صناعی نیە تا بیزانین. من مادام إیمانم هێنا (عصا) ئەبێتە (مار) علی الحقیقە إیمانیش دێنم كە ئەو (مارە) حِبال وعِصّی سَحَرەی قوت داوە شبە نیە، ئەوە ایەتێ عظیمە، زُخرُفەی سَحَرەی پێ معلوم ئەبێ، غایە الأمر یەك لەسەر روایەتی صحیح كەوتووە. ئەگەر لە صاحبی رسالەت نقل كرابێ علی الرأسی والعین قبوڵە.

﴿ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ﴾ حەق ثابت بـوو ﴿وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾﴾ سحرو ومـا بـه السحر. ﴿ فَغُلِبُوا۟ هُنَالِكَ﴾ فرعون وملاى ﴿وَٱنقَلَبُوا۟ صَـٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾﴾ زەلیـل بـون بێ هیبەت وحشمەت وكبریائى مان.

حقیقـه ئـەو صـغار و ذللـەت وكچـكەی بەسـەر مغلـوبى منـاظرە دا دێ زۆر عجایبه بـێ دەسـەلاتى و مـاتى و مبهوتێـكى بەسـەردا دێ وصـف ناكرێ، لەبەر ئەوە (سَحَر)ە أهمیەتیان نەدا بـه فرعـون و مـلاى آنـاً بـێ تمـالكى نفس ﴿ وَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَـٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾﴾ كأنّـه قـوەى قـاهره ئـەوانى خسـته سـجدە ناصیەى خضوعیان لەسەر خاك دانا! ﴿قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾﴾ جمیعـى كائنات ﴿ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾ یعنى إیمانمان له برهانه أمّا لـه حضـرەتـى (موسى وهارون)مان وەرگرتیـه، بەسـایەى وان بۆمـان ظـاهر بـووه، وەممكنـه بلێین خـواى مرسلى (موسـى و هـارون)، كـەوابێ إیمانمـان هێنـا بـه رسـالەتى (موسى و هارون)، إیمانى بالله أصــالةً، إیمـان بـەوان تبعـاً یـا (ربّ)ى أوّل مـن حیث الخلق والأیجاد بێ ئەوانیش داخلـن، (رَبّ)ى دواێ لـه تربیـەى رسـالەتى بـێ، لام وایـه (نَحْوي) بـەوه راضي نیـه، لكـن منـیش قبـولێ (بَدَلْ) بـۆ (رَبُّ العالَمین) ناكەم! ﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ﴾ خطابى لەگەڵ (سَحَره)یـه. ﴿ءَامَنتُم بِهِۦ﴾ بـه (موسـى) یابـه (ربّي) (موسـى و هـارون). ﴿قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ﴾ پـێش ئـەوەى إذنتـان بـدەم رووى رضـامەنـدى بنـوێنم. زاتـاً إسـتأذانیـان نـەكردبوو تـابزانن (ئەفەندى) إذنیان ئەدا یان نـا، لاشك إذنـى نـەدەدان. ﴿إِنَّ هَـٰذَا لَمَكْرٌ﴾ ئـەوه فێڵێ بوو. ﴿مَّكَرْتُمُوهُ فِى ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا﴾ له شارەكه لەگەڵ (موسـى و هارون)ى رێك كەوتبوون، بالآخرة إظهارى عجـز بكـەن إیمـانى پـێ بێـنن.رێـك بكەون پێكەوه أهالیەكەى دەركەن وإستلاى مملكەت بكەن، قسەێ بێ معنا بێ أصل وأساس. ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿١٢٣﴾﴾ دواێ ئەزانن چتان پـێ ئەكەم.

﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ ﴾ چەپ و راست دەست ولاقتان ئـەبڕم ﴿ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ﴾ لـە دارتـان ئـەدەم ﴿أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ هـەمووتان، كەسـتان نەجاتتان نابێ، ئەوە قراری قطعيە، بەجێ هات، نـەهات، معلـوم نيـە. قسمێ ئەڵێن كرا، قسمێ ئەڵێن نەكرا. ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّآ﴾ ئێمە يا ئێمە و ئێوە هەموو لايـەك. ﴿إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾﴾ رجوعمان بۆ لای ربّـی خۆمانـە بمـانكوژێ لـەو حياتـە نجاتمان ئەبێ بە رضوانی الاهی نائل ئەبين، نێزيكی وتقرّبی لای تۆمـان نـاوێ، تقرّبی إلى الله فوقی هەموو شتە، حياتی دنی دونيا چيە؟ يـاخود خـوای تعـالان حكم لە بەينی ئێمە ئەكات، تۆش أمری مخلّد نابی، لە قبضەی قـدرەتی إلاهـی نجاتت نابێ. ﴿ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ ﴾ إستنكاری فعلی ئێمە ناكـەی بـەزەجرو وتـوبيخ وتهديد عذابمان نادەی بـە مقـابلی هـيچ شت ﴿إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا ﴾ لـە (عصا) اياتيان ديت. ﴿لَمَّا جَآءَتْنَا﴾ بۆمان هات حساً ومعنىً كشف بـوو بۆمـان. إنسان شتێكی إشكال بێ (بَعْدَ التَأمُّل والمُطالَعة) كە زانـاندی، ئـەڵێ بـۆم هـات. ﴿رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا﴾ كمـالی صـبر و متانـت خۆڕاگيريمـان بەسـەردا بـڕژێنی كأنّـە دەولكی صبر بطاڵ كـەی چـی تيانـەمێنێ هـەمووی بێتـە نـاو دڵـی ئێمـە ﴿وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴿١٢٦﴾﴾ إيمان كە لە طريقی علم وفكر و نظر كسب بكرێ، لەدڵدا وا راسخ ئەبێ، قووەتی وائەبەستێ، بـە ضـرب وقتـل وصَـلب وأنـواعی عـذاب، دەرناچێ. أمّا إيمان بە شواذ وشتی سەيرۆكە سەيرۆكە لە دڵدا نفـوذ ناكـا، زوو ئەگۆڕێ. أساسا مقصد لە معجزە جلبی خواطرە، بَعْدَهُ تربيەی علمـی وعمليـە، ئەگەر ئەو تربيە نەبێ، بێ فائـدە ئـەڕوا. ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ ﴾ أشـراف وأركـانی دەوڵـەت مقرّبـانی بارەگـاهی فرعـون ﴿أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ﴾ لـێ يـان ئەگەڕێی حُر وسەربەست بـن؟ ﴿لِيُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ قومـت بـە فسـاد بـدەن

ببنـە تـابع وهاودینیـان، ئـەو وەقتـە کەسـت بەدەسـتەوە نـامێنێ. ﴿وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ﴾ بەس خۆت و خوایەکانت پێکەو ئەمێنن. کێ عبادەتی تۆو الهەت ئەکات؟ بەو الهە جامدانە، دەوامی حشمەت و کبریائی تۆ ئـەمێنێ؟ ﴿قَالَ﴾ فرعـون. ﴿سَنُقَتِّلُ أَبْنَآءَهُمْ وَنَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ﴾ أولادی نێریـان ئـەکوژین، ژنیـان ئەهێڵینەوە قطعی نسلیان ئەبێ. ﴿وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَٰهِرُونَ ١٢٧﴾ ئێمە بەسەر وان دا غالبین، ئەوەی حەز بکەین لە حەقیان، ئەیکەین، بێ معـارض و ومعانـد ومنادد. ﴿قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ﴾ بنی إسرائیل. ﴿ٱسْتَعِينُواْ بِٱللَّهِ﴾ امداد لـە خـوا بخوازن. ﴿وَٱصْبِرُوٓاْ﴾ متانت بنوێنن سست مەبن جزع وفـزع مەکـەن أمـین بـن ﴿إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ هـەر شـعبێ بـێ، أرض أرضی خوایە، عباد عبادی خوایە. ﴿وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ١٢٨﴾ خۆتان بپارێزن لە سیّئاتی أعمال لە أخلاقی سیئە لە خلاف وشقاق. قومێ هکذای بـێ لاشـك ئەبینی سەر ئەکەوێ، أمّا تەنها بـە پستە پسـت وسرتە سـرت وجزیـەو حـاڵ، ئەفەوتێ مەحوو ئەبێتەوە! خلاصە تقوا هـەتا تقـوا فـەرقی هەیە، بـە ظـروف وأحواڵ ئەگۆڕێ! بەڵام مع الأسف ئێمە تقوامان لێ تێك چووە ﴿قَالُوٓاْ﴾ قومی (موسـی). ﴿أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا﴾ إسـتفادەمان لـە رسالەتی تۆ نەکرد پێش هاتنت وپاش هاتنت ئەزیـەت دراویـن بـەڵکو ئەزیـەتی دوایێ پترو بە شدەت تر بووە، وامان ئەخواست کـە (بـأقربْ مـایکون)، قوتـار بین. ئەوەندەیان ڕەزالەت دیبوو عذاب چێشتبوو، تحمُّلمان نەمابوو!

﴿قَالَ﴾ (موسـی) ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ﴾ نێزیکـە خـوای ئێـوە ﴿أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ﴾ بـێ حـرب وضـرب لـە طـرف ئێـوە! ﴿وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ أرضـی معهـود، فلسـطینی مبـارك. ﴿فَيَنظُرَ﴾ خـوا. ﴿كَيْفَ

تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ حالّى ماضيتان لە فكر ئەچىٚ؟ خەريكى فسادو ظلم وسيّئات ئەبن؟ يا على الدّوام أحوالّى سابقە ياد ئەكەن؟ بە عدل وداد وإنصاف لەگەلّ عبادى خوا معاملە ئەكەن؟ سەرمايەى دين و دونيا، محصولّى عملە لاى (أشاعران)يش ئەوەندە بىّ قيمەتە. ﴿وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ﴾ زاتاً ثروەت وبەرەكەتى مصر بۆ وان بوو، باأركانى دەولّەتيش داخل بىّ، ممكنە ئەوانيش لە خزم وأقاربى خۆى بووبن. گرانى ونقصى ثمراتيش، ئەّە هەر بۆ وان بووە، بۆيە أخذى: ﴿بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ بەمل وان دادەدا. ﴿لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾﴾ (وأنّى لهم الذكرى) بە گرانى و كم ميوەيى ئەوانەى مُتْرَفە ومُتَلَذذنْ دلّ تەنگتر ئەبن، لەوانەى بە خشونەتى عيش اولفەتيان گرتيە. وەگەلىٚ اهلى تفسير ئەفەرموون: (مراد لە آلي فرعون، قەوميەتى). ﴿فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ﴾ بەرەكەتى حبوبات وفواكە. ﴿قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦ﴾ لە بەرەكەت وحسنى طالعى خۆمانە ﴿وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ﴾ گرانى وبىّ ميوەى، ياهەر سيّئەيىٚ بىٚ ﴿يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ﴾ شوميان بە حضرەتى موسى وئەوانەى لەگەلّى بوون، ئەكرد، ئەيان گوت لە نحوستى ئێوە، ئێمەش توشى سيّئە بوين ﴿أَلَآ﴾ ئاگادار بن ئەى غفلە! ﴿إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾ طائرى سعد ونحسى وان وغيرى وان لاى خوايە، نسبەتى سعادەت وشقاوەت، يعنى نحوست، بۆ إنسان بۆ كَوْكَبْ بۆ طالع، جهلە. حيوانىٚ بىٚ چارە ئەستێرەى بىٚ إدراك خۆى چيە؟ تأثيرى لە سعود ونحوس چيە؟ مبدأ خوايە! أسبابيان على الأكثر ديارە. بەلّىٚ بىٚ دينى بىٚ أخلاقى بى إنصافى بىٚ مرووەتى، نحوستە، مالّ وێرانيە، بۆ هيأتى إجتماعى. ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ﴾ لەوان هى وابووە زانيويەتى، أمّا بزرى كرديە. ﴿لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣١﴾﴾ وكذا أكثرى بشر. حتّا ئەمرۆ بىٚ علم بىٚ

دلیل وبرهان، نسبەتی سعادەت ونحوسەت، بۆ بعضیّ شت ئەدەن. ﴿ وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ ﴾ هەرچی بۆ ئێمەی بێنی لە أیەت لە شتی عجایب ﴿لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا ﴾ بە أیتەکە سحرمان لیّ بکەیت، چاو بەندمان بکەی ﴿فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ١٣٢﴾ قطعی صورەتە، ئێمە إیمانی بۆ تۆ بەتوو، ناهێنین، وەکی سحرە إیمانیان پیّ هینای.

﴿ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ ﴾ مُتَبادرْ لە طوفان، ئاوە، یعنی بارانیّ زۆرمان بەسەرا ناردن ومزروعاتی فەوتاندن. وەك ئەو باران زۆریەی سالیّ لە وولاتی ئێمە هەر دەغلی بەهەلاش کرد هەمووی خست دانی شکاند دانی نەگرت هەمووی بوو بەکورك. ﴿وَٱلۡجَرَادَ ﴾ (کلۆ) نعوذ بالله من شرّ (کلۆ) ۶ (مراکشی) کە پێی ئەلێن (کلۆ مسکە) ج (نجدی) کە پێی ئەلێن (کلۆ زەردە). چەند سالْ لە وولاتی ئێمە دەوامیان کرد دونیایان بەرپا کرد. ﴿وَٱلۡقُمَّلَ ﴾ تفسیری بەئەسپێی دەغلی زۆر مناسبە لەگەلّ (جراد). زەرەری (جراد) تادەغلّ هەر ئەگیریّ لە پەرێز. ئەسپیّ لە چالّ وعەمبارو کەندو لێی ئەدا زادی تیا ناهێلیّ ئەیکا بە قەپیلکەو پوچ. ﴿وَٱلضَّفَادِعَ ﴾ بۆق لێرە زۆر مناسبە. (طنطاوی) بە طول وتفصیل باسی ئەوانە ئەکا فتوغرافیان ئەکێشیّ تشریحی أبدانیان ئەکا أمّا بۆ ئێمە لەو وولاتە لەو بیّ رەواجیە ناکریّ! ﴿وَٱلدَّمَ ﴾ (نزف الدّم) لە لوت=(لوت دارپسان)، یا ئاویان کراوەتە خوێن. ﴿ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ ﴾ ئاشکرا، لێك جودا، بە فاصلیّ زەمانی. ﴿فَٱسۡتَكۡبَرُواْ ﴾ فرعون وآل. بەو کبریائیە إیمان بە رسولی بنی إسرائیلی دێنن؟ قابل نیە، کبرو أنانیەتیان لیّ یان ناگەرێت. ﴿وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ١٣٣﴾ عریق بوون پووچوو بوون لە جُرم وگوناه سبب بە ملك وسلطنەت. ﴿ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ ﴾ عذابیّ هائل. ﴿قَالُواْ يَٰمُوسَى ﴾

هەمو جارێ عرضى حضرەتى (موسى)يان ئەكرد. ﴿ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَۖ﴾ بە رسالەتى خواى توو. ﴿لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ﴾ ئەو عذابە هائلە. ﴿لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ﴾ إيمانت پێ دێنين. ﴿وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ١٣٤﴾ ديارە (بعد الإيمان)يش ڕێى مانەوەى (موسى) وقەوميان نەداوە، (سبحان الله) لەو (إحتران)ە لەو (إحتراسە)! ﴿فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلرِّجۡزَ﴾ مَرَّةً بَعْدَ أخْرى. ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ﴾ تا نيهايەتى كاريان كە كشف بونى رجزيان بوو. ﴿إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ١٣٥﴾ عهديان هەڵدەوەشاند، وەفايان بە عهد نەدەكرد، إيمانيان نەدێنا. ﴿فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ﴾ قرارى قطعيمان دا كە تۆڵەيان لێ بكەينەوە. ﴿فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ﴾ خنكاندمانن ﴿فِي ٱلۡيَمِّ﴾ لە بحر. ﴿بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ تكْذيبى عِنادى إسْتكبارى ﴿وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ١٣٦﴾ مُعاملەيان واى ئەنواند كەلەو ايەتانە غافڵن ئاگايان لێ نيە. فى الحقيقە إنسان بە تەواوى شتێكى نەزانى لێى غافڵە ولو لەبەر چاوى بێ، ئەوانە لەبەر بێ علمى فرقيان نەدەكرد لەبەينى آيەت و سحر، ئەگەر زانابان بە آياتى (موسى) يان نەدەگوت (لِتَسْحَرَنا بها) سَوادى أعْظَم لە بَشَرْ حتّا أهلى عِلم لەو وادى يە عجايب ئەڕۆن، حُكميان بە قەدەر تَصُّور و إدراكيان نيە، بە گوێرەى عنوان نيە، شتێ سەير ئەبينن ئەڵێن: (ئەوە كرامەتە، يا سحرە يا معجزەيە) ناشزانن كرامت چيە؟ سحر چيە؟ معجزە چيە؟... بەلاى نازانم دا، نارۆن! ﴿وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ﴾ بنى إسرائيل ئەووەقتە لەبەردەستى (فرعون) و قومى، ڕەزيل و مُحقّر مُهان و مُستَخْدَم بوون. ﴿مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا﴾ آياتى (قرآن) وەك صريحە كە مراد أرضى (مصره) لە هەمو جيهاتێ. ﴿ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ﴾ زاتاً بَركَتى (وادي النيل) معلومە. ئەو قَحط و غلا و فِتنەو فرتەنەيە

مواخذَیێ بوو لە طرَف خواوە. ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ وەعدەی إلاهی بە تەواوی هاتە جێ، بۆ لە جێ و شوێنی فرعون و قومی فرعون. ﴿عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟﴾ (الصَّبْرُ مفتاح الفرج)، بەلام صَبری مَعَ اسْعی، سعی لەگەلْ تَدبُّرُ تَفکُّر، تَدبُّریێ لەگەلْ تَأنّي، تَأنّيێ لەگەلْ ملاحظەی فرصەت، بە سوانحی فرصەت هەلْنەخەلْەتان. خەبەریێ لەناو عمومی بنی إسرائیلی و مسیحیان بێ أثَرْ بێ، قران کریم بە دەری بخات، لا شك ئەوە لە علمی عَلاّمْ الغیوبە، في الحقیقة إخبار بەو نوعە غیبە، مُعجزەیێ زۆر گەورەیە، مُعجزەیێ علمیە، بە نەیرەنگ و چەشم بەندی مقابلە ناکرێ. ﴿وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ﴾ خراپمان کرد تێکمان دا ئەوەی ئەیکرد ﴿فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ﴾ ج صُنعی حقیقی بێ وەك قصور و مبانی، ج صنیعی بێ وەك سحری سحرە. ﴿وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ ﴿١٣٧﴾﴾ لە باغات و جنّاتی بلند كە لەسەر دارو دیواران ئەغەمران ﴿وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ﴾ نیل (علی ما حَقّقَهُ السید رشید). ئەو کلامە مُقدّمەیە بۆ ﴿فَأَتَوْا۟ عَلَىٰ قَوْمٍ﴾ بەسەر قومێ دا تێ پەڕین، ئەو قومە ﴿يَعْكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصْنَامٍ﴾ عَدیدَو. ﴿لَّهُمْ﴾ دەوامیان لەسەر عبادەتیان ئەکرد. لەو حالە حەقی بنی إسرائیلی ئەمەبوو نصیحەتیان بکەن یا شەڕیان لەگەلْ بکەن، بوتەکان پارچە پارچە بکەن. مَعَ الأسَفْ عکس الأمَلْ ﴿قَالُوا۟ يَٰمُوسَى ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا﴾ مثالێ هیکەلی عبادەتی بکەین ﴿كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ﴾ بۆ هەر (سَبطە) بووتێ وەك ئەو قومە کەهەر طائفە إلاهێکی هەیە، یا لەسەر طرازی ألهەی وان بێ ﴿قَالَ﴾ حضرەتی (موسی) ﴿إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾﴾ قومێ جاهل و نەزان و تێ نەگەیشتین. ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ ئەو قومە (وثني)یە ﴿مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ﴾ وێران کراوە دینی ئەوانە، خوا تێك و پێکی ئەدا. ﴿وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟

يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ بطالـه بـیٚ أصـل و أساسـه. (سَـیِّدي آلوسـي) ئەفـەرمویٚ: (مُضمَحلٌ بالْكُلِّيَّةِ وَهُوَ أَبْلَغُ مِنْ حَمْلِه عَلى خلافِ الْحقِّ). لام وایه (بالكليه) لەبەر (مُتَبِّرٌ) نـه! ﴿ قَالَ ﴾ (موسـى) ﴿أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ﴾ (لَكُمْ). ﴿إِلَٰهٗا﴾ ئایـا غیری خوای أنام معبودی به حەق واحدی بیٚ شریك غیره قابلی تمثیل بۆ ئێوه مـن طَلَـبْ ئەکـەم معبـودیٚ؟ ئەمـه چـۆن ئـەبیٚ؟ ﴿وَهُوَ﴾ خوداوەنـدی أنـام ﴿فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾﴾ أوَّلینَ و أخرینَ عنایەت و لطف و مَرحَمه تی دەربارەی ئێوەی کردیه بـۆ هـیچ طـائفـەیـیٚ شَـعْبیٚ لـه بَشَـرْ نەیکردیـه نایکـا، لەسـەر ئەوەش ئەخوازن معبودیٚ غیری ئـەو مـن بۆتـان بکـەم؟ یـا لَلْعَجَـبَ! !

﴿ وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم﴾ قورتارمان کردن ﴿مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ﴾ قراءەتی (إبن عامر) (أَنْجيناكُم)ه، ئەوه خۆشتره، (ضمیر) عائدی خوایه هـەروەك حقیقـەتی نجـات دانیش کاری ئەوه. وه بۆ قراءەتی جمهـور دوو وجهیـان بیـان فـەرمووه، یـەکیٚ ئەوه رأساً كَلامی کبریائیه ئـەو تـذکاره بـیٚ واسـطه أدای فـەرمووه (ن) نـونی عَظَمَته یعنی ئێمه نجاتمان دان، وجهی ثانی ئـەوەش کلامـی (موسـى)یـه،(نـا) عبادەته له خۆی وبرای، ئەمه (مجاز)ه. ئێمه ئـەو سـعی وکۆششـمان کـرد بـۆ نجاتی ئێوه وەپێك هات ئـەوجا ئێمـه الاهتـان بـۆ پـەیا بکـەین؟ وەڕیٚ بدەین عبادەتی (صنم) بکەن؟ آن کوجا؟ انْ کوجا؟ حقاً زۆر لێك دوورن. ئـەو (وَجْـه) گەرچی (سیِّدین) دووریان زانیوه أمّا زۆر جوانه وزۆر مربوطه.

﴿يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ﴾ ذکـــــور. ﴿وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم﴾ لـەو نجـات دانـه، یالـەو عـذابـه دا ﴿بَلَآءٞ﴾ نعمـەت یـا محنەت ﴿مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ مالکی أمرتـان ﴿عَظِيمٞ ﴿١٤١﴾﴾ گـەوره. ئـەوجا ئێـوه ئـارەزوو ئەکـەن شـکرانەی نعمـەتی الاهـی بـه شـرك وکفـر بـەجیٚ بگـەینن؟

﴿وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ﴾ حضرەتی (موسى) معلـومی بـۆ ئـەو قومـه تالـه جهالـەت دا

بمێنن، سعی بۆ هدایەتیان، بۆلای توحیدی باری، بێ کەڵکە، خصوصا بە قاعدەی تأثیری آداب وعقایدی غالب لە مغلوب، دڵیان متأثر بوبو، بە حبّی بوت پەرستی، بە خوێندن نەبێ چارەیان ناکرێ ئەگەرچی وەکی قومی ئێمە پاش (تعمیم) ی علم ومعارف سیئاتیان گەلێ زیادی کرد. بۆیە طلبی کرد لە حضرەتی کبریائی کتابێکیان بۆ بنێرێ بخوێنن ببنە أهلی علم بەتەواوی عقلێ وهۆشیان بێتە بەر، لە أحوالی کەشایانی مقامی ألوهیمەت و ربوبیەت بێ، ئاگادار بین، جەنابی حەق وەعدەی پێ دا. ﴿ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ﴾ پاش تەواو بوونی سێ شەو کتابت پێ ئەدەم ﴿وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ﴾ لە مدّەی دە شەو ودە ألواحی بۆ نارد ﴿فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ﴾ (جَلَّ وَعَلَی). ﴿أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ﴾ سی مقدّمەی ألواح پێ دان، دە شەو مدّەی (ورودی) ئەوان، بناءً علیە، هیچ حاجت بەگیرەر گیری مفسّران نیە. فی الحقیقە مدّەت شکاندن لە طرف (کَلیمْ) نیە، ئەو (عَشْرە) اتمامە، نەعەلاوەیە! نابینی لە سورەی (بقرە) ئەفەرموێ (وواعدناموسی أربعین لیلة). ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ﴾ ﴿هَٰرُونَ﴾ کە تَوَجُّهی کرد بۆ میقات. ﴿ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي﴾ خلافەتی رئاسەت، نە نُبُوّەت! ﴿وَأَصۡلِحۡ﴾ ئەوەی إحتیاجی بە إصلاح هەبێ ﴿وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ١٤٢﴾ بە میل ومحابا، زێدە میل، بۆ (سَبطي) دون سبطي بکەی، ئەو نوعە میل وفرق وجودابیە، رێی مُفسدانە، تۆ تبعیەتی ئەو رێیەی نەکەی! دیارە ئەو نوعە مفسدانە ئەو وقتیش لەناو بنی إسرائیلی دا بوین، زاتا ئەو نوعە میلە ملّتی إسلامی تێك دا، تساوی فی الحقوق فی التکلیفی لە ریشەوە هەڵکەند. میلی فاسد کە کسوەی دینی لەبەر کرا، چارەی ناکرێ. ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا﴾ بێ تخلّف. ﴿وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ نازانم بۆ خاصّە لێرە مفسرین تعرضیان بۆ چۆنیەتی قسە کردنی خوای کردیە؟ إیمانمان هەیە کە خوا بلا واسطە قسەی لەگەڵ (رسل)ی عظام کردیە وە چۆنی ادا کردیە مُتَکَلِّمین لێی دواون، کتبی کلامیان

پڕ کردیە لە هەراهەرا، فی الحقیقە ئەمەش (غلو)وە. شتێکی إنسان بالضرورە مجبورا إیمانی پێ بێنێ، حاجەت بە لێ توێژینەوە نیە، بەلام نُظّار ڕاناوەستن. حقاً ئێمە لە بینی إسترسال و بێ مبالاتی نقلی أخبار وە بەینی زێدە لێ کۆڵینەوەی نظّار حەیرانین!!! (کعب الأحبار)ە. ئەفەندی ئەڵێ: (خوا بەهەموو زوبانێ قسەی لەگەڵ (موسی) کردیە –انشاالله کوردیشی تیا بووە!– ((موسی)) ئەیفەرموو: (یارَبیّ تێ ناگەم) تا آخری بە زوبانی ((موسی)) بە مثلی دەنگی ((موسی)) قسەی لەگەڵ کرد).

لە روایەتێ تر ئەڵێ: (أوّل ما كَلّمَهُ بالبَرْبَرِيَّة)، لاشك ئەوە کلامی بەربەریانە ولو لە صاحبی رسالەشیان نقل کردیە، حاشا حضرەتی رسولی مجتبی ئەو نوعە قسە بێ معنایە نافەرموێ! خلاصە کە جەنابی حەق قسەی لەگەڵ موسی کرد ﴿قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ﴾ خۆتم نیشان دە ﴿أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ﴾ تەماشات کەم بتبینم. ﴿قَالَ لَن تَرَىٰنِي﴾ نامبینی. هەر کەسێ إیمانی بە قدسیّەت وتجرّدی حقیقی خوا هەبێ، بە صورەتی قطعی ئەزانێ بەو نوعە کە ئێمە یەکتر ئەبینین، خوا نابیندرێ محالە، أمّا مُجَسِّمە ومُمَثِّلە تَوَقُّف ناکەن لە دیتنی خوا بەو جۆرە کە حیوانات یە کتر ئەبینن. نەدیتنی خوا وانیە لەبەر قصوری آلەت بێ! بەڵێ لەبەر قصوری چاو (مکروب) نابینین! بەلام چاوی إنسان بەصەد هەزار دەرەجە لە چاوی پشیلە زیاتر بێ، خوای نابینێ، ئەمەش فرق ناکا لە دونیاو لە عُقبا، وە بە هیچ حاسّە حاسّەی حیوانی خوا درك ناکرێ. لکن پێش زەمانی رسول وەنەختێکیش لە أوائلی رسالەتی خاتم (ﷺ) إمتناعی رؤیة الله یان بۆ معلوم نەبوو بوو، وەدیتنی خوای لەبەینی(ملیّون) خاصە(بنی إسرائیلی) شتێ إعتیادی بو، بۆیە حضرەتی (موسی) بۆ إحساسی مُتَحَمِّس بو وە سماعی کلامی إلاهیش زێدە جسارەتی داێ طلبی رؤیةُ الله ی کرد. جەنابی حەق بەتأکید یا بە تأبید فەرمووی: (نامبینی) ﴿وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ﴾ جبلێ قوی تجلّایەکی بۆ ئەکەم. ﴿فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ﴾ لەوحینە دا ﴿فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ﴾

دوایێ دەمبینی. ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ﴾ ربّی (موسى). بەو نوعەی کە خۆی ئەزانێ. ﴿جَعَلَهُۥ دَكًّا﴾ خردو خاشی کرد ﴿وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا﴾ بەربۆوە، کەوت بێ هۆش، دەنگە دەنگ ولرفە لرفی لێ دەهات. ﴿فَلَمَّآ أَفَاقَ﴾ کە بەخۆ هاتەوە ﴿قَالَ سُبْحَـٰنَكَ﴾ لە عوائق وعلايقی مادّیات ﴿تُبْتُ إِلَيْكَ﴾ پەشیمانم ئیتر ئەو نوعە طلبە ناکەم، زانانــدم تـۆ (فـوق الطبیعـة)ی، قیاسی قسەکردن وخـۆ نیشـان دان لێك نـاکرێ. خۆزیـا مەلایـەکانی ئێمـەش توبـەیان کردبا قدسیّەتی بارییان نیشان دابا بە عالەم تاجهلەی صوفیّە ئەوەند، خوایان لاسوك نەبا. (لا يخفى) بابزر نەبێ أحوالّی بشر قبل رسالتی محمد (ﷺ) لەگەڵ پاش بعثە تی خاتم الکل لێك جودایە. قبل البعثـە، زەمـانی وەهـم وخیـاڵ بـو، عقڵ قووەتی نەستاندبوو، بۆیـە شـرك وبـوت پەرسـتی لـەناو عالـەما إنتشـاری کردبـوو. سـوادی أعظـم (حِسْ) پەرسـت بـون ألآنـیش کـەمێ هـەن دوورن لـە فلسفەی إلاهی داپۆشراون بە أغشیەی مادّیات، ئەڵێن: (ئەوەی نەیبینین إیمانی پێ ناهێنین). وەبۆ طریقی إفادە وإستفادە، أغلب لە جهەتی حسّیاتەوە بوون، لەبەر ئەوە جەنابی حەق بەو نوعە جوابی (موسـى)ی دایـەوە، بـەڵام بـۆ أمـتی رسـول پـاش تقـرُّری رسـالـەت وإیمـان ئـەڵێ: (لا تدرکـە الأبصـار-الآیـة)، أمّـا علمایانی ئێمە معنای ئەو آیەتەش یان تێك داوە، لەگەڵ ئەوەش مجبوراً رُؤیَتْ یش ئەگۆڕن ئەڵێن: (نوعە رؤیتێ ترە بێ إنطباع بێ مقابلە بێ کثافتی مَرأي). بەڵێ منیش لام وایە لە داری آخرەت حاڵەتێ ئەبێ بۆ إنسانی مـؤمن تجلایـەکی إلاهی بـۆ ئـەبێ، لـەو حاڵەتـەدا بـێ هـۆش ئـەبێ تصـویر وتصّـوری ئـەو إدراك ودیتنەی پێ ناکرێ. ئافەرین لە أصحابی ئێمە! (أعني أشـاعرة ظـاهراً ملیّـونن باطنا حُکّمان) لاشك لە داری آخرەت إنسان جهەتی تجرّدی غلبـە ئـەکا بەسـەر جهەتی مادّیەتی، حضورێکی الاهیـان بۆئـەبێ وەك حضـوری بـەینی مجـرّدات وموجوداتی لطیفە، زۆر پێی متلذذ ئەبن -خوا پێمان کرم بکا-.

أمّا لەم دارەدا تَجَرُّد لـە جلبـابی بشـری غـیرە قابلـە، بـە قسـەی ئـەم وئـەو

هەڵمەخەڵەتێن!! خوا ئەزانێ ئەوەی إدّعای تجرّد ئەکا، برسی ئەبێ، کە برسی بوو، هیچی لە فکر نامێنێ، بەس گوێچکە نانێ دفعی برسیایەتی پێ بکات ئەو تجرّدە بویا، بۆ (کلیم الله) بۆ (حبیب الله) ئەبو! سبحان الله ئەو رؤیتی (معتزل)ی إنکاری ئەکەن، (أشاعرَ)ش إنکاری ئەکەن، کەچی بعضێ تسفیەیان ئەکەن بەڵکو نێزیکە تکفیریان بکەن، معتزلیش لە مقابلە بالمثل بەڵکو نەختێ زێدەی ئەکەن. بعضێ محقّق ومُدقّق بۆ جلبی عوام خۆیان ئەگۆڕن بە خیاڵ و أشعاری عشّاقی (صوفیّە) تَشبُث ئەکەن، ئەو مقامە مقامی شعرو خیاڵ نیە مقامی تحقیقی حقە، أما لەو هەموو زەمانێ إفصاح بەحەق زەحمەتە، وەأثاثاً من حەزم لەو تعمیقات وغلوە نیە ﴿وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٤٣﴾ (بُعدْ سَیِّتیك یا رَبُّ العالمین). ﴿قَالَ﴾ جەنابی حەق (بعد آفاقە موسی وإنابتە)-. ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ﴾ إختیارم کردی وەرم بژاردی ﴿عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ قەوم وأقاربی خۆت کە مختاری بین الاممن، تفضیلم دای بەسەر وان دا.

﴿بِرِسَٰلَٰتِي﴾ بە پێغەمبەری بە أحکام ﴿وَبِكَلَٰمِي﴾ لەگەڵ ئەوانی تر قسە ناکەم! وە ئەم کردوە! حتّا (هارون)یش لەبەر رجای تۆ کردمە پێغەمبەر! أحکام بۆتۆ ئەنێرم! تۆ بەوی ئەگەیێنی! وە مشترکاً بەقومی ئەگەیێنن! ﴿فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ﴾ هیچ رأی طلب مەکە! ئەوەی پێم کەرەم کردی وەری بگرە! لە جملەی رسالەتت یا خود (الواح) زێرا پێشدان فەرمووی: (تَمَّ میقاتُ رَبِّه). ﴿وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ١٤٤﴾ لەزومرەی وان بە!

﴿وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ﴾ ئەوەی إحتیاجیان پێ بێ، لەو وەقتی، لە أحکام وآداب. ﴿مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ﴾ (لِکُلٍّ ماوَرَدَ فیها). ئەو کلّیانە علی الإطلاق نیە، لە آیاتی قرآنی هەر کلّیە بەگوێرەی مقامی خۆیەتی ئەوەی إدّعا بکا (تورات) یا (قرآن) هەموو شتی بەهەموو تفصیل تیایە، درۆ ئەکا. (کعب الأحبار)ی ماڵ وێران بە خوێ وتەوراتی خۆیەوە، لە

درۆی موسڵمانان وجووان، هەمبانەی درۆیانی پڕکرد و بەرەڵڵای کردن بە غازی مُخْنِقي درۆ، عقڵی خنکاند چاوی دڵی موسڵمانانی کوێر کرد. ئەوجا وەرە سەیری (ألواح)! کە (مجاهد) ئەڵێ: (لەزومر رەدی أخضر جبریل لە عَدَنْ بۆی هێنا بوو – یعنی لە جنّـی عـادی اِرَمَ ذات العمـاد –زار خـۆش–). (إبن جریح) خەبەری دراوەتێ (ألواح) لە زۆبەرجەد بووە. (سعید بن جبیر) ئەڵێ: (ئەیان ووت لە یاقووت بووە، أمّا من ئەڵێم زومەررەد بووە). لە (جعفری صادق) نقل ئەکەن نقلی کردیە لە سلسلەی ذهَبیَّـەی آباء وأجدادی: (الواح لە «سدري» بەهەشت بووە). طولی (لوحِ)ی دوازدە نِراع بووە وە هەروەها قسـەی پڕوپـوچ وبـێ دەلیـل! کـێ لـە لـوح دا نوسـیویەتی؟ جبریـل؟ یانـە خـوا بـۆ خـۆی نووسـیویەتی (موسی) جیڕە جیڕی قَلَمي گـوێ لـێ بـووە؟ ئەمـە روایەتـە لـە (أمیر یَعقوب المُوَحدِّین)! چـی تیـا نوسـرابوو؟ کاکـە باسـی مەکـە!!! مـدایح وثنای أمّتی مُحَمَّد! گیان! أمّتی خۆشەویست! خصوصاً أمّتی ئەم قرنە قرنـی چواردەمین لە هجرەت! أمّتێکە شایانە لە هەموو حقائقـی تـأریخ لـە صـفایحی زومـەررەد و زوبەرجـەد ویـاقوتی لعلـی بَدْأخشـانی مَناقبیـان بنوسـرێ!!! خلاصە کتبی نقّالان زیادە (الدُّرّ المنثور)ی سیوطی پڕە لە مزخرەفات ومۆری، شتێکە قـەڵپ قلاّبـی. بـنی إسـرائیلی فی الحقیقـەت لەوانەشـیان تـێ پەڕاندیـە.

﴿فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ﴾ ألواح وما فی الألواح بە جد وحزم وجزم وعزیمە ﴿وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُواْ﴾ عمل بکەن ﴿بِأَحْسَنِهَاۚ﴾ لاشك أحکامی عقلّی ونقلّی بعضێ لـە بعضـێ جوانترو چاکترن، باهەموشی چاك و جوان بن، تفاوت لە حسن دا، لـە أحکـامی إجتهادیە، زۆر چاك بەدەر ئەکەوێ. چـاك وایـە کامـە أوفـق وأخلـق بـە نظـامی هیأتی إجتماعی، ئەو قبولّ بکرێ. نابینی خوا أمر ئەکاتە ئێمە لە کتـابی کـریم (وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم)، قاعدەیکی چەند جوانە ئەگەر عملی پـێ کرابـا، یاتێـك نـەدرابا. ﴿سَأُوْرِيكُمْ دَارَ ٱلْفَٰسِقِينَ ١٤٥﴾ ئەگـەر پـاش ئـەو ماجرایـە گەڕانەوە (مصر). بۆ زەمانی (موسی) تفسیری (دار) بە (دار)ی فرعون وقومی،

جوانە. بۆ مطلقی بنی إسرائیل بە دارو دیاری (سوریە)ن یاخود نیشانتان ئەدەم مأوی ومصیرو عاقبەتی فاسقان، ئەوانەی خروج لە إطاعە ئەکەن، کەوابێ نەکەن ئێوە لە إطاعە دەرچن. ﴿ سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ﴾ تشریعی وطبیعی. ﴿ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ دەعیە ئەکەن خۆیان لە عالەم بەدەر ئەزانن بە چاوی حقارەت وخواری تەماشای خلق ئەکەن. ﴿بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾ أصلاً تَکَبُّر حەق نیە، لەکەس ناوەشێتەوە شۆخی بەسەر خەڵکا بکا انزیادە بۆ کەسێ بۆ قومێ لە فقرو فاقەو ڕەزالەت وذللەت وخواریِ مُحَقَّری، نجاتی بوبێ کەوتبێتە خۆشی دەوڵەمەندی عزّت وگەورەی حەق وایە ئەمانە رابردوی خۆی وخۆیان لە فکر کەن؟ کأنّە نەبایان پێداهاتیە نەباران! ئەوە (بِوَجهٍ من الوجوە) لەگەڵ حەق نسبەتی نیە حتّا لە نظری مغرور ومُتَکبِّران. أساساً صاحبی جاە وعَظَمَتی قبیحە ڕیشە خەندە بەوانە ئەکەن. ئەوەی مُتَکَبِّر بێ تەماشای ایت وعبر ناکا، چۆن لێی مستفید ئەبێ؟ کەوابێ ئەی (بنیٓ إسرائیلی) نەکەن پاش ئێش بۆ ڕێك کەوتن و سەرکەوتن خۆبەخۆی ولەسەر خەڵکی تَکَبُّرو دەعیە بکەن وە إلاّ لە دین ودونیا لە علم وعمل ئەبن ئەکەونەوە ژێر چەپۆکی أجانب حتّا ئەمرۆش ئەوانەی زادەگانن کەمیان ئەبنە إنسان لەبەر کبر کەسابەت ناکەن ناخوێنن لە مدارسی حکومەت ئەوجا لە صەدا یەکێ لە زادەگان ناجح ئەبێ، بەڵکو إکمالیشیان کەمە علی العموم راسب ئەبن لەبەر کبرا أحفادی (حاجی بکر آغای) کۆیە صاحبی ثروەت وسامان وعزو جاە وعَمَل وآداب شهرەت گیری آفاق أکثریان بوینە زبّال وکنّاف وکنّاس، لە شاری (کۆیە) نتیجەی کبرە أکثری ساداتی کرام بە سؤال بەڕێوە ئەچن، مِلَل وأقوامی عظیمة أکثری مەحوو وپەریشان بوین. (سبحان الله) لەو قاعدە مُطَّردە لەو سنتە لایتغیرە مع الأسف أمّة گوێ نادەنە آیاتی قرآنی ڕوویان لێ وەرگێڕاوە، بۆیە خوا لێی وەرگێڕان ﴿وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ﴾ مُنَزَّل ومُکَوَّن ﴿لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا﴾

إیمانی پێ نامێنن، إهتدای پێ ناکەن ﴿وَإِن يَرَوۡاْ﴾ رأی العین ﴿سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ﴾ رێی راستی ﴿لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا﴾ نایکەن بە رێی خۆیان، رووی تێ ناکەن، پێی دا ناڕۆن ﴿وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ﴾ گومراهی. ﴿يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ﴾ إختیاری ئەکەن، ئەیکەن بە مسلك لێی لانادەن ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوە لەبەر چیە؟ بۆچی وان؟ ﴿بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ علی الإطلاق. ئێستا سبب بە نوری علم وعرفان سبب بە إکتشافاتی علمای طبیعەت، ئەبێ قەومێ هەزار بەلای بەسەربێ وەکی ئێمە؟ لە ماوەی ئەم شەش حەوت ساڵە بەلای وامان هاتوتە سەر نەهاتۆتە سەر أقوام وأممی رابردوو، چەند ساڵ لە دوای یەك (کلۆمسکە) دوو ساڵ معە (کلۆ زەردە) دونیایان وێران کرد، مأمورینی حکومەت دەرمانیان ئەهاویشت بۆ کلۆ، مالات و وەحشیات ئەیانخوارد زەهر ئالود ئەبوون ئەمردن، أهالی فریادیان ئەکرد لە رێی خوا لێی گەڕێن ئەو دەرمانە زەرەری پترە لە کلۆ. بە سعی حکومەت نەفەوتان باوجودی فوق الحد مصرفی کرد لەو جێگایانەی گەلایان لێ دانابوو، پاش (پەڵە) بارانێکی وای نەبوو دەغلێ وگیاو گوڵ زەریف شین ببێ، وەقتی بەهار فەرخەکلۆ ژیانەوە لە قەوان هاتنە دەر هەفتەیێ نەژیان هەموو مردن، أمّا وولاتی هەولێر وەخت بوو بەجارێ لەبەر بێ لەوەڕی بفەوتین مەڕو مالاتیان لە صەدا هەفتای بەقڕ چوو. کلۆ خلاص ئەوجا (زەنگە سورە، زەردەواڵە، زەرگەتە) دوو ساڵ بە نوعێ زۆر بون باوڕ ناکەم تأریخ دیتبێتین میوەیان نەهێشت میشنگوینیان فەوتاند. بەرۆژ خواردن، خاصّە گۆشت ممکن نەبوو خوا ئەیزانێ لەگەڵ پارو ئەچوونە ناو زاران، ئەویش خلاص! ئەمە دوو ساڵە (ژەنگ) پەیا بوو لە (دەغل) لە (تری) لە سائری میوەجات، خاصّە ئەمسالێ أولاً لە بەهار بەهارێ زوو (پەلەپیسکە) لە درەختی دا، دوای ژەنگ، ئەمڕۆکە أوّلی (تمون)ە گەلێ باغاتی (مێو) پەلکی هیشك بووە. بەرەکەی بە هەتاو سوتاوە ئەوەی پەلکی مابێ ژەنگ لێی داوە، لەمێش

وەگەزو تەپۆو پێشکە قسە ناکرێ!!!

نەکەس ئەوانە حمل ئەکاتە سەر غضبی إلاهی وەبە (توبە)و نابە چارەی بکا نەحکومەتتیش چی پێ ئەکرێ، باوجودی بۆ تداوی نباتات وأشجارو دفعی علل وأمراضی مزروعات وەك دوەلی ڕاقیە وەزارەتی خاصّی هەیە، فائدەی مصاریفی بێ هودە چو بەڵکو (مع الضرر). کرمێ پەیا ئەبێ ئێمە پێی ئەڵێین (هاری) شتلە (توتن) ناهێڵێ لەو سالآنە حکومتی فَخیمَمز ناردی رجالی متخصصین خریجی کلّیاتی أوروپی هاتن، بۆ دفعی هاری زەهریان بە دوکانە شتلە توتنان وەرکرد، پاش یەك دوو ڕۆژ شتلە توتن دەستی کرد بە وشك بون نهایەت سوتان مەحو بوون، مەگەر لە برسان وەإلاّ دانەیێ (هاری) زەرەری نەدیت، حتّا لە سایەی ئەو رجالە متفننانە سالّی دوایێ أراضیەکە گیاشی لێ شین نەبوو. حاصلّی لەبەر ترقیاتی فنون و علم و معارف معنویاتمان چوو لە مادّیاتیش غیری زەرەر إستفادەمان نەبوو (خَسِرَ الدنیا والآخرة) ماینەوە.

﴿وَكَانُواْ عَنْهَا﴾ لە ایات. ﴿غَٰفِلِينَ ١٤٦﴾ لەبەر کبرو أنانیەت وأتباعی هەوان لێی غافلّ بوون ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ علمی وعملی ﴿وَلِقَآءِ ٱلْأٓخِرَةِ﴾ ڕۆژی جــزا وایەسـین ﴿حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٤٧﴾ جزا بە گوێرەی عملە عذریان لێ قبولّ ناکرێ، سۆی إختیار مستلزمی سۆی جزایە ﴿وَٱتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ پاش چونی بۆ میقات.

﴿مِنْ حُلِيِّهِمْ﴾ ظاهری وایە (حُلي) خۆیان بێ، ئەگەر ڕاست بێ قومی (موسی) نێزیك هاتنە دەریان لە مصر خشلّیان لە ژنە مصریان خواستبێتەوە، دیسان اضافە دروستە، چونکی بویتە مالّیان (في الجملة) أمّا اساساً خشلّی خۆیان تقدیم کردبێ تاکو ﴿عِجْلًا جَسَدًا﴾ لێی دروست بکەن بی پەرستن دلالەتی لە میل وشوقی وان بۆگۆلك پەرستن زیاترە. هیکەلێ، گۆلکێ، کە نەخوات و نەخواتەوە. ﴿لَّهُۥ خُوَارٌۚ﴾ بۆڕە بۆڕ. ئەو دەنگە لە چیەوە بوو؟ ئەو هیکەلە لە

کێ دروستی کردبوو؟ لە جێگایەکی مناسب ئەیلێیین، لێرە ئەوەندە عرض ئەکرێن، حضرەتی (هارون) نەبووە –خلافاً لما في التوراة المُزَخرَف المُحَرَّف– سبحان الله بنی إسرائیلی شایانی نبوەت وألوهیەتیان لاچیە! نایزانن؟ یاخود إیمانیان پێیان تەواو نیە؟ ﴿أَلَمْ يَرَوْا أَنَّهُۥ﴾ گوێلکەکە. ﴿لَا يُكَلِّمُهُمْ﴾ لە هۆرە هۆر بەولاوە چیتری نەدەوت. چی بڵێ؟بە چی بڵێ حقًّا ئەگەر گوێلکی ڕاستیش با ممکن نەبوو قسەیان لەگەڵ بکا. جهالەت ئەوەندە إستلای کردبوونە سەر بە مصاحبەی (قبطیان) ئەوەندە شعورەیان نەبوو کە ئەوان لە (جمادات) و (حیوانات) زێترن. ﴿وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا﴾ جمادێ، حیوانێ هکذای چی لەدەست دێت؟ وەلەگەڵ ئەوەش إتخاذیان کرد بە معبود. (جو) لە أیّامی عاقڵی زێڕ ئەپەرستن ئەدی چۆن لەوزەمانی دا؟﴿ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾﴾ ظلمی بێ ئەندازە ﴿وَلَمَّا سُقِطَ فِىٓ أَيْدِيهِمْ﴾ لەناو کوردی ئێمە کەسێ ئیشێ بکا وەبۆی نەچێتە سەر پێی تەواو نەبێ ئەڵێن: (لە دەستی دا شکا). کە پەشیمان بونەووە لە دەستیان بەربۆوە (سفر الید) مانەوە حسرەت کەش بوون خطایان کرد ﴿وَرَأَوْا۟ أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا۟﴾ زاناندیان گومڕاە بوون ﴿قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا﴾ ئەگەر ڕەحممان پێ نەکا لێمان خۆش نەبێ خوای خۆمان ﴿لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾﴾ لە سورەتی (طـه) دەرئەکەوێ ئەو ندم وانابتە پاش عودەتی حضرەتی (موسی) بووە. ﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ﴾ لە میقات. ﴿إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا﴾ توڕە و محزون. أسفی لەسەر حاڵی قوم غضبی لە مساهلەی برای. غضب وحزن یەك نین. غضبی حزن ئامێز، حزنی غضب آلود، بۆ زاتێ ئەبێ نەتوانێ ڕقی خۆی بخواتەوە وە دڵی بڕوای نەدا ژار و ژواری قینی بەسەر ئەوەی قینی لێ هەستاوە، بەتەواوی دای بڕژێنێ، لەوحاڵەدا، ئەو حاڵانەی بۆ پەیدا ئەبێ. وەك لە سورەتی (طـه)

دەرئەكەوێ جەنابي حەق، پێش عودەتي خبري ما جراي قومي دابۆيێ. ﴿قَالَ﴾ (موسى). ﴿بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِي مِنۢ بَعْدِيٓ﴾ خلافەتي خراپ قبيح ناشيرين ومذموم. من چيم بە ئێوە گوت؟ ئێوە چيتان كرد؟ ئەمە بۆ؟ ﴿أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ﴾ سبْقتتان لێ كرد تالوكەتان كرد ڕانەوەستان تامن دێمەوە ﴿وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ﴾ لە شدّتي غضب و حزن خۆی نەگرت لوحەكاني فڕێ دا! ممكنە لەو ئانەدا بە خيالّيشي دا نەهاتبێ ئەو چيە لەدەستي دا! مقصدی ئەوەندە بو دەستي بەتالّ بێ هجوم بكاتە سەر (هارون)! ﴿وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ﴾ (موسى) سەری پرچي گرت ﴿يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ﴾ بۆلای خۆی ڕای ئەكێشا. ئەوانەی ئەڵێن: (ئەوە گوناهە، كەوابێ رسول معصوم نيە)، ئێمە ئەڵێين لە جوابيان: (بەڵێ رسول خاصّةً يەكێ وەك (كليم) لەو هەنگامە مجبوراً ئەو گوناهە ئەكا، لكن مع الاسف ئەو نوعە گوناهە بەدەست ئەو علمایاني معصوم قائل بە عدمە عصمتي رسل ناكەوێ، بەخۆو بەهەموو علم وفضليان، ناگەنە ئەو مقامە كە ئەو نوعە گوناهە بكەن. ئەگەر گوناهي رسل ئەو نوعە گوناهە بێ، منيش ئەڵێم معصوم نين. پاش ئەو هەموو كەشمە كەشمە قومي (موسى)ی ببنە گۆلك پەرست، لوحە چي كەڵك ئەگرێ؟ لەو ئانە ئەبێ فڕێ درێ! ولو دەست خطّي إلاهي بێ!!! اِلقای علی وجه الإحتقار؟ ناحاشا! إلقا بۆ چارە! بۆ دەست بردن! بۆ شتێ بە علاج بشێ! چۆن عصای فڕێ دا سەر أرض كە ئايەتێ بوو لە ئايەتي خوای تامعجزەيێ دەركەوێ لەومەيدانە سەركەوێ، كذا بۆ تَشَبُّث بۆ چارەسازی ألواحي فڕێ دا سەر أرضي! بناءاً علی هذا حاجەت بە تأويل وجارو مجروری ((مفسِّران)) نيە. ئێمە لە كوێ؟ موسى لە كوێ؟ تا إعتراضي لێ بگرين وجوابي بدەينەوە!!! (تاوی مەيدان و قسەی بەر ئاگردان لێك دوورن!) ﴿قَالَ ٱبْنَ أُمَّ﴾ ئەی كوڕی دايكم! وەلەو دايكم كە ئاشكراو ظاهرە أمری وی ڕەحم وديانەت بوو ﴿إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِي﴾ بێ هێزيان زانيم أعوانم

کم بوو، ئەوان زۆر بون مبالاتیان بە من نـەکرد ﴿وَكَادُواْ يَقْتُلُونَنِي﴾ نێزیـك بـوو بمکوژن. ﴿فَلَا تُشْمِتْ بِيَ ٱلْأَعْدَآءَ﴾ دوشمنم پێ خۆش مەکە. لاشك عبیدی (عجلي) بە دوشمن زانیوە. ﴿وَلَا تَجْعَلْنِي مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٥٠﴾ لەوانم حساب مەکە. ﴿قَالَ﴾ (موسی) کە معذرەتی برای خـۆی زانـی، دوعـای کـرد. ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِي وَلِأَخِي﴾ حضرەتی (هارون) وەك حضرەتی (موسی) بێ قصور بووە، أمّا قوەتی إدارەی حضـرەتـی (موسـی)ی نـەبووە، متواضـع بـوو، نـەرم بـوو. ئەڵێن: (بۆیە بنی إسـرائیلی مَیْلـي ویـان زیـاتر بـووە). حتّـا مـن ئـەتوانم بڵـێم سوادی أعظم لەو قومە حضرەتی (موسی) یان خۆش نەدەویست بەڵکو ڕقیـان لێ ئەبۆوە، سبب وموجبی إختلاف مشربی (موسـی) و (هـارون) ومقـامی تربیـە بوو، ئەویش لەناو (جولەکان) گەورە بوبا، وەك (هارون) ئەبوو. (تفسـیری ئـەو مجملە انشاالله لە موقعێ مناسب عرض ئەکرێن). ﴿وَأَدْخِلْنَا فِي رَحْمَتِكَ﴾ لە ڕەحمـەتی خۆتـا نقـوم مـان بکـە اِحاطـەمـان پـێ بـدە ﴿وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ١٥١﴾ (یـا أرحـم الـراحمین إرحمنـا)! ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلْعِجْلَ﴾ دروسـتیان کردبـوو. ﴿سَيَنَالُهُمْ﴾ لاحـەقیان ئـەبێ لەمـەودوا لـە قیامـەت. ﴿غَضَبٌ﴾ (أيُّ غضبٍ) ﴿مِّن رَّبِّهِمْ﴾ لە خوای خۆیان، خوای مُتَّخَذ، یاخوای حقیقـی! ﴿وَذِلَّةٌ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ مُحقَّـر ومُهـان ئـەبن. ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُفْتَرِينَ ١٥٢﴾ خصـوص ئـەو نوعـە إفترایـە –ولکـن بشـرط أن یکـون للـدّین صَوْلَهُ– ﴿وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ ولـو زۆرو گـەورە بـن ﴿ثُمَّ تَابُواْ﴾ بانـەختێ تأخیریش بێ ﴿مِنۢ بَعْدِهَا﴾ پاش إرتکابیان ﴿وَءَامَنُوٓاْ﴾ إیمانێ صحیح، ئەگـەر (کفر) لە جمعی سیئاتەکانبێ. ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ یا(موسی)! ﴿مِنۢ بَعْدِهَا﴾ لە پاش

تۆبەی مذکورە. ﴿لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝١٥٣﴾ کەوابێ ئەوانەی مُضِلّن کە عبادی خوای لە ڕێ دەبەنەدەر، هیاکل وأصنامیان بۆ دروست دەکەن، ترغیب وتشویقی خەڵك ئەدەن بۆ عبادەتی غیری خوا وەك دعاتی کفرو، ضلال و، بِدَعْ دووچاری غضبی خوا ئەبن. لاشك زێڕا تۆبە ناکەن بە تۆبەیێ دروست. ئەوانەی دوای ئەوان ئەکەون ئەگەر پەشیمان ببنەوە توبەیێ دروست بکەن. خوا لێ یان خۆش ئەبێ چونکی أکثری مفسرین تَفسیری (إتخاذ)ی (عجل)یان بە عبادەت کردۆتەوە لەو مقامە، زۆر مُقصِّرن!! (سیِّد رشید) ئەفەرموێ: (وقالَ بَعضُهُم – بریا بمزانیبا کێن؟– (إن هذه الذِّلَّة خاصّة بالسامِرِيِّ). من ئەڵێم: (ئەبێ ئەو مفسرانە بەو نوعەی کە ئێمە تفصیلمان دایێ وابفەرموون، بەڵێ زۆر جوانە).

﴿وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلْغَضَبُ﴾ کە ڕقی نشتەوە ساکت وساکن بوو ﴿أَخَذَ ٱلْأَلْوَاحَ﴾ هیچیان نەشکا بوون، چەند بوون بێ نقصان هەڵی گرتنەوە.

﴿وَفِي نُسْخَتِهَا﴾ لەوەی لەسەر (لوح)ەکان نوسرابۆوە (أعنی) (تورات) ئەوە ظاهرە، مع أنّه شتاقە مُفَسِّرەکان وا نافەرموون! ئەفەرموون (فیما کتب فیها).

﴿هُدًى وَرَحْمَةٌ﴾ بیانی حەق وإرشاد بۆ خێرو صلاح. بعضێ بۆ ستری درۆی خۆیان ئەڵێن: (لە حەفت ألواح شەشی شکا بۆ ئاسمان چوونەوە، ئەوانەی کە تفصیلی هەموو شتیان تێدا بوو، لوحێ مابوو هدایەت ورەحمەتی تیا بوو).

نازانم لە (أخذ الألواح) ئەڵێن چی؟ ألواح أساسی (تورات)ی حقیقیە، خرافات ومزخرفاتی تیانیە. لە (میقات)ی (موسی) (جوو) ئەڵێن: (تورات ئەڵێ موسی رۆیتی خوای خواست، ووتی ڕووم نابینین کە تێپەڕێم لە پشتەوە تەماشام کرد) وەی وەی لە (تورات)ی بنی إسرائیلیان!!! ﴿لِلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ ۝١٥٤﴾ لە خوا ئەترسن، بۆ خوا ئەترسن، خۆیان ئەپارێزن لە کفرو فساد. ﴿وَٱخْتَارَ مُوسَىٰ قَوْمَهُۥ﴾ لە قومی خۆی بێ تفریقی أسباط ﴿سَبْعِينَ رَجُلًا

﴿لِّمِيقَـٰتِنَا﴾ حەفتا پیاوی بۆ میقاتی ئێمە هەڵبژارد هەتا گوێیـان لـە کلامـی خـوا بێ. ﴿فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ﴾ لـەرزێ شـدید نێزیـك بـوو أعضـایان لـەبار یـەك بێنێتەدرەن تحملی إستماعی کلامـی خوایـان نـەکرد، دیـارە ئـەو دفعـە طلبـی رۆیتیان نەکردوە. مختاری شێخ محمد عبدە (مجددی مصری) و (سـیّد رشـید) ئەوە کە میقات بۆ حـەفتا کەسـی دووجـار بـووە. ﴿قَالَ﴾ (موسـی) ﴿رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ﴾ پێش میقات. ﴿وَإِيَّـٰىَۖ﴾ تضرّع ئەکەم اﻵن ئەو قومە هلاك مەکە ﴿أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ﴾ عبیدی عجل. ﴿إِنۡ هِىَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ﴾ نیە ئەو فتنە الاّ إمتحان کردنـە لـە طـرف تـو. ﴿تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ﴾ ایـتێ ئـەنوێنێ ئەبێتە سبب بۆ زیادە طمعی بعضێ تەنگ ظرفی تێ نەگەیشتی طلبی خارقە تر ئەکا، تاکو توشی کفرو ضلال ئـەبێ. بـە (خـوار)ی گۆلکی مصـنوع ئەکەوێتـە سجدەی مذلّەت ﴿وَتَهۡدِى مَن تَشَآءُۖ﴾ بێ (بها). بـە فکـرو نظـر لـە خارقـە، بـۆ سننی خلق وإیجـادو قواعـدی فطـرەت ئـەڕوا. ﴿أَنتَ وَلِيُّنَا﴾ ولـيٌّ ومُـدبّری ئێمـە دینی ودنیوی، تۆی، غیری تۆ نیە. ﴿فَٱغۡفِرۡ لَنَا﴾ لێمان خـۆش بـە مۆاخـذەمـان مەکـە. ﴿وَٱرۡحَمۡنَاۖ﴾ ڕەحمـەتی خۆتمـان بەسـەردا بڕژێنـە بـەزەیمان پـێ بکـە. ﴿وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَـٰفِرِينَ ١٥٥﴾ لێ خۆش بونی تۆ بێ غرض وعِوَضـە. ﴿وَٱكۡتُبۡ لَنَا﴾ بۆمـان بنووسـە ﴿فِى هَـٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةً﴾ حیـاتێ خـۆش بـە حریّـەت وإستقلالیەت بە دەوامی سلطنتی دینی ودنیوی تاقیامـت. ﴿وَفِى ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ لـە قیامەت بۆمان بنوسە نائلی جوارت بـین لـە دار السـلام (دار الخلـد). ﴿إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَۚ﴾ ئێمە هدایتمان بووە رجوعمان کردیتە لای تـۆ –مقصد دەوامـی لطـف ومەرحمەتی کبریائیە بۆ شعبی بنی إسرائیلی إلى الأبد–. فـالجَواب جـوابـێ بێ

إضطراب موافقی طلب چیە؟ ﴿قَالَ﴾ پەروەردگاری أنام ﴿عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ﴾ لەهەر شعبیّ بیّ، لە پێغەمبەران پاش کەوت بوبیّ، یا لە جنگەنان، دەرکەی عذابی من لەسەر خۆتان پێوە مەدەن و بۆ خەڵکی بکەنەوە. ئەڵێن _حَسَنْ) خوێندویەتیەوە (مَنْ أساءَ) وەنسبەت بۆ (زیدي بن علي) دراوە. لام وایە سامع (غلط) بووە بە وجهی تفسیریان فەرمووە: (مَنْ أشاء ، مَنْ أساء) ئەوجا وای زانیوە قراءَتە. ﴿وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ﴾ دینی ودنیوی، شاملی هەموو شتە هەموو شعبە لە شعوبی بنی آدەم. مەڵێن دونیا بۆ بنی إسرائیلی داندراوە ئەو ماڵی بەدەست خەڵکەوەیە ای ئێمەیە لێمانیان غصب کردووە بەهەر وەجهیّ بیّ ئەبیّ بیخەینەوە دەست خۆمان. نبوّەت ورسالەت ﷺ لە أعظمی ڕەحمی الاهیە دەر حەق بشر خاصّی مەکەن بە خۆتان، دەرکەی ئەو ڕەحمەتە عظیمە لە شعوبی تر مەبەستن. مادام ڕەحمەتی من هەموو شت دائەگریّ شامل وکاملە وا تەنگ نیە بەس بەقەدەر قەدو باڵای بنی إسرائیلی بیّ. ﴿فَسَأَكۡتُبُهَا﴾ ڕەحمەتی حسنەی دارَین ی خۆم ئەنوسم ثبت ئەکەم ﴿لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ لە مفاسدی دین و دونیا خۆیان بپارێزن بە دین وبە نسب مغرور نەبن مُتکبِّر نەبن بە إحتراز وإحتراس بن لە مصالّح غافلّ نەبن. ﴿وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەکاتی ماڵی خۆیان بدەن بە مستَّحقان، لە هەر قومیّ بیّ، بخیل وشحیح نەبن، ئێوە ئەگەر ئەو شرطانە دەرعُهدە ئەکەن، ئەوانوسیم. ﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا﴾ جَمیعی ایاتی خوا لە هەر پێغەمبەریّ بیّ قولی و فعلی. ﴿يُؤۡمِنُونَ ١٥٦﴾ لەهەر شعبیّ بن بۆ ئەوانیش ئەنوسم. ئەوانیش بەڕاستی کێن؟ ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ﴾ پێغەمبەریّ بلند، فطرەت پاك، بە تربیەی معلمان نەگۆڕاو، بیّ تأثُّر بە أفکاری عَمرو زَید. لە مجلّەی مصریم دیت (برناردشۆ) کاتبی شَهیری إنکلیزی لە مجمعیّ خطبەیکی داوە بۆ (شُبّان)ی

مکاتب، ئەز جملە ئەڵێ: (کە ئەچنە مدارس ئاگاتان لە عقڵی خۆتـان بـێ، زێـرا أسـاتذە سَعی ئەکـەن عقڵـی خۆتـان لـە سـەرتان لابـەن عقڵـی خـەڵکی لـەناو دانێن.). حقاً وایە خوێندەوار نابێتە صاحبی عقڵ و فکر و هۆشی خۆی، تـابعی عقڵ و فکر و هۆشی خەڵك ئـەبێ، خاصّـةً مـەلایێ کـە مـەیلی دڵـی لەگـەڵ بـێ هەرچی لەوی نقل بکرێ بلا محاکمە قبوڵی ئەکا. إجتهـاد بـۆ چـی لـە عالـەمی إسلامیەت قطع بوو؟ هەر طائفە قولی إمامێکی قبـوڵ کـرد، ئەوەنـدەی مجتهـد سعی لە کلامی خواو پێغەمبەر ئەکرد، ئەوان سعیان لە کلامی إمامیـان ئـەکرد، تعصُّب کەوتە ناویان أدلّەی شرعیە إهمـال کـرا، اجتهـاد نـەما، ناشـکرێ نـەبێ ئەمرۆ لە زومرەی علماء پیاوێکمان نیە بە پیاوان بچـێ. ﴿ٱلَّذِى﴾ ئـەو رسـولە مجتبایـەی ﴿يَجِدُونَـهُۥ﴾ قـەومی تـو ئـەی (موسـی)! پـێش (بعثـی) ئـەبینن. ﴿مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ﴾ لای خۆیـــان ﴿فِى ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيـلِ﴾ ئـــەوەإشــــارەت وبشارەتە بۆ (بعث)ی (عیسـی)، بـەڵام تفسـیری نەفـەرمووە، چـونکی ئـەو لـە خۆیان بووە، ئانزیادە مقصد ئەوەیە بنی إسرائیلی إیمان بیـنن بـە رسـولێ لـە غیری شعبی خۆیان، وەهـەم إیمـان بـە رسـولی (أمّـی) مُسـتَلزِمە بـۆ إیمـان بـە (عیسی). ﴿يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡـرُوفِ﴾ ئەوەی حسن بێ روحـی حیـات بداتـە قـوم أمریان پێ ئەکا. ﴿وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَـرِ﴾ نهیان لێ ئەکا لـە شـتی ناشـیرین خراپ، بێ فرق وجودا، أحکـامیی إیجـابی وسَـلبی. ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتِ﴾ طعامی پاك، بێ علّت. ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَـٰٓئِثَ﴾ پـیس، بە عِلّـت. ﴿وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ﴾ تکالیفی شاقّەیان لەسەر هەڵئەگرێ، لێ یان دوور ئەکاتەوە. ﴿وَٱلۡأَغۡلَـٰلَ ٱلَّتِى كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ﴾ ئـەو زنجیرانـەی کـە لـە سـەریان بـوو مـادّی ومعنوی ئەیشـکێنێ، ئـەیانکا بـە حُـرّو سەربەسـت، بـێ تـرس ولـەرز. لەوانـەدا إشارەیە بۆ (موسی) کە قومی تو توشی ئەوانـە ئـەبن. ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ﴾

لەهەر شعبیّ بی ﴿وَعَزَّرُوهُ﴾ تعظیمی بکەن. ﴿وَنَصَرُوهُ﴾ یارمەتی بکەن لەسەر دوشمنان. ﴿وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ﴾ ئەو ڕوناکیەی کە لەگەلّ وی هاتووە. زاتاً خۆی منوّرە، نوری فطرەتی تێك نەچووە بە تعلیمی مُعلّمی سوء. خلاصە خۆی نورە، نوری لەگەلّ هاتووە، نوریّ صاف بیّ دروکەلّ خۆیان لەو نورە نور وەرگرن، دلّی خۆیان مُنوّر کەن، لە ژەنگی عِنادو عصبیەت مُثقّلی کەن. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٥٧﴾ هەر ئەوان بە مطلبی حسنەی دونیاو آخرەت ئەکەن، لە (دارَین) ئەکەونە ناو ڕەحمەتی من. ئەی (کلیم) تۆ ئەگەر حەز ئەکەی دەوامەتی حسنەی دونیاو وآخرەت بۆ بنی إسرائیی ببیّ، و ایات تیّ بگەێنە مادام بەو گوێرەیە ڕەفتار بکەن، نائلی سعادتی دارَین ئەبن، وإلاّ فلا! ! ! بەو تحریرە نایابە دەرئەکەویّ جواب مطابقە شاملە بۆ بنی إسرائیلی زەمانی (موسی) زەمانی (عیسی) زەمانی خاتم الرُسُل (النَّبيُّ الأُمّي). دیارە جەنابی حەق سَلّمَهُ السّلام نافەرمویّ دوعام قبولّ کردی! (معاذ الله) ئەگەر بلا قید وشرط بی فەرمووبا، بنی إسرائیلی بالمرە لەریّ دەچونە دەر چی وای نەفەرمووە ئەو نوعە إفترایانە ئەکەن، ئەگەر بیفەرمووبا، ئەبایە چی بلّێن؟ ئەوانەی جەنابی حەق فەرموی أتّباعی رسولی بنی أمّی ئەکەن ئایا کەی ئەیکەن؟ لەو وەقتەی کە خوا ئەفەرمویّ ﴿قُلۡ﴾ ئەی رسولی نبی أمّی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ عامّةً. ﴿إِنِّي﴾ بِحَق. ﴿رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا﴾ بلا تفریق. ﴿ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ خوایێ ئەوتۆ بۆ ئەویە، إی بۆ ئەویە موجوداتی عُلوی وسُفلی. ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هەر ئەوە مالکی عالەم، غیری ئەوکیّ هەیە؟ ﴿يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ﴾ حِسّی ومعنوی. مادام إحیاو إیماتەی حِسّی شاملە، کذا إحیاو إیماتەی معنوی، بۆیە کلّی شعبیّ هەیە، رسولێکی بوو، حتّا (کوردیش) بۆ زیندی کردنەوەو حیاتی معنویان. ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ﴾ (وَحدَه

لاشريك له) نـه لـه ربوبيـەت نـه لـه ألوهيـەت. ﴿وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلْأُمِّيِّ﴾ (محمد المُصطفى العربي الهاشمي القُرشيّ)، خۆى بـه عنـوانى معروف ذكر ئـەكا. ﴿ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ﴾ (أتمّ الإيمان) بێ شائبەى شرك ﴿وَكَلِمَٰتِهِۦ﴾ بۆ خۆى هاتبێ يا بۆ پێغەمبەرێ تر نـازل بـوبێ. ﴿وَٱتَّبِعُوهُ﴾ (فيما أمر ونهى). ﴿لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾﴾ يَعنى ئەگەر رجـاو أملى هدايـەتتان هەيـە، إيمان بەو رسوله بێنن وەمتابعەى بكەن، وإلاّ به هيچ وەجهى تر أمێدى هدايەت مەكەن. (سبحان الله) تەماشاى نظمى قرآن كەن چى بەچى ربط ئەدا! ماجراى زەمانى (موسى) خِطابێ له زەمـانى (خـاتم) چـۆن ئەهۆنێتـەوە!! ﴿وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٌ﴾ جماعتێ زۆر گەورە محترم حەق شـوناس. ﴿يَهْدُونَ﴾ خـەڵكى هدايەت ئەدەن ﴿بِٱلْحَقِّ﴾ بـێ تحريـف وتـدليس وتلبـيس ومجهـودى خـواى بـزر ناكـەن، بنـوارە ئـەو مـاجراى دوعـاى (موسـى) وجـوابى حـەق لـه ترجمـەى (تـورات)دا نيـه. ئـەو گروهـه وەك ئـەوانى تـر نـين لەسـەر حـەقن. ﴿وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٩﴾﴾ لـه أحكـام. ئـەو قومـه خاوێنـه تـا زەمـانى (عيسـى) مـابوون وەدواى زەمانى (عيسى) تازەمـانى (محمد) مـابوون ولـو كـەمتربن. دوايـێ لـه تفسيرى (إبن جرير) ديتم (يهدون) بـه (يهتدون) تفسير ئەكاتـەوە، ئـەوەم زۆر پێ خۆش بوو. هەر طائفەيێ، له أتباعى هەر رسولێ بێ، طالبى حەق بێ، دين نەكاتە تَعَصُّبى قوميەت، ئەگەر رسولێ بۆ ئەوان إرسال كرا، إيمانى پێ دێنن. أمّا ئەوانەى به تعصب بێ حكميان ظلم بـێ إنصـافيان نـەبێ، أصـلا إيمـان بـه رسولێ اتى ناهێنن بەڵكو سعى ئەكەن له إطفـاى نـورى وە إبطـالى دينـى. دائـر بەو قومه بعضه خرافاتيان نقل كردوە، مەلايـەكانى مُحِقّ ومُحَقِّقْ وەك (فخرى رازى) و (سيدى آلوسى) و (سيد رشيد) پێى راضـى نـين، لايـان حكايـەتێ بـێ سَنَدو ثُبْته، منيش وەك (سيد رشيد) نقلى ئەو حكايەتانه ناكەم مـەرەكبى لـێ

خەسار ناكەم ﴿وَقَطَّعۡنَٰهُمُ﴾ قومی (موسی) عامَّةً. ﴿ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا﴾ دوازدە قطعەن پیٚ یان ئەڵێن (أسْباطْ) كُلّي قِطعەیی سَبطیكە، قبیلەیەكە. ﴿أُمَمًاۚ﴾ هەر طائفەیی أُمَّتیكە، جماعتیكە، هەر جماعتە مشربێكی هەیە ، لە شئونی خاصَّەی خۆیان نِظام و قانونی یان لێك جودایە هەر وەك هەموویان راجع ئەبنەوە بۆ لای یەك أصل. آمین بن قومیٚ هكذای بیٚ إتحاد ناكەن، ئەگەر بالغرض بش بیٚ زۆر زوو تێك ئەچیٚ. بە (نزل)یەتی بە (مُضَرْ)یەتی لە صدری إسلام إتحاد نەما، (فَكَيْفَ) بە دوازدە سَبْطی؟ لە عددی أسباط مبالغات زۆرە، ئەوەندە معلومە كە زۆر بوین. ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰهُ قَوۡمُهُۥٓ﴾ هەموویان لەو طَلَبە حَقيقةً حەقیان هەبووە. ﴿أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَۖ﴾ چ حجریٚ؟ طبعی ئەو وەقتە معلوم بووە. أمّا نقّالان لە حجری أساسیەوە بۆ ئێمە یان گێڕاوە بە مجهول. هەرچی هەیە بە (عصای) پیٚ دا ﴿فَٱنۢبَجَسَتۡ﴾ دەرقولی ﴿مِنۡهُ﴾ لەبەردەركە دەرعقبْ. ﴿ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنًاۖ﴾ دوازدە كانی (عَدَدَ الْاسباط). ﴿قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ مَّشۡرَبَهُمۡۚ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ﴾ تیٚ پەڕی تفسیری ئەو أیەتە لە سورەتی (بقرە). ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ﴾ لەو وەقتەیا أمری پیٚ كردن. ﴿وَمَا ظَلَمُونَا﴾ حاشا ظُلْمْ لە خوا ناكریٚ هەر چەند إنسان لە حَدّو حدودی تجاوز بكا. ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١٦٠﴾ عاصی بیٚ أمْكْ هەر لە خۆی ظلم ئەكا، نفسی پیس و ملوث ئەبیٚ لە فطرەتی پاك دەرئەچیٚ. ﴿وَإِذۡ قِيلَ لَهُمُ﴾ لە طرف (باری)خوا لە پاش طلبی سیرو پیاز ﴿ٱسۡكُنُواْ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ﴾ (قدس) و (اریحا). برۆنە ناویان تیای دانیشن. ﴿وَكُلُواْ مِنۡهَا﴾ لە طعام و معامی ویٚ. ﴿حَيۡثُ شِئۡتُمۡ﴾ لەهەر كویٚ حەز

ئەکەن. ﴿وَقُولُواْ حِطَّةٌ وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّدًا﴾ خاضع و خاشع بێ ظلم و تجاوز لە حَدْ. لە قِصّەی (موسی) وە سائری رُسَلْ کە تکرار ئەکرێ، إختلاف عبارات ئەبێ بە تقدیم و تاخیر وە بە ترتُّبی حکمێ لە حکمێ وە بە تبدیلی روابط. وە بە حذف و زیادەی بعضێ کلمات، مُفَسِّرینی عظام فرسانی میدانی بلاغە وەك (زومَخْشَري) (فخرالدین الرازي) (بیضاوي) (سَیِّدي آلوسي) (سَیِّد رَشید) رضوانی خوایان لێ بێ تَوْجهاتی زۆر جوان جوانیان فەرمووە. بە (عصا)ی قَلَمْ وَیَدی بیْضای عِلم، تحری ظُلُماتی أوهامی مُلحِدینیان شەق کردوە، لە معدنی بلاغەت و فصاحت (لا یَعُدْ)کانیان هەڵقەناندوە کە هەر تُشنەبێ براعت و بدیع و بیان مَشْرَبیخۆی لێ بەدەست کەوێ. ئێمە لەو (تفسیر)ە کوردیە نەمانتوانی ئەو تطبیقات و تحقیقات و تدقیاقاتە بیان بکەین. ئەوەندە ئەڵێم مقصد خلصی معنایە، زێدەی سهلە بۆ أربابی بلاغت، وە هەم مَنْشَأی إختلافی تعبیراتی قرآنی إختلافی عباراتی سابقە ئەڵبەتە ئەو فەرمایشاتە بەیەك دەفعە نەگوتراوە بە صُوَری عَدیدە ذکر کراوە، قرآنی کریمیش بە صُوَری عَدیدە نقلی ئەکا، مَثَلاً لەو آیَتە بە هەردوو ترتیب إختلافی فەرمووە (أدْخُلوا قولوا) (قولوا أدْخُلوا) مَرَّةً (أُسْكُنُوا) مَرَةً (أدخُلَوا) ئەوها. لام وایە ئەمە زۆر موافق و مطابقە. ﴿نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيٓـَٔـٰتِكُمْ﴾ لێرە وەك سورەتی (بَقَرَ)ە (نافِع) و (إبنُ عامِرْ) (خَطایاکُمْ) یان قراءت فەرمووە. یعنی گوناهتان ج کەم بێ ج زۆر عفوی ئەکەم، فرقی زۆر و کەم نیە. بنا لە نقلی (سیِّد رشید) (إبنُ عامر) (خَطِئَتکم) بە افرادی خوێندوتەوە، یعنی یەك ونۆ و، دەوو یازدە ج وماقوقی یازدە فرقی نیە. وە(سیِّد رشید) ئەڵێ: ((لَعَّلَ)) إشارەتی تیایە بۆ گوناهێ خاص مشترك) خلاصە أهلی ذوق وەلەو (نکاتانە) تادەرەجەی قُطُب ئەتوانێ (نُكَتْ)ی بلاغە إبراز بکا. ﴿سَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٦١﴾﴾ لێرە بێ (واو)ە! یعنی ئەو زیادە لە عینی فضل کَرَمە

وەممکنــە بکرێتــە پــاداش. ﴿فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ﴾ دەرعَقَبْ ئــەو تبدیلەیان کرد بناءً علیه تۆ چۆن تمنای دەوامی عزو مکنـەتی بنی إسرائیلی ئەکەی؟ ﴿قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ﴾ قولیٚ پڕوپـوچ ئەوەنده پڕوپوچە نقل ناکریٚ. ﴿فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِجۡزًا﴾ عـذابیٚ. ﴿مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لەسـەرەوە. ئەڵێن ئەوە (طاعون) بوە. ﴿بِمَا كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ١٦٢﴾ سبب بە ظلمیان.

﴿وَسۡـَٔلۡهُمۡ﴾ یاخاتَم الرُسُل سؤال بکە لەو بنی إسـرائیلیانەی زەمـانی خـۆت، ئەو ما جرایە پاش حضرەتـی (موسـی) بـوە بۆیـە شـێوەی عبـارەتی گـۆڕی! ﴿عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ﴾ لەدەم بەحر بوە. ئەگـەر سـؤال لە مفسّرینان بکەی ئەو دیٚ یە چ دێیەکە؟ هەریـەك بە نوعی جـواب ئــەدەن. ﴿إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ﴾ تجـــاوزیان ئـــەکرد، شـــەمویان ئەشکـــاند. ﴿إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ﴾ ماسیەکانیان. ﴿يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ﴾ لەرۆژی شەمویان. کـە بیـان گرتبایـە ئـیش و کاریـان تێـدا نەکردبایـە، ماسـیەکانیان ئـەهاتن. ﴿شُرَّعًا﴾ لیٚ یان نێزیك ئەبونەوە ظاهر ئـەبون کەڵەکـەیان ئـەکرد دەهاتنـە تەنکاو بـەزۆری. ﴿وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ﴾ شـەمویان نـەگرتبا بیـان شـــکاندیا ﴿لَا تَأۡتِيهِمۡ﴾ بۆلایان نـەدەهاتن. ﴿كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم﴾ إمتحانمـان ئـەکردن. ﴿بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٣﴾ سبب بـە فسـقی دائمیـان لـە هـەموو شـت، ئـەوجا کەلەو حاڵەگەیشتن، حیلەیان ئەکرد، ڕێی گەڕانەوەیان لـە ماسـیەکان ئـەگرت، لــە ڕۆژی یــەك شــەمودا ئــەیان گــرتن. ﴿وَإِذۡ قَالَتۡ أُمَّةٞ مِّنۡهُمۡ﴾ ئـەبیٚ لێـرەش بفەرمون (کثیرةٌ)؟ ڕەنگە! چونکی کَثْرَت هـەتا کَثْـرَت فرقـی هەیـە. ئـەو أمّتـە إشتراکیان نەدەکرد لەگەڵ فاسقەکان ونصیحەتیشیان نەدەکردن. بە (ناصح)ە کانیان ئەگوت ﴿لِمَ تَعِظُونَ قَوۡمًا ٱللَّهُ مُهۡلِكُهُمۡ﴾ مەحویان ئەکاتـەوە ﴿أَوۡ مُعَذِّبُهُمۡ

عَذَابًا شَدِيدًاۖ﴾ بە قوەت بیّ أمّا مُمحی نەبیّ. لە ڕەوشت وإصراریان ئەیان زانی نصیحەت تأثیر لەوان ناكات، وەبیّ شبهە خوا (أحد العذابین) یان ئەدات. ﴿قَالُواْ مَعۡذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمۡ﴾ تا لە خدمەت خواتان بلّێین یاربّی ئێمە قصورمان نەكرد لە نصیحەت واجبی خۆمان أدا كرد، ئەگەر تركی وعظیان بكەین بەهانەمان چیە؟ اضافەی (رَبّ) بۆلای ئەو أمتە زۆر وردو بە دقّتە یعنی حەق وابو ئێوەش وەك ئێمە بن، چونكە ئەمە بۆ خوایە ﴿وَلَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ١٦٤﴾ نابیّ قطعی أمێد بكەن، وەك من قریبی سی سالە رمضانان وعظ بۆ موسلّمانان ئەدەم أمّا وعضی حكایَت وچیرۆكە نا! باوڕ ناكەم مثقالیّ تأثیری لە أحدیّ كردبیّ! ﴿فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ﴾ كە گویّ یان نەدانیّ بە خیالّیان دا نەدەهات وعض وتذكیر وإنذاری صلّحای قوم ﴿أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ﴾ لە خراپەیّ عاقبت خراپ. عذابەكە عذابیّ وانەبوو (یَعُمُّ الكُلَّ) بیّ، عذابیّ نادر الوجود بوو، نەدەشا بۆ صالّحەكان بیّ، ئەگەر بلّێین ئەو عذابە (مَنجيٌ عَنْهُ) وە عذابیّ آتی بوو، بەلاّم ظاهر وایە عذابەكان جودابن. ﴿وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ (فقط)، هەر ئەوان، یامُحَقّق. ﴿بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ﴾ زۆر بە شدّەت لە خراپی دا. با ئەو عذابە فقر بیّ، ممكنە بلّێین ئەوانە بەڕاوە ماسی بەڕێوە چوین، دوای ئەو حیلەیە بالكلّی ماسی لەو أطرافە تۆراون، وەنەشیان توانیوە بچنە جهتیّ تر. ألآن قاعدەیە لەسەر زێی (بادینان) هەردیّ یە حدودێكی هەیە ئەوانی تر ناتوانن بیچنیّ بۆ ڕاوە ماسی، مەگەر بەدزی. وەكە سابەتێكی تریشان نەدەزانی، لەبەر ئەوە دوو چاری فقریّ شدید بوبون ﴿بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ١٦٥﴾ أنّە فسق ببوە خویان. ڕەنگە سبب بە فقر دزیان كردبیّ، لیّ یان ئاشكرا بوبیّ، حەپس كرابن زۆر إهانەو حقارەتیان لەدەست ئەوانی تر دیبیّ. ﴿فَلَمَّا عَتَوۡاْ﴾ تكبّریان كرد ﴿عَن مَّا نُهُواْ عَنۡهُ﴾ لە هەرچی نهیان لیّ ئەكرا،

بەجاریٚ لە حد دەرچون ﴿قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ١٦٦﴾ أمرمان کردنیٚ بە أمری تکوینی ببنە مەیمونیٚ مُهان ومُحَقَّر، مەیمونەکانی أدنی نەك مەیمونەکانی ڕاقی وەك شەمپانزی کە (داروین) وأشیاعی (داروین) ئەڵێن: (أصلاً ئێمەو مەیمونە ڕاقیەکان لە أصڵێکین) –خلاصە مەیمونیٚ هێسك گرانی بەدفەڕی کەری گەمە نەکەر– ئایا حقیقە بوینە مەیمون؟ چ قەیدیە! مادام قبولٚ ئەکەن مەیمون تەرەقی بکا ببێتە إنسان، قابلە إنسانیش تَدَنّی بکا ببێتە مەیمون. دیتومانە إنسانیٚ ،جوانی ناسك، هێسك دقیق، پێست رقیق، پاش سی، چل ساڵی دیومانەوە وەك ورچی لێهاتبوو. (داروینی) ئەڵێن إنسان لە زگی دایکا هەمو تطوراتی بشری بەسەر دادیٚ تا ئەبێتە إنسان، کەوابیٚ ئێمە مدّەییٚ لە ڕەحمی والدەمان بوینە مەیمون! مسڵمانی ئێستا عجایبن قسەییٚ لە عالەمیٚ طبیعی ئەوروپی ببێن، دەرحالٚ قبوڵی ئەکەن! أمّا ئەگەر حکمیٚ لەوە نێزیك تر لە رسولیٚ نقل بکریٚ بڕوا ناکەن! گۆییا ئەوانە فەیلەسوفن!!!

﴿وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكَ﴾ إعلانی کرد خوای تۆ. لەو (إضافە) سرّیٚ خۆش هەیە! ﴿لَيَبۡعَثَنَّ عَلَيۡهِمۡ﴾ بعثیٚ تکوینی. ﴿إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ تا إنقراضی بشر. ﴿مَن يَسُومُهُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِۗ﴾ پیٚ یان ئەچێژیٚ بەسەریان دادێنیٚ عذابی ذلّت و هوان حقارەت. حتّا لەو عصرەش لە طرف بعضیٚ رجولی سیاسی ئەوروپی زەهری مەرگ ئەچێژن، دەربەدەریان ئەکەن. أمّا إنگلیز خەریکە لە (فلسطین) شتێکیان بۆ بکا،بەلام ئەو سیاسیە مکّارە جێی أمنیەت نیە . ئەمڕۆ ئەگەر لە دەست عەرەبەکانیان نجات دا، سبەی ئەیانکاتە لوقمەی خۆی.

تو أز جنگالی گورگم دەر بودی
چودیدم عاقبت گورگم تو بودی

﴿إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلۡعِقَابِۖ﴾ کە هات بەری ناگیریٚ تخلق ناکا. ﴿وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٦٧﴾ (لِمَنْ تابَ وأنابَ وعَمِلَ صالحاً). لە ڕێی لا نەدات بە تأویل

وقِیلَ قیلْ. ﴿وَقَطَّعۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُمَمٗاۖ﴾ لێکما دابڕین لە أرضی. هەر فرقەیێ کەوتە ولاتێ، بلاوبوون. گەرچی لە أصلا مُدَّیێ مُتَّحد بوون، دوایێ لەبەر سیئّاتی عداوەتی خۆی بەخۆی بالکلّیه متفرق بون.

﴿مِّنۡهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾ لکن لە زەمانی إنحطاط، صُلحا تأثیریان نامێنێ، بێ صولت وهیبت ئەبن. أهلی فسق وفجور شەرمیان لێ ناکەن لێ یان ناترسن ﴿وَمِنۡهُمۡ دُونَ ذَٰلِكَۖ﴾ ئەوانیش طبقاتن. ﴿وَبَلَوۡنَٰهُم بِٱلۡحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ إمتحانمان کردن بە چاکەو خراپە بە عزّەت وذللەت بە غنی وفقر. ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ١٦٨﴾ بەڵکو ئەوانە بگەڕێنەوە لە خراپە ئێمەش ڕووی مرحمەتیان تێ کەین، أمّا ئەوە نەهاتە جێ. ضربەی إمتحانی إلاهی بۆ هەموو قومێ بوە حتّا بۆ ئێمەش لە (جنگین) تا (إنگلین) وائەبێ؟ موسڵمانانیش خاصّةً (کورد) إنابە ناکەن! بەڵکو بە عمومی خراپتر ئەبن! هەر فسق وفجور وبێ ناموسێ وبێ شەرەف هەیە لە آوروپاییان وەری ئەگرن ڕوو لە محاسنان ناکەن!!! حقا أحوالی عالەم گەلێ گۆڕاوە، بایێ دێ شاران وێران ئەکا، چەند پاپۆڕێ بحرێ پارچە پارچە ئەکا، طوفانێ دێ دونیا کاول ئەکا، مزروعات بە فساد ئەبا، ئەڵێن ئەمە غضبی طبیعەتە کەس ناڵێ ئەمە لە طرف خوایە با پەشیمان بینەوە. سوادی أعظم لە بشر ڕووی لە چاکە نیە، ئەوەی ظاهراً ڕووی لە چاکە بێ لە دلّدا شتێ ترە غرضیکیخۆی هەیە. ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ﴾ پاش ئەوانەی کە هەردوو لایان هەبوو أهلی (صلاح ودونهم) دوای وان هات ﴿خَلۡفٞ﴾ بە (سکون)ی (لام). قومێ ناخلف. ﴿وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ (تورات). ئەوە دەورە دەوری علمای سوءە – نعوذ بالله لە علمای سوء– منیش مع الأسف یەکێکم لەوان، هەموو شت ئەزانن، هەموو شت ئەکەن، رأسی دین ودونیان مُدبِّرن، سیاسین، قُوادن، حاصلّی مُدبِّر الأمورن ﴿يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ﴾ ئەوەی

لەبەر چاوە. متعای دونیا چیە؟ بێ دەوامە دێو ودەڕوا، متاعێ نێزیك لەبەر دەست، طبیعی بێ حورمەت، بێ ئەوەی أدنی ی ادونە بۆ ئەمە چاویان لە دەست خەڵکە، یا بە زەکات وصدقە لێ یان وەرئەگرن، یابە ڕشوەت بۆ حکم گۆڕین یا تحریفی کتاب. بەڵێ أهلی علم منقطعن لە کسابەت ومعاملە تاکو ببینە مەلایێ بیست وچوار علم، ئەبێ أمەت بەخێومان بکات. أمّەتیش مەلایێ صاغ بێ نایانەوێ، ناعلاج بە حیلەو دەسیسەو وریای ومکّاریێ، خۆیان خۆشەویست ئەکەن، ئەوجا لەلای أمّەت مقبول ئەبن، کۆنە عەباو جلکی مردوویانیان ئەدەنێ بە ترش وگۆشت دەعوەتیان ئەکەن وعلی الأکثر أمّا أکثری ساحق (لا یُعَدْ ولا یُحصی) مەلایەکانی إسلامی سفلیانن سَفَلَنْ بێ عزەتی نفس بێ دەمارو خوێنی پاکن، بالمرە دین لە دەستی ئەوانە ڕەزیل وبێ قەدرو قیمەت ئەبێ. ﴿وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا﴾ بێ تۆبەو مۆبە! أولادی رسلین! أحبّاو أولیای خواین! خدمەتی دینی ئەکەین !چۆن عذابمان ئەدا؟ حقیقە عینی ئەو فکرە فاسدە لە (جووان) هاتیتە ناو ئێمە. حتّا بە عمومی ئەڵێن ئەوانە أمّتی (محمد)ی نازداری خۆشەویستی خوان، خوا عذابیان نادات!!! ﴿وَإِن يَأۡتِهِمۡ عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُۚ﴾ بێ تۆبە بێ إنابەو پەشیمانی، بەڵکو بە شوق ذوق وەری ئەگرن. ئەمە حاڵی علماو رۆسای دین بێ، سائری أمّە ئەبێ چۆن بن؟ ﴿أَلَمۡ يُؤۡخَذۡ عَلَيۡهِم مِّيثَٰقُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ عهدو پیمانێ کە لە کتابەکەدا بو یعنی (تورات) ﴿أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّ﴾ بێ تحریف و وەرگێڕان. بەڵام رعایەتیان نەکرد لە فکریان چوو. ﴿وَدَرَسُواْ مَا فِيهِۗ﴾ باوجودی خوێندبوویان، ئەوەی تیای بو زاناندبوویان، بەڵام لە فکری خۆیان بردبۆوە إلتفاتیان پێ نەکردبو، باوجودی ﴿وَٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ﴾ کە بەأعمالی صالحی دونیای دەست ئەکەوێ ﴿خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۗ﴾ بۆ ئەوانەی خۆیان لە ڕەزالەت ودناءت وشکاندنی عهد ومیثاق بپارێزن.

﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٦٩﴾﴾ (أيّها المؤمنون السامعون!) لكن مع الأسف بەگوێی إعتبار ئەو ئایەتانەمان نەبیست ئێمەش بە أفكاری (جولەكان) هەڵخەڵەتاین تێ چووین. (ويعقلون) بە مضارعی غائبیش خوێندراوەتەوە! ئەوە دیارە! ﴿وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ﴾ بە تەواوی. بە ظریفی دەست بە كتابی إلاهی ئەگرن دوای ئەكەون مخالفەی ناكەن. ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نەڵێن ئێمە خواصین عملی ئێمە لەگەڵ عملی عَوام جوایزە ئەوانیش لە ڕیزەی عوام داخلی صف بن. ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴿١٧٠﴾﴾ ئەوانەی تمسّك بە كتاب ئەكەن نایگۆڕن حەق تبلیغی عباد ئەكەن ئەبنە آمری بالمعروف ناهی عن المنكر هەر وەكو صالِحنْ مُصلِحن، خوا أجری مصلّحان بە خۆڕایی نابا بە أكملی وجە بە بە مكافات ئەگەن. ﴿وَإِذۡ نَتَقۡنَا ٱلۡجَبَلَ فَوۡقَهُمۡ﴾ چیامان لەسەر ڕاگرتن. ﴿كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٞ﴾ قِطعیَ هەور بوو، بوو بە سقف ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعُۢ بِهِمۡ﴾ چیایەكە بەسەریان دا دەكەوێ، ئەگەر قبوڵی كتاب نەكەن، ئەوەی حاڵی أوائلیان بوو لە حەق كتاب كە صفوەتی بنی إسرائیلی بوون، ئەوە هەموو عنایەت ولطفیان لە خواوە دیتبوو، ئەبێ حاڵی أواخریان چۆن بێ؟ – سبحان الله لە نظمی قرآن! – ﴿خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم﴾ كتاب. ﴿بِقُوَّةٖ﴾ بە جدّ ونشاط. أمّا پاش ئەو جبرە (جِدْ) نابی هەر كرامەت ئەبێ.

﴿وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ﴾ عملی پێ بكەن لە یادی مەكەن. ﴿لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾﴾ لە أعمالی دوُنی و أنوَنی . ﴿وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ﴾خوای تۆ، چ خۆشە ئەو إضافە یە!!ذكرو نَقلی مُعجزات هەر چەندە لە فائدە خالی نیە و بۆ إتمامی فائدة لە قرآنی كَریم یا بە وَجهی إلزامی خَصم یا بۆ رَدّی مُقتَرَحات ذكری ئەكا، تا بزانن إظهاری مُعْجِزە خاصّةً بە زۆری سەر ئەكێشیتە چی، أُمّةَ چ فائدەیكی لێ بەدەست ئەكەوێ، بەلام ئەوەی تامُّ الفائدة بێ بۆ بَشَرْ (نَسلاً بعْدَ نَسْلٍ) (جیلاً

بَعْدَ جیل) ببینن تێی بگەن إقْتدایان پێی ببێ تَوسیعی عِلم و معارفی پێ بدەن، آیاتي کَوْنیَّه یه آیاتي فِطریَّه یه که لەسەر قاعدەێ مُطَرِد جَرَیان ئەکەن، کە وابێ تۆ ئەی رَسولی عَقل و عِلم! أقْرَبي آیَتْ أفْیَدي آیَتْ کە عائدی خَلقی بنی أدەمە بۆ بَني آدەم بَیاني بکە! جەنابی حەق وەری گرتووە هینایەنیە ژێر قَبْضەی عِلم و قُدْرەت ﴿مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ لە أبنای آدەم، یَعني آباءْ ﴿مِن ظُهُورِهِمْ﴾ لە پشتیان یَعني بربڕەی پشت کە (نُخاعي شَوْکي) تیایە وە ئەو نُخاعة وەك أطباو عُلمای تَشریح ئەڵێن، مَداري حَیاتە. ﴿ذُرِّيَّتَهُمْ﴾ توویانی وەرگرت بە قاعدەی تَناسُلْ تَطَوّراتي بەسەرداهێنا تا گەیشتە مَقامی أعْلی ﴿وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ ئاگاداری کردن لەسەر خۆیان، خۆیان ناسی، دەرگەی علم و معارفیان بۆ کراوە، هەیکەلێکی لەو ذَرَّه یە دروست کرد ئـر لە قُوای عامِلە: (وەك هاضِمە ماسِکە جاذِبە غازیە دافعە مُمَثّلە نامیَة مُوَلِّدە مُصَوِّرە)، قوای مُدرکەی ظاهرە: (بەسەر سَمع لَمس شَمْ ذَوق)، باطِنەی دەماغیە (حِسّي مشتَرك، خەیالْ وەهم حافظە مُتَصَرِّفە)، خصوصی عقلی هاویشتێ کە بە حرکاتی فکریّە ئایات و بَدایعی أرض و ئاسمان دەرك ئەکا. کێ ئەو ذَرّە مُحَقَّرەی ئەگەیێنێتە ئەو دەرەجە عالیە؟ ئەوەی بادیَ النَّظَر بێتە بەر حساب یا(خوا) یا(طبیعەت). (طبیعەت) خۆی بێ إدراك و شعورەچۆن ئەو إنسانە مُدرِکە عاقِلە مُدَبِّرە سَمیعە بَصیرە خَلق ئەکا؟حاشا! ئەوەی أدنی إنصافي هەبێ ئەوە ناڵێ!. قوای عاجلەی طَبیعیَّه ئەگەر لە طرف عِلم تَسخیر نەکرێ تَرتیب و تنظیم نەدرێ لە مُعَلِّمێ إستِخدام نەکرێ چۆن ئیش ئەکا؟ هَیْهاتَ!!! کە وابێ ئەگەر بە زوبانی (قال) یا (حال) لە طَرَف مَلِکي مُتَعال بگوترێ ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ (وَحْدي لاشَریكَ لي) ئەبێ بڵێن چی؟ مَجبوراً بالضَّرورة بأيِّ لِسانٍ کانَ ﴿قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآ﴾ وا نەڵێن ئە لێن چی؟ عَلی طَریق الصُّدفەیە؟ حاشا! ئەو إنسانە عَظیمُ الشأنە محصولي طبیعەتێ بێ هۆش و گۆشە؟ خَلقی

دَقیق و منتظم و مُحْکَم و أنیق و رَشیق چۆن عَلی سَبیل الصُّدفه ئەبێ؟ چۆن بە شتێ بێ إدراك ئەکرێ ؟ لاشَكْ وَلامِرَیةَ مُحالە. لە طَرَف عیلمێ قدیرێ بصیرێ خَبیرێ نەبێ ناکرێ! !هەرچەندە أباءْ لە خَلقي خۆیان غافلن أمّا ئاگادارن خەبەریان هەیە لەسەر خَلق و تَطَوُّراتي أبناءي خۆیان. ئەو آیَتە ظاهِرە باهِرە هەر چەندە ئەبا إنسان خۆی بیزانێ حاجەت نەکا بە وَحي إلاهي و تَبلیغي رَسول، أمّا بۆ إکمالي حُجّەت و إزالەی خَفا بۆ أنظاري قاصِرە بَیان کرا بۆ دَفعي مَعْذَرَت وَلَوْ واهي بێ. ﴿أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ لە مَقامي إعتِذار ﴿إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ١٧٢﴾ أکْثَري بَشَر لە أموري مَألوفە غافلن بە دِقّت تەماشای ناکەن (مَعَ أنَّهُ) آیَتێ لە آیاتي کَوْنِیَّە لە صەد هەزار معجزە و خارِقە أنْفَع ترە، هەر ایَتە ئەبێتە مِفتاح بۆ علمێ کە بَشَر إفتِخاري پێ بکا لەسەر مَلَك، کافەی أنام إستِفادەی لێ بکەن. بەلاّم مَعَ الأسَف مەیلی مندالّی خراپ وایە لەکۆل بَشَر ببێتەوە، حتّا گەلێ مەلای چاك لەسەر ئەو مَیْلە ماون، ئەوانیش وەك عَوام کَیْفیان بەشتی سەیرۆکە دێت. بِنا بە مَعنای نَقّالان کە جەنابی حەق دەستی بە پشتی آدەمدا هێنایە ذورریەتی وی تا قیامەت هەموی هاتەدەر، لەو حالەدا کردینە صاحبی هۆش خِطابي لەگەلّ کردینە (أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ) ئەوانیش (قالوا بَلی). ئێوەو خودا کەس ئەوەی دێتە فکر؟ کەس بەو مَعنایە دێتە إلزام خواردن؟ ئێوەو خودا ئەو عِبارە تی قرآني ئەم مَعنایە بە فائِدە ئەدا؟ حاشا وَکَلاّ! هەرچەند بعضی سَعیان کردیە بۆ تَطبیقي، أمّا موافقەی ناکەن! ! . عبارەتێ مُفید بۆ ئەو مَعنایە ئەمەیە: (وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ) توخوا وانیە؟ بەلّێ بە خوا وایە! ! ! من إنکاري ئەو ماجَرایە ناکەم، بابوبێ، بەلاّم هەرچەند منیش وەك (سَیدٌ آلوسي) و(سَیِّد رشید) و مُقَدَّم لەوان (فخرالدین الرازي) تێ ئەکۆشم ئەو مَعنایە بۆ ئەم عبارەتی قرآني نایەتە گۆش و هۆشم! صەد هەزار رەحمەت لە (أبو مُسلم ي أصفهاني) بێ کە دەرکەی ئەو آیەتەی لە موسڵمانان کردەوە نەك لە دەوری

آدەم بەڵکو تا إنقراضي عالەم، بەڵکو أبَدَ الآباد زمزمەی خِطابي (أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ) دێتە گۆشی هۆش داران و ڕوحیان بە لەزەتی ئەو خِطابە مُتَلَذِّذ ئەبێ، نە بەخَیالي بعضێ خَیالیّونی مُدَّعي، بە حەق و حَقیقەت علی الدَّوام ئەو خطابە لذیذە ئەبێن. ﴿أَوۡ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشۡرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ﴾ پێش ئێمە ﴿وَكُنَّا ذُرِّيَّةٗ مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ﴾ فى الحَقیقةً لە أوَّلي فِطرەت وەك خۆمان مُشاهدە ئەكەین لە أولادمان إنسان زۆر بێ هۆش و گۆشە، فەرخەی حیواناتان حَتّا (جاشەكەر) لەو بە إدراك ترە، ناعلاج دوای تربیەی مادّی و مَعنوی أبا و أُمَّهات وأقاربي ئەكەوێ. تقلید پەردەیێ غلیظە دراندنی سەریەخۆی بۆ إنسان مُشكلەیە أمّا پاش ظهور و إظهاري حەق بە أیاتی بَیِّنات لادانی سهلە. ئەوانەی لای نادەن بەس تابعی هەواو عنادی و مُتَعَصِّبن حەقیان نیە بلێن ﴿أَفَتُهۡلِكُنَا﴾ عذابمان ئەدەی؟ ﴿بِمَا فَعَلَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ١٧٣﴾ مُفسِدي فِطرەت نە جَهل، خاصَّةً بە أموری ظاهِرُ البُطلان، نە تقلید پاش ظهوري ئایەت، نابنە عُذر ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ أنْفُسي و آفاقي ﴿وَلَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ١٧٤﴾ غرض و مقصودی ئێمە ئەوەیە، ئەوەی رجوعی كرد لە جهل و تقلید باشە، وَإلاَّ عَذاب و عقاب حەقی ئێمەیە، مُقتَضاي ربوبیَّتە، لازمی هدایەت دان و إرسالی رُسُلە _ نَعُوذُ باللّهِ مِن الجهلِ والتَّقلید_ رجوع لە جهل بۆ علم نزعی رقبەی تقلیدی آباء ئەبێ، بۆ گەلێ كەس بە سهلی ڕێك ئەكەوێ. أمّا رجوع لە تقلیدی أئِمَّەی بِدَع و أهْواءْ مشكلەیە لە غایَتی إشكالە، هادی أُمَّتن مُرْشِد و مُصْلِح و داعي إلى الله ن، مَعَ أنَّهُ، خائنني دین و وەتەن و قەومن، تابعی هەوان طامِعي دونیان مُحِبّي رشوەتن مَیّالي سیاسەتن. بۆ تفریقی بەینی عُلمای سوءوەبەینی عُلمای ناصح و خالص و أمین تا أمَّة بە خائنەكان بڕوا نەكات پێ یان هەڵنەخەڵەتێن ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ﴾ لەسەر أمّيّ دەعوەت، إسماعیلی و إسرائیلی. ﴿نَبَأَ ٱلَّذِيٓ﴾ خەبەرو شأني ئەو كەسەی

﴿ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا﴾ ئەو ایاتەی کە بۆ پێغەمبەرەکان نـازل بـوون. بـو بـە وارثـی کتاب وەری گرتووە خوێندویەتیەوە ئەزانێ چیان تیـا هەیـە لـە عِظـە و عِبَـرو نوری هیدایەت. ﴿فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا﴾ لەو ایاتە دارِندرا، آیات تأثیري لەدڵ نەکرد، بە آداب و محاسنی کتاب مُتَخَلِّق نەبو، بـەڵکو إستعدادی ضـلالي بـەقوەت بـو. ﴿فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ طَماعي تێ کرد، أُمێدی پێ بو دوای کـەوت، وَسـوەسـەی دا، بە وَسوە سە ی شیطانْ مُتأثّر بـو ﴿فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ١٧٥﴾ گـومڕا بـو بە فساد چوو. مەلایێ بە فسـاد چـێ طَبْعـاً إفسـاد ئـەکا، زاتـاً مـەیلی إفسـادی ئەوان أساساً إنسـان بـە فَسـاد ئـەبا ﴿وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا﴾ ئەگـەر حـەزمان کردبا بەو ایاتە بۆ حدی لایق بڵندمان ئەکرد بە علمێ خـاوێن، ڕەزیـل نـەدەبوو بەڵکو گەورە ئەبوو ﴿وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ﴾ مەیلی تسفُّلی بـوو، مـەیلی زێباو زَخارِفِ أرضي بوو، خواستی ببێ بە رآیسی صاحِبي جاه و ماڵێ عَریض و طویل، لەبەردەستی راوەستن سَجْدەي بـۆ بـبن. ﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ﴾ دوایـی هـەواو هەوەسی خۆی کەوت. بۆ نَیلی هەوای غیری اِفسادي عِبـاد سَـلبي عِلـم و عَقـل، چارەیەکی تری نەدیت. ﴿فَمَثَلُهُۥ﴾ تا بیان ناسن. ﴿كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ﴾ وێنەی صەیە. ﴿إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ﴾ مُعارَضَە ومُجادەلەی لەگەڵ بکەی ﴿يَلۡهَثۡ﴾ وەك صـەی دفکـەی دەدا زوبـانی لەگـەڵ هەناسـەی دێنـێ و دەبـا. ﴿أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ﴾ دائماً زوبانی لە حرکەیە، هەناسەی سوارە، طَعنە لە أهلی حەق ئەدا، اِلقـاي شُـبهات ئـەکا، بـەزۆر وەڕی و إلقـاءات، سَـلبي عَقـل ئـەکا، عالـەمێ هەڵتەخەڵەتێنێ. ﴿ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ﴾ لـە إفـرادِ (الّـذي) تَوَهُّمْ نەچێ، ئەوە یەك شخصە ! لە هەموو قَوم هەن زۆرن، حتـا بَعضـە حَکیم ئەبێتە جەریەزە زۆر بلێ فێلێ کەر حَیّال مَکّار خَدّاع. وامـەزانن هەرکەسـێ پـێ

یان گوت (حَکیم) یان (مەلا)ێك ونهاد و حَسَن الخُلقن! لە خزمەت مرحوم (سُلَیمان نَظیف) والی موصل بَعضە صحبەتمان بوو، فەرمووی: (من کەسم نەدیوە لە أهلی عمامە وەك تۆ مُحِبّي مَعارف بێ)، عرضم کرد: (مَعَ هَذا من لە عَلَیە مَعارفي ئێوەم) فەرمووی: (بۆ؟ ) ووتم: (علم و معارف لەسەر چی دابندرێ قوەت ئەداتە وی، ئەوەی بەد نیهادە سَیئُ الخلقە بەواسطەی علم ئەتوانی بە شرارەی شەڕی خۆی ضَرَبە لە خەڵك بدا، عالەمێ بە فَساد ببا، ئەوەی نیهادەکەی طینەتەکەی خاوێن بێ بە علم ئەتوانێ عالەمێ مُنتَفِع بکا، بِناءَ عَلَیْهِ ئێوە أولاً تصفیەی أخلاق بکەن ئەوجا علم و معارف لەسەر دانێن تاکو أمَّة و دەوڵەت إستفادە لە أهلی علم و عرفان بکەن). (نظیف بەگ تصدیقی کردم وە تحسینی فکری فەرموو. ﴿فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ﴾ بۆ أمَّة. ﴿لَعَلَّهُمۡ یَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾﴾ تفکرو تأمُّل بکەن نوعاً ما صاحبی رأی بن، تَوَسُّمي مەلای پاك و پیسیان ببێ، ئەوجا خۆیان بپارێزن. ﴿سَآءَ مَثَلًا﴾ خراپە لە جِهَتْ مَثَل و صفەتەوە. ﴿ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِینَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔایَـٰتِنَا﴾ ئەوانەی تکذیبي آیاتي ئێمە ئەکەن، یا بە سببي آیاتی ئێمە بە تبدیل و تحریفیان تکذیبي حەق گۆیان ئەکەن. ئەو پیاوە کە ئەڵێ من رسولم، درۆ ئەکا، حەق و حقیقەتی کتابی خوای لای منە. ئەو مەلایانەی لە قیدی کتاب و سُنَّة ئەچنە دەر بە خِلافي روایات ئەڕۆن، روحي کِتاب و سُنَّة لای منە. ئەوانە بەو تکذیبە ظُلْم لە ئێمە ناکەن. ﴿وَأَنفُسَهُمۡ كَانُوا۟ یَظۡلِمُونَ ﴿١٧٧﴾﴾ هەر خۆیان ظُلْم ئەکەن روحیان مُدنَّس ئەبێ، بَشَر لە بَشَریەت ئەخەن. لەپاش تفسیری ئەو ایاتی کریمە بەو تَحریرە لام وایە مەیلی حکایەتی (بَلْعَم ومَلْحەمەت)لە دڵا نامێنێ. مَعاني حقیقي ایاتي قُران روحي حَیات ئەدات، ئەوەی بێ روح بێ معنای قُرآن نیە. نازانم بۆ کەس نەی گوتیە ئەو شخصە (سامرِیة) مَعَ أنەُ مُناسبەی لە (بَلْعَمْ) زێترە. (وَمِنْ أعجبِ مارأینا) بعضێ ئە لَین ئەو شخصە (نَبی)بووە، لام وایە لەبەر (آتَیْنَاهُ

آيَاتِنَا) وا ئەلّێن، قومێ رشوەتيان داێ دەستى لە دەعوەت هەلگرت، وەى دەست خۆشى! ئەبێ ئەوانە نبوەت و رسالەتيان لا چى بوبێ؟ مەلايێ وەك (اِبنُ جَرِير) بەسەر ئەو نَوعە قسانەدا ئەڕوا رَدّي ناكا، بۆ خوايەتى؟ عالِمْ بۆ ئەوەندە حەزى لە حكاياتى بێ معنا و چروكە؟ ﴿مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِى﴾ بەمەرام ئەگات.

﴿وَمَن يُضْلِلْ﴾ خوا گومراهى بكات ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٧٨﴾﴾ ئەوانە بە حەق ناگەن، كەس ناتوانێ هدايەتيان بدا. هەر ئەوانە خائب و خاسرن. ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا﴾ خلقمان كرديە. ﴿لِجَهَنَّمَ﴾ بۆ چونە ئاگرى جحيم. ﴿كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ﴾ ئەوانەى خۆيان بزر ئەكەن وەك گورگ ئەچنە پێستى مەڕ، بە طريقي زُهدو رياضيەت و خلوەكەشى، روحى عالەم ئەكێشن، بەسەر مال و حالّيان ئەكەن. ئەوانەى بە طريقي أُنس و أُلفەت و إختلاط و دۆستى ئەفلاك ئەدەنە بەر لاقى خەلّكى بە تەوقى سەرا ئەيخەن و ئاگايان لە خۆيان نيە، سياسيّونەكانى درۆزنى حيّال، دۆستى زوبانى، دوشمنى قَلْبن. لازمە أُمَّة زۆر پەرهێز بكەن لەو دوو طائِفەيە. ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ﴾ دلّيان هەيە، زۆر زانان، زۆر زانن. ﴿لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا﴾ بە عقلّى خۆيان باطِني شت نازانن، ناگەنە قولاّى، فكريان بۆ إستقبالْ نفوذ ناكا، تەماشاى مَصْلَحەتى خۆيان ئەكەن، راى حالّى حاضِرە، لەپاشدان أُمَّة چى بەسەردێ، با بيێ، وەك كوردى ئەلّێ: (كفن بە من ببڕێ مردى كوڕ بەكوڕ چێ). ﴿وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا﴾ دوور بين نين. ﴿وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ﴾ گوێ نادەنە تأريخ و سيرى أنام، أسبابي إنحطاط و إنقراضي أمَمي سالِفە، ئەوانيش لە وەقتى خۆيان توشى ئەو نَوعە دَسّاسانە بوون، عاقبەت هەردوولا خانە خراپ بوون. ألآنيش أكثري رؤساي ديني إسلام (مَعَ الآسف) سَعي ئەكەن بۆ تقويەى أسبابى إنحِطاطي موسلّمانان، چ جاى

إصلاح! ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ ئـەمڕۆ زگـی تێـر بـێ، لـە خیـاڵی سبەینێدا نیـە. ساڵی كلۆزەردەی عَرضی كلۆیانم ئەكرد ئێوە پێستی دارەكان مـەخۆن، بەبـەر و پەلك اِكتِفا بكەن، تـاكو سـاڵي أتـی بـۆ نەسلتان بـەر بداتـەوە، ئێـوە ئـەوا پێستیان ئەخۆن، دارەكان هیشك ئـەبن، أولادتـان پـەكیان ئەكـەوێ!!! خێـر بەكێ ئەڵێی؟ گوێ یان نە ئەدأمیَ! ﴿بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ﴾ لەوان تۆزێ وجدان هەیـە، لەمان هیچ! ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ١٧٩﴾ وَلَوْ بشزانێ عمل بۆ مسـتقبلی مِلّـتي خۆیان ناكەن، معاملەیان معاملەی غافلانە، ئەوانـە حـەز ناكـەن قَومیـان عاقـلْ بِبن تاكو بەهەوەسی خوَیان وەك كەر إستخدامیان بكەن.

(سبحان الله) أمّتیش كەیفی لەگەڵ ئەوانە دێت. طَبیعیّـون بـە قـوای مـادّي غلبەیان كرد، رؤساي أدیان ألآنیش خەریكی خەرافاتن، ئەگەر ئەوانە بۆ جهنم خلـق نـەكرابن بـۆ وان؟ ئـەو مشـاعیرو مـداركي خـودا دایتیـە (أفلاطـون) و (أرسطو)و (أدیسون) (أنیشتاین) دایتیە ئێمەش، فەرق بە چیە؟ بە إستِعمالە، بە (حِرَف)ە (لَما خُلِقَ لَـهُ) وەكـەس رێـی فكـر ونظَـر وسَـعي وعَمَلي لـە كـەس نەگرتووە. بە زَجْر و نُصح و جَزاو ضَربەی تأديبي وحَيـاو وقـار، رێـی سَـیِّئات، نَوْعاً ما سَدّو بەند كراوە. كەسێ تەركی چاكە بكاو روو لە خراپە بكـا، چ عُـذرو بەهانەی نیە وەكی (سَعدي) ئەفەرمووێ:—

(كَسانی كي بَدرا پسند دید أند
نَدانَمْ زونێكی چ بَدْ دیدە أنَد )

گەلێ جار لە وعظ عَرضي برادەران ئەكەم وەرن بە تَجرِبە دوو سـاڵان چـاك بِبن بە رێكی و نێكی و پێكی بۆ مَصالحي عامَّە تێ كۆشین، ئەگـەر تـەرەقیمان كردو حاڵمان خۆشـتر حَیـاتي إجتماعیمـان بـە لـەزەت –فَبِهاً ونِعْمـة– وَاِلاّ روو ئەكەینەوە خراپەی خۆمان، بە دوو ساڵ چاكی خراپیمان لە كیس ناچێ.

﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ ظـاهِري جَمعـي (مُعَـرَّف) بـە (ألـف ولام) عمومـە. حُسني أسماءْ بە حُسنی وَصفی مُسَمّایە، هەر ناوێ هـەر وەصـفێ زێـدە جـوان

بێ دوور بێ لە نقص، بۆ خوایە کمالی بێ نَقْص خاصّەی حضرتی کبریایە، باقی هەرچی بێ بێ نَقْص نی یە، هیچ نەبێ ممکنە محتاجە منفعلە لە وَسمەی أنوثت خالّی نی یە. ﴿فَٱدْعُوهُ بِهَا﴾ هەرئەوە بە أسمای حسنی یادکەن هاواری بکەنێ بانگی بکەن، غَیری ئەو، تَقدیسي کەسێ تر مەکەن. ﴿وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ﴾ ئەوانەی مَیلْ ئەکەن لە حەق هەم ناو بۆ خوا پەیدا ئەکەن، (لات) لە (الله) (عُزی) لە (عَزیز) وەرئەگرن ئەیانکەنە ناوی (أصنام) بەردی پتەو ناوی لێ ئەنێن (صَمَد)، ئەوها. نوعێ لە مُلْحِدان أجرامي خَسیسە ئەگەیەننە مقامی معبودی، نوعێکی تر هەیە خوای ئەهێننە مقامی أجرام و جسمیەت وە صِفاتي وەك صِفاتي أجسامي بۆ پەیدا ئەکەن. حتّا ئەڵێن خوا جَسَدي پتەو و بەقوەتە لە صورەتی انسانێ (أمْرَدە)، یا ریشی ماش و برنجە، أمّا ناو زگی نیە. ئەوانە مُنْسَلِخن لە ایاتی خوا، شایانی ألوهیەت و ربوبیەت چیە؟ نایزانن، یاخود خۆیان نەزان ئەکەن. لەوانە مصیبەت تر بۆ أهلی توحید ئەوانەن کە بەناوی (ولایەت) لە ایاتی خوا خۆیان مُنْسَلِخْ ئەکەن، بَعضي ئەکەنە شەریکی لە عِلمي مُحیط و قدرەتی شامِلە و کاملە أمر بە أمری (کُن فَکان). گەلێ عالمی زۆر زۆر مُتَبَحِّرْ غایَت داناو گەورە کە هاتە وادی (کَرامَتْ) لە هەموو آیات و أحکامی شَرعي و عَقلي مُنْسَلِخْ ئەبن -نَعُوذُ باللهِ- عالەمێ بە دوای قسەیان ئەکەون، کێ ئەتوانی رَدّیان لێ بدا؟ قِسمێ لەوانە مثال بۆ خوا پەیدا ئەکەن أشعاری پێ هەڵئەڵێن خط و خالّ و ئەگریجە، قەدو قامەت و لال و لەنجە، گۆیا ئەو ألفاظانە هەر یەك عِبارەتە لە صِفەتێ -ألعیاذُ باللهِ-.

خُلاصە ئەوەی تَتَبُّعي فِرَقي (أنام) بکا، ئەزانێ أنواعي ئەوانەی مُنْسَلِخن لە ایاتی خوا (الحاد) ئەکەن لە ناوی گەلّێ زۆرن، ئەی موسڵمانینە: ئێوە لەوانە گەڕێن دوایان مەکەون، وَلَوْ بەناو رَأیسي دین ومَذهَبْ بن. ﴿سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ۝١٨٠﴾ لە إنسِلاخ والحاد وثَمَراتیان. ئەو أمرە أمری تهدیدیە بۆ ئەوانە،

کەوابێ وەك (إبن جَرِیر) ئەفەرموێ (رەحمەتی لێ بێ) ئەو حُکمە مَنسوخ نیە، نَسخ ببێ بۆ أمری تکلیفی ئەبێ، مَقصَد لە دەعوەتی إلاهی بە (أسمای حُسْنی) هەر ژماردنی بەسەر زویان داهێنانیان نیە، مَقصَد کَمالي تَنْزیهە تقویەی إیمانە تمکّنی عَظَمەت و کبریائی خوایە لە دڵدا، نتیجە إطاعەت و إیمانی صَحیح و عَمَلي صالحە. هەموو (أسماء الله) لە قُرآن دانیە ئەڵێن قسمێکی لە (حَدیث) دا هەیە. أسمای خوا توقیفیە غیرە توقیفیە لە بەینی (سُنی) و (مُعْتَزِلي) خلافە، تفسیری قسانیان لە علمی (کلام) دایە. (إمامی رازی) (سیّدی ألوسی) (سید رشید) زۆر تفصیلیان داوەتێ خاصّةً (سید رشید) دادی داوە، انشاءالله ئێمەش لە مقامی أنسبْ نەختێ قسەی لێ ئەکەین، بەڵام لێرە ئەوەندە عرض ئەکەین ئەوانەی تأویلی پاك و خاوێن ئەکەن بۆ بعضێ کلمات کە لە قورآن وحَدیث دایە وەك (یَدْ) و (عَین) و (قَدَم) و(اِستواءْ) و (نُزول)، لە مُلحِدان نین، بەڵکو صفوەی (مُوَحّدین) ن. ئەتوانم بڵێم ئەوانە ئەو أُمّەتە ن کە خوا ئەفەرموێ: ﴿ وَمِمَّنۡ خَلَقۡنَآ أُمَّةٞ ﴾ گەرچی زۆرن أما نظر بە مُلحِدان و مَنسلِخان کە من. ﴿يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ ﴾ بێ مەیلی إفراط و تَفریط إهتدا بە حەق ئەکەن طالبي حەقن تەماشای حەق ئەکەن، بەتقلیدی عَمیاءْ دوایی ئەم و ئەو ناکەون، نە إصْعادْ بە مخلوق ئەکەن بۆ دەرەجەی خالق، نە تنزیل بە خالق ئەکەن بۆ دەرکی مخلوق، حەق ناکەنە تابعی فکری خۆیان، فکری خۆیان ئەکەنە تابعی حەق ﴿وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ١٨١﴾ ج أحکامی اعتقادی ج احکامی عملی، (یأتون کُلَّ ذي حَقٍّ حَقَّهُ) حتّا لە حەق خواش تفریط و إفراط ناکەن، (مالِلّە فَلِلّه) (ومالِغَیرِه فَلِغَیْرِه). أما بعضێ متکلمین حتا لە (أشاعرة) لە (مُعْتَزِلە) لە مقامي خِصام تأویلي دوور دوور ئەکەن، ئەوە نابێ لێ یان بگیرێ طعنیان لێ بدرێ، زێرا لە مقامی إثباتي إعتقاد بە دەلیلی قَطعي إبدای أدنی إحتمالی قطعیەتی دەلیل نایەڵێ دەلیلی مُستَدِلْ إبْطال ئەکات، أمّا ئەوانە ناتوانن بڵێن: (ئەوە مرادی إلاهیە)، حاشا ! بَعْضاً لەبەر بێ مەیلی (سَیّد رَشید)

طعن لەوانە ئەدات، (أمامن غَیْر حَدّ)ئەوە لە بێ دقّتیە ئاگای لە مسلەکیان نیە. ئەفەرمون ئەوانە خلق کراون بۆ (جَنَّةْ) مُقابِلن لەطــەلَ ئـەو گروهـەی کـە خلـق کرابون بۆ (جَهَنَّم)، أمّا خودایێ نیە نظمێ وەك نظمی ئەو نیە، ممکنە بگـوترێ (وَلَقدْ ذَرّأْنا للجَّنَة کَثیراً مـِن الجِنّ وَ الْأنـسِ لَهُمْ قُلوب یَعقِلون بِها وَلَهُم أعُـین یُبْصِرونَ بِها وَلَهُمْ آذان یَسمَعونَ بِها أولئِـكَ کـالْأملاك بَـل هُـمْ اهـدي اولئـكَ هُـمُ المُنتَبِهوُن). أمّا غایە لە عَقل و دیتن و بیستن، هیدایەت و عدالەتی بالْحَقّه.

ئەو ذەواتـی کرامـە ئـەو هدایەتـە بـە پاداشـی سـعی و کۆششـی عاقلانـەی خۆیان ئەزانن، یاخود (جَنَّةْ) بـۆ وانـە نایەتـە تـەرازو، جـزای چاکەی ئەوانـە، نایەتە سەر زوبان! ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ أساساً بڕوایـان پـێ نەکـەن یـا لێ یـان مُنْسَـلِخْ بـن، إلحـاد لـە أسمـای خـوا بکـەن. ﴿سَنَسۡتَدۡرِجُهُم﴾ ئـەیان پێچینەوە وردە وردە وەکی طومار، یا پایە پایە بلّندیان ئەکەین مغـرور ئـەبن، منهمك ▪ مەستی مودامی نیلی آمال، دوایێ بەسەر طـەپڵـی سـەریان دا بـەریان ئەدەینەوە.

﴿مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ١٨٢﴾ چ ئاگایان لە خۆیان نابێ، غافل بێ خەبەر بێ عِلـم و إدراك ﴿وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ﴾ إمـدادیان ئـەدەین جلـەویان بـۆ درێـژ ئەکـەین تأخیریان ئەکەین لە خۆیان أمین ئەبن ﴿إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ١٨٣﴾ تـدبیری ئێمـە زۆر بە قوەتە فوقی تدبیرو سیاسەتی وانە، لە دقەت و خفای دایـە، تـاخفی تـر بێ بە قوەت ترە. قومێ سیاسـەتیان ئاچـۆغ بـێ زوو بـەدەر ئەکـەوێ بۆفیـان ئاشکرا ئەبێ هەڵلا هەڵلایان بۆ لێ ئەدەن.

﴿أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍۚ﴾ ئـەو گرۆهـە مُسْتَدْرَج و معلـی لهم ئـەوا گـیران فلیـان خـوارد بـە پـەتی خۆیـان خنکـان، ئـەوجا دەربـارەی وان ئەفەرموێ: ئایا تفکریان نـەکرد؟ تـێ نـەفکرین؟ تـاکو بـزانن صـاحبی وان کـە پێغەمبەری خۆیانە لە (نوح) تا (خاتم) هـیچ شـێتی نیـە جنۆکـەی لەسـەر نیـە

أخباری صاحبی خۆیان بە هیلاك و تبدیلی نظمي کائنات و حَشر و نَشر، حَمل ئەکرد، سەر شێتی مَعَ أنهُ رَفیقیانە ئەیان ناسی ئەیان زانی، ئەو زاتە، سەر دەفتەری عُقَلایە.

﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾﴾ غایەتی لەبەر غروری خۆیان گوێیان نە ئەداتە (اِنذاري) انذاري تَعلیم و اِرشادە لەگەڵ تَخویف و ترساندن، نە جنونە!! بۆ خۆت مایەیێ بێنە دەست عُمری خۆت بەهەدەر مەدە! وە اِلاّ وات بەسەر دێ رەزیل ئەبی سفیل ئەبی. مەلای بابم کە تازە چوبومە قوتابخانە بە شێوەی کوردی خۆی پەندی پێ ئەدام ئەیترساندم ئەز جُملە:

عزیــزم رۆژو شــەو بــۆ خــۆت بخوێنــە
لــە نێــو گێــژاوی جهلــێ دا مەمێنــە
مـەلا زادەی نەخوێنـدی مثلـي صـەگ سـار
دەبـێ هـەر هەڵپـەرێ یـا وەك صـەگی هـار
قلــو قاچــی موســڵمانان دەرێــنێ
لــە سُــفرەی ظالمــان نــانێ رفــێنێ
مەکـەن مـەیلی جـگ و هێلکـە شـکانە
مەبــە مەشــغولی گوزینــە و رگانــە

بە تایبەتی (خاتَمُ الرّسُل) لە هەموو کەس دوور تر بوو لە (جِنَّةْ). بەڵێ لە هەنگاوی (وحی) حاڵەتێکی روحی بەسەردا دەهات وەك (خوداران) ی لێ ئەهات، ئێستاش بعضێ لە حُکَمای أورووپای گۆیا لە أهلی فکرو نَظَرن ئەڵێن: (جەنابی رسالەت پەناە بە نَوْبات صرعی بووە) أمّا أهلی إنصافیان ئەڵێن: (حاشا هۆش و گۆش و فکرو ترتیب و وَضْع وتَشریع واِرْشاد و دەلالەتی (محمد) لەگەڵ (جِنَّة) و (مَصروعي) بوجهٍ مِنَ الوجوه مناسبەی نیە. بەڵێ خوا لە نظري (مسیحی) و (یهودی) زۆر سوکە! بێ هەیبەت و حَشمەتە، دائم لەگەڵ (موسی)و (هارون)و (مریَم)ی خوشکی و پرو پیریژنی إسرائیلی، هەستایە و

دانیشتیە!!! خۆی کردیتە ذرّەیْ مُحقّر چویتە ناو زگی (مریمَ)ە خاتوونی کیژی (عمران)ی، بویتە (عیسی)، پاش چەندێ لە طَرَف (جوان) إعدام و صَلب کرایە!!!

ئەگەر کەسێ جَلال و عَظَمَت و کبریای خوای بەسەردا إستلا بکا، لەبەر سَطوەت و هَیبەتی (وَحي) إلاهي محو و نابودی وە لە خۆ چونی بەسەردابێ، ئەلێن ئەوە مجنونە!!! ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُواْ ﴾ تەماشای قلبی، تفکّریان نەکردیە. ﴿فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ مُلكي عَظيم فَسيح فَضايٍّ واسِع إلى ماشاءالله پڕ لە شمس و أقمار و سَیّارات مَواد و مَعدنیاتی قیمەت دار، حَتّا پاش تِلاوەتی آیاتی قرآنی، شَرح وایضاحي آیاتی أکوانیات بۆ ئەکات، تاکو بزانن ئەو عالەمە بدیعە مبدِعێکی بێ مِثَ و مِثالي هەیە ﴿وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ ﴾ لەبەر چاوی وان، ئەبینن گیاو گوڵ و دار و بار حیوانات و أولادی خۆیان لە ذرّەیێ ئەبنە چی؟ ئەوانە کێ خَلقیان ئەکا؟ چۆن ئەو تطَوّراتەیان بەسەر دادێ؟ ئەگەر لە دقایقی نەگەن، خۆ لە ظاهیري ئەگەن. ﴿مِن شَيْءٍ ﴾ لە هیچی نافکرن، بە هیچ نَوعێ، لە تَفَکُّر و نَظَرو إعتِبار. ئەوا نَظَریان کورت بو نەگەیشتە عُلویاتْ نُفوذي لە أرض نەکرد بزانن چی تیایە، ئەدی ئەوەی لەبەر (حِسْ) بو بۆ تەماشایان نەکرد؟ لەوە صَرفي نَظَر ﴿وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ﴾ جارێ نەهاتە خیالّیا ئەمرن. لە أیّامی شباب قەیدی ناکا، لە أیّامی پیری بۆ تەماشا ناکەن؟ کە نێزیکە أجَلیان، خاتمەی عمریان نێزیك ئەبێ. بۆ لە سَیّئات کەم ناکەن؟ کە کەوتنە عالەمی غَیب کێ بە فریادیان دێ؟ هَیاکلەکان لەگەلْ لاشەیان لە پاش بەجێ ئەمێنێ تەماشای ناکەن تا بزانن ئەو حَیات و مَوتە بەدەست کێ یە؟ کێ ئەیکات؟ ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ ﴾ پاش ئەو مَذکوراتە ﴿يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾ تەماشای دوور نەکەن، لە مَلَکوتی سَماوات وأرض، تەماشای شتی نێزیك نەکەن لە مُحْدَثاتي مُکَرَّر، تەماشای أحوالّی نَفسی خۆیان نەکەن، ئەدی تەماشای چی

دەکەن؟ بە تەماشاکردنی چی پاش ئەوانە (یُؤْمِنُونَ)ە؟ ئەیانەویٚ مَلائکەتیان بۆبیٚ؟ خوا ببینن؟ ﴿مَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥۚ﴾ حَتّا عَلى فَرْضِ المُحال مُقتَرَحاتیشیان بۆ بیٚ، إیمان ناهیٚنن.

یاخود إلاهەکانیان هدایەتیان نادەن! ئەوانەی تَکَبُّرو عِناد و مەیلی فَسادو حَسَدو عداوەت قوەتی لیٚ ستاندینە، بە کەس هِدایەت نادرێن، خواش هِدایەتیان نادا، وَلَوْ نَظَر بە کمالی قدرەتی ئەو مُمْکِن بیٚ لە دائرەی إمکانی زاتی نەچوبیٚتە دەر. چ جایی هِدایەتیان بدا ﴿وَيَذَرُهُمۡ﴾ (عَلي سَبيلِ الأسِتِدراج) ﴿فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ﴾ خوا لیٚ یان ئەگەڕیٚ، لەناو طُغیانی کُفرو ضَلال دا ﴿يَعۡمَهُونَ ١٨٦﴾ تَرَدُّد ئەکەن دیٚن و دەچن لە کُفردا مُصارَعە ئەکەن، بەدڵ کوێری گیٚرە لەناو کفر ئەکەن ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ﴾ کُفّاري قُریش ﴿عَنِ ٱلسَّاعَةِ﴾ قیامەت، لە وجهی عنادو تَکْذیب وەك لە (إبنُ کَثیر) نقل کراوە رەحمەتی لیٚ بیٚ. ﴿أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَاۖ﴾ کەی ئەبیٚ قرار ئەگریٚ؟ تۆ ئیٚمە بە قیامەت ئەترسیٚنی. دەخەبەرمان بدەیە بە زەمانی وُقوعی! یا ئەو رۆژە کە خەڵك ئەمرن ئەو کەشتی حیاتی مُتَجَدِّدو مُضطَرِبْ غَیرە مُنْتظَمْ کەی ساکِن ئەبیٚ لەنگەر ئەهاویٚ؟ ﴿قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّيۖ﴾ غَیری ئەو کەس نایزانیٚ وە بەکەسیشی نەگوتیە ﴿لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ﴾ ئاشکرای ناکا. لەوەقتی خۆی کَشفی حِجاب لەسەر وەقتی بونی ناکا أحَدي ﴿إِلَّا هُوَۚ﴾ إلاّ خۆی نەبیٚ. ئەویش بە وقوع إظهاري ئەکا نە بە إخبار.

﴿ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ قیامەت لەسەر أهلی سماوات وأرض ئەوانەی إیمانیان پیٚی هەیە گرانە، چونکی نازانیٚ کەی ئەبیٚ. وەك لە (سَدّيِ) نَقل ئەکەن شتیٚ نەیزانی گرانە. وەمشهورە (کُلُّ شَيءٍ بَعدَ العلم سَهل) سُبحانَ الله عِلم نەبوون بە وەقتی قیامی قیامەت لەسەر مەلایانی (ثَقّال) زۆر گرانە، زۆر

تێکۆشیون مَعلومی بکەن. حتّا مەلایێ وەك (سیوطي) چەند روایەتێ خر کردۆتەوە دائر بە عُمری دونیا بە حسابی وی ئێش لە ئێش ترازاوە (مَهدي) و (دَجّال) هاتیین (عیسی) نزولی کردیە، خلاصەی تَعبیری ئەو الآن کە تأریخی (١٣٥٥) هجریە لە عَرَصات داین. حاصلي (ملیّون) و (غَیرە ملیّون) لە مُدّەی بَقاي دونیا أقوالي مُختَلفەیان هەیە. هیچی دەلیلی نیە گومان و وَهمە. حَتّا طَبیعیّوني عَصر بەگوێرەی عَلائِم و أماراتي مُختَلفەی خۆیان مُدّەێ دادەنێن بۆ بَقاي دونیا أمّا مُدّەێ گەلێ دوورە لە (٧٠,٠٠٠) حەفتا هەزار سالێ تا حەفتا ملیۆن سالێ درێژەی پێ ئەدەن. تُرَّهاتە ! ! !

﴿لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗۗ﴾ کەسێ پێتان نالێ دێ، بەلێ دێ، أمّا هەر بەناکاو دێ خەبەرتان نابێ، هەرچەندە حُکماء مُتَّفِقن لەسەر نفادی قوای جِسماني. کُلّي آنْ هەر خوا ئەزانێ چەند قوەت صَرف ئەبێ، وە قوەتی ئەو عالەمە عَظیمە بە چەند سالێ وای لێ دێ تَجاذُب و تَدافُع کەم ببێ و (کُرات) لەگەلێ یەك مُصادمە بکەن؟ وە ئەو ما بەینە بە کێ تَعین ئەکرێ؟ (مَنظومەی شَمس) بۆ لای (مِجَرّة) ئەڕوا پاش حەفتا ملیۆن سالێ ئەکەوێتە ظُلُمات ئەو مَوْقعەی نوری لە هیچ لایێ ناگاتێ ئەوسا أرض ئەکەوێتەوە حالّی جَلیدی، بە چی ئەزانن؟ ئەو حَرکەیە– علی تَقدیر التَّسلیم– بەو نَوعە دەوام ئەکا؟ لا یَتَغَیّر بێ مُصادِمُ و مُعارِضْ؟ لەسەر ئەو نَهجە ئەمێنێ؟ بە شدّەتی حَرکەی (أثیر)؟ باوجودی هەموو حُکمای عَصر قَول بە (أثیر) ناکەن.

أجزای کامِنە یەك ئەگرن بە هەشتا هەزار سالێ (کُرەی) ظاهر ئەبێ وَهکذا قوەتی حرکەی کەم ئەبێ (کُرات) لە بار یەك دێنە دەر لە ناو (أثیر) گوم ئەبن وەجارێ تر ئەو أجزایە خۆی ناگرێتەوە هیچ (کُراتي) تیا ظهور ناکا، دەلیلیان لەسەر ئەو قسانە چیە کە فیلسوفێ وەك (جمیل صدقی زهاوی) إعتقاد بەو قسانە بکا وە بلێ (أثیر) خوایە– منە المَبْدَأُ والیە الرجوعە–؟ (سبحان الله) لە فَلاسِفەی شَرق! ! چەند خۆش باوڕن! بۆ إنکاری خوای بەڕاستی مُهَیّان! ! !

أصلی قول بە (أثیر) فرضیە نَشأتي لەسەر واسِطەی إتّصالە، ئەوانەی ئەڵێن (نور) لە كَوكَبێ بۆ كَوكَبێ بێ واسطەی إتّصال دێ، قَول بە (أثیر) ناكەن. ئەوەی قَولی پێ ئەكا بۆ إستخدامی قوەتی پێ ئەكا نە بۆ الوهیەت و ربوبیەت. قورِ بەسەر شَرق وفَلاسفەی شَرق تا أَبَدَ الدَّهر مُقَلّدن دوای قسەی ئەم وئەو بێ مُحاكمە ئەكەون قبوڵی ئەكەن، ئەیكەن بە (شِعر) فَخرو مُباهاتی پێ ئەكەن، گۆیا مُبْتَكِرن– إناللّه وَإنّاإلیهِ راجعون– ﴿يَسْـَٔلُونَكَ﴾ سؤالت لێ ئەكەن. ئەو سائِلانە وات لێ إسْتِفسار ئەكەن ﴿كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا﴾ عالِمي بە وەقتی. یا كەیفت پێ دێ، تا ئەوانە لە عَذاب دا ببینی، ئۆخەو شفای صَدرت پێ دێ دڵت دادەكەوێ، حاشا! پێغەمبەر (ﷺ) بۆیە ئەیان ترسێنێ، تا خۆی لێ بپارێزن، توشی عذاب نەبن. ﴿قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ ئەم عبارەتە صریحە لە حصر بڵێ من نایزانم، ئەو علمە خاصّی خوایە، بەس لای ئەوە، لای كەسی تر نیە ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ﴾ حتّا عُلَمای زۆر گەورە ﴿لَا يَعْلَمُونَ ١٨٧﴾ چۆن ئەبێ پێغەمبەر ئەوە نەزانێ؟ ئێمە نەیزانین؟ نە مُمكِنە. لەبەر كَثرەتي عِلم توشی نەزانین بوین، ئایا لازمە رَسول هەموو شت بزانێ؟ علمی مُحیط بێ؟ حاشا! ئەوە خاصّي خوایە! نەزانین بۆ خوای مُحالە! (وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً) لە آدەم تا ئەمڕۆ علمي بَشَر إیحاطي أرضي نەداوە، فَكَيفَ بالعالَمْ؟ غروریش بە علم نَوعە إنسِلاخێكە لە آیاتی خوا. چەند شت لەو عَصرە دا كَشف كرا، علمایانی رابردو بە خَیاڵیشیان دا نەدەهات، ئەگەر تصَوّریان كردبا، بە مَحاڵیان ئەزانی. بۆ رِوایاتی واهیەی إسرائیلی، صَرفی نَظَر لە ایاتی قُرآن إنْسِلاخ نیە؟ ئەدی چیە؟ بەسیە (مەلاینە)بەسیە دوای خَیالات وأوهام مەكەون خۆتان كەمێ نَظَر و فِكر كەن، تاكەی تقلید؟ تاكەی ئەو إعتِقادە مَحْكمە لە حەق (نَقّالان)؟ تەماشای كُتُبی (نَقّادان) كەن! حەز ئەكەن بە تەواوی وهن ی أخباری دائِر بە (مَهدی) و (دَجّال) و عُمري دونیا بزانن تەماشای تَفسیری (سَیّد

رَشید) کەن (رَحمةُ اللهِ علیهِ) حقیقةً یَدی بَیْضاي نواندوە، بە نوکی قَلَم حِبالُ و عِصیّی أوهام و خَیالاتی حِکایات خوانانی بطال کردیە.

﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا﴾ ئەمرۆ من بیٚ هێزو دەسەلاٚتم، ئێوە زۆر و بە زۆرن، گەمەم پیٚ ئەکەن؟ بەو نَوعە سۆالە؟ هەرچی ئەیکەن بیکەن، مالکی فَیْض و زەرەر نیم، بۆ خۆم بە خۆم بکەینم یا بە خەلك. ﴿إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ﴾ لەو وەقتە (بِحوْلِهِ وَ قُوّتِهِ) ئەبم بە صاحبی نَفع و خَیر، ئەوسا من ئەبینن نَفعم چیە؟

زەرەم چیە؟ لام وایە مَقام وای ئەویٚ، باسی عِزّي زاتی مخلوق نیە، چ إنقطاعي الی اللّه نیە، حکایَتی تَصرّفاتی أولیاءْ (مالكُ النّفعِ والضّرِ) ئەوان داخلی حساب ناکریٚ. گەرچی ئەمرۆ مَعَ الأَسَف لای سَوادي أعْظَم لە أُمَّةْ نافِع و ضار هەر ئەوانن، خوای تعالان، أنّهُ نَفرْ بەرێکە بۆ إجراي أوامِریان.

﴿وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ﴾ کەی ئەمرم؟ کەی قیامەت رائەبیٚ؟ لە مُستَقْبَلاً چیم بەسەردیٚ؟ . وەکو هەنجەتم پیٚ ئەگرن، ئەگەر رَسول با، ئەبا عالِمُ الْغیْب بیٚ! ئەگەر غیبم زانیبا، ﴿لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ﴾ خێرو چاکەم زۆر ئەکرد. ﴿وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ﴾ چی خراپم پیٚ نەدەکەوت. چونکی ئەمزانی حَلَقاتی مُقَدَّرات چۆنە، چۆن رَبط ئەخۆن؟ چۆن لە بال یەك دێنە دەر؟ دیارە عِلم بە غَیب موجِبی خۆپاراستنە لە شتی بەدو ناخۆش وەك لە (حُدَیْبیّە) فەرموی: (ئەگەر بمزانیبا وام دێتە پێش هَدْیەم سَوق نەدەکرد بۆ لای بَیْت). سُبحان الله العظیم ئەوانەی إدّعای علمی غَیب ئەکەن گۆیا سِرّي قَدَریان لا مَکْشوفە (لَوْحَ الَمحضوظ)یان دائماً لەبەر نَظَرە، بۆ أُمّة ئیشیٚ چاکیان نەکرد کە ئەمرۆ بۆ أُمّة و مِلَت و قوم و مەفتەن بەکار بیٚ! سِرّي قَدَریان بۆ ئاشکرا بوو چی ئەکەن؟ گوناهی پرو پوچ، سَیّئاتیان لا إیمانە. ئەگەر لەبەر قُرآن نەبا بَعضە حکایاتی ناشیرینیانم بۆ ئەکردن، بەلاٚم ئەو حکایەتە عرض ئەکریٚ:—

(ولی) یێ كه سرِّي قَدَري بۆ هەڵماڵدرابو، ئێوارەیێ لە ماڵێ میوان ئەبێ، ماڵەكە لە كەناری بَحر ئەبێ، پاش نان خواردن و نوێژی عیشا ولی مُحْتَرَم بۆی كَشف ئەبێ كە لەگەڵ ژنی خانە خوێی (جمع) ببێ- بەڵێ قَدَرْ وایە واجِبُ إلأِطاعەیە- شەو بەلای ژنەكەوە ئەچێ مێردەكەی لەخەوا ئەبێ ژنەكە وائەزانێ ئەو زاتە مێردەكەیەتی بۆی رام ئەبێ كاری خۆی ئەكا، سبەینێ ئافرەتەكە لەسەر ئاو دێتەوە پرچ و مرچی تەڕ ئەبێ، مێردەكەی سؤالي لێ ئەكا ئەڵێ ئەدی كاریێ وامان نەكرد؟ ئەڵێ نا وَاللّە مُحَقَّق ئەوە ئیشی میوانەكە بووە، دوای ئەكەویێ، ئەبینێ ئەوا بەسەر بَحْرا ئەڕوا، كابرا هاوار ئەكا ئەوە چی؟ ئەمە چی؟ (وَلي) ئەڵێ: ((هذا بقَضاءِ اللّە)) وە ((هذا بِقَدَرِ اللّە)). تەماشای كَشفیان كەن و گوناهیان چونكی لەسەر كَشفی قَدرە پێی مؤاخَذە نابن، تأثیري سؤیان تێ ناكا، بەڵكو زێدە مأجور ئەبن.

خۆیان سؤال ئەكەن هەموو موسڵمان ئەزانن ئەوەی ببێ بە قضاو قَدَری خوایە، بۆ گوناه تأثیریان تێ ئەكات و پێ مؤاخذە ئەبن؟ جواب ئەدەنەوە، چونكی ئەو إیمانە لە دَلیل و نَظَرو بُرهانە، لە كَشف و عَیان نیە، بەڵێ عِلمی كَشف خۆیەتی! عِلمی نَظَري چ نیە! ئەوە خۆیەتی!!! وە موسڵمانان بە تەواوی ملیان بۆ رائەكێشن بەو جۆرە كَشفیاتە راضین- نَعوذُ باللّە مِنَ الخُذْلانِ وَالعار- كَشّافُ الغیوبەكان أرضی (سمسمە) كشف ئەكەن، أرضێ وەكی أرضی ئێمە لە ناو قەپێلكە كونجی دا دەبینین، خَریطەی (جابُلقا) و (جابرسا) مان بۆ ئەكێشن. طَبیعیّونە كان بێ إدِّعای عِلمي غَیب وكَشفی سرِّي قَدَرْ (طَیّارە) دروست ئەكەن (رادیۆ) بەدەرئەخەن، (قطعەی) (أمَریكا) بەدەر ئەخەن، بە أشِعّەی (رونتكین) دەرونی إنسان تەماشا ئەكەن أمراضي دەرونی پێ دەرئەخەن، بە (كهرباء) شەو ئەكەنە رۆژ. هەزار إختِراعاتي وائەكەن بە خەیاڵی باوك و دایكی (كَشّاف الغیوب)ەكانی ئێمەدا نەهاتوە. ئەگەر كَشفیان راست با ئەبایە شتێ وا دروست كەن كەڵكی أمّة بگرێ عِزّي دین و دونیاي پێ محفوظ بێ. خۆزیا یەكێ لەوانە كە ئەوەی لە (لوح المحفوظ)دا نوسراوە

ئەیخوێنێتەوە، تەماشای لوحەی (گرامەفون)ی کردبا ئەو حروفاتی بە نوکی دەرزیلە —علی وجه الطّبیعه— تیای نوسراوە چۆنی ئەخوێنیتەوە؟ بەڵێ شتێ کە لە پەردەی (غَیْب) دابێ هەزار هەزار درۆو دەلەسە هەڵئەگرێ! ئیتر ئەوەندە بەسیە بۆ جَهالَتي أُمَّة!!!

بۆچی تەماشای قرآن، مَلَکوتي أرض و ئاسمان، مُهِمّاتي أکوان، آثاري طبیعەت و علمای طبیعەت ناکەن؟ لە عالەمی شَهادەت مَحروم بون، نەگەیشتن بە عالەمی غَیب دوای خَیالات کەوتن، تاکو لە پوررو کەوتن. تا ئەوان لە مساحەی أرضي سمسمی بونەوە، أجانب لە سایەی علمی طبیعەت و کیمیاو هَنْدَسە إستلایان کرد، ئەم أرضە واسعە لە ئێمە بووە قەپێلکە کونجی.

﴿إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ١٨٨﴾ وَظیفەی من موژدەدانە بە أهلی إیمان و إحسان، ترساندنە لە عَذاب و عقابی إلاهی بۆ أهلی کُفر و عِصیان. ئەوەی مؤْمِن بێ یا قابلی إیمان بێ لە دەعوەتی رَسول إستفادە ئەکا، ئەوەی عَنود بێ إستفادە ناکات. بەڵکو زێدە ... ئەچێ لە کفر و ضلال. ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾ مەیل و مَشرەبی سَوادی أعْظَم لە بَشَرْ لەسەر کُفرو شرکە، مُوَحّدي بەڕاستی غایَت کەمە. خوا ئەو خوایەیە ئێوەی إیجاد کردیە لەیەك نفس کە مَنْشأی نَوعی بَشَریە ﴿وَجَعَلَ مِنْهَا﴾ لەو نفسە واحدە. ﴿زَوْجَهَا﴾ جفتي حَقیقەت و ماهیەی نَوعیّە یان یەکە، تمائزیان بە بعضە مُشخّصاتی خارجیە. ﴿لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا﴾ کی هەیان بۆ کی هەیان؟ نَفسی واحِدة بۆ لای زَوج یا زَوج بۆ لای نفسی واحدە؟ إختلاف عُلمای طبیعەت هەیە، أصلی مَصدری إنسان نێر بووە یا مێ؟ عبارەتی قرآن بۆ هەردوو لا ئەگونجێ، وە هەر کامیان أصل بن بۆ مَقصدی ئێمە یەکە. ﴿فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا﴾ نێر بەسەر مێ داهات دای پۆشی.

سُبحان الله لە أدَب و نزاهەتی قُرآن ئەو حالە چۆن دادەپۆشێ!!!

﴿حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا﴾ حِسّي گرانى نەدەكرد. ﴿فَمَرَّتْ بِهِۦ﴾ مرورى پێ كرد صَبره صَبره بۆ زەمانى وِلادەت چو. ﴿فَلَمَّآ أَثْقَلَت﴾ گران بوو. ﴿دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا﴾ لە خواى خۆيان خواست مێردو ژن ﴿لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا﴾ (إلاهَنا ربَّنا) ئەگەر پێمان بدەى ﴿صَٰلِحًا﴾ وَلَدێ باش تام الخلق ﴿لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾﴾ بە تَحقيق و تَأكيد لە زومرەى شاكران ئەبين، شكرانەى تۆ ئەكەين ئەو نِعْمَتە هەر لە تۆ ئەزانين. ﴿فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا﴾ بە گوێرەى مُعتَقديان. هەر جوتە هەر ژن و مێردى شَريكێ پەيدا ئەكا. عبارەتى قرآن موجزو مُجْمَله، لەگەلێ جێ سَبَبْ بە إيجازى، زۆر كەس لە ناظران، بە غَلَط ئەچن. لێرە چونكى تفريعى (فَلَماّ تَغَصّيا)ى لە جملەى سابقەى كرديە ئەڵێن ئەو (زَوْجَين)ە آدەم و حوا. بَعضە حكاياتيان هەڵبەستوە ئەوەى حقوقى أب و أم البَشَري لا هەبێ قبولى ناكا. (أدەم) صَفِيُّ اللّه عالِمْ بە أسماءپاش عَداوەتى إبليس چۆن بە قسەى هەڵدە خەڵەتێ بەو نوعەى ببێتە مُشرِكْ؟ ﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٩٠﴾﴾ (ابنُ جَرير) شِركي (أدەم و حَوّا) ئەكاتە شركى فى الأسم ئەڵێ ئەم جُملەيە عائدي مُشرِكيني عەرەبە، ئەمەش خۆت ئەيزانى بێ معنايە! بنا بە مختارى ئێمە (ضَميري جَمْع) لەبەر كَثْرەتي ئەو نوعە (أزواجە) يە، بۆيە نافەرموێ (عَماّ يُشْركانِ) نەبادا تَوَهُّمْ بچێ بۆ تَخْصيص بە دوو مێردو ژن، ديارە ئەوە لەگەلْ أدەم و حوّاى نيە. لازمە بۆ تحقيقى آيَتْ تەماشاى رەوشتى بَشَر بكرێ، نە پێش زەمانى سَعادەت و زەمانى سَعادەت، بەڵكو پاش تَقَرُّري دينى إسلام اِلي اليَوم ئەو حالە لە ناو بَشَر دەوام ئەكا. بە عمومى لە وولاتى ئێمە چەند (چاك) و (پير) هەن: (أومەرمەندان) (خالْ خالان) (مامۆستا كەرەم) (چاكى زايەرى) (مەلا مرادى) چنارۆكى خۆمان كە ألآن تَفسير و شَرحى ئەو آيَتە لە (چنارۆك) ئەنوسرێ (حاجى رسول)، ژنان بۆ ئاوس بون ئەچنە سەريان زيارەتيان ئەكەن گيسك و جەرگوناو درك و سەرو پێچكيان بۆ ئەكەنە خێر، بۆ

(حاجی رسول) شرطە ژنەکە لە دوور دابەزێ بە بێ دەر پێی روو لە مرقد کا بە غار بچێ بڵێ: (حاجی رَسول لە گورِ هاتم بۆ کورِ هاتم). بَعضەکیان ئەبێ ژنەکە حەوت جار بەم لاو بەو لای قەبرەکە بە لینگی رووت بازدا، هەی کاکی خۆم لەناو قەبرەکە صفا ئەکەی! ئەوجا ئەگەر ئاوس بوو کوڕی بوو ئەڵێ: ئەو زاتە پێی کرم کردیمە، ئەگەر زێدە موسڵمان بێ ئەڵێ: خوا بە تکای ئەو زاتە مبارەکە پێ بەخشیون. أكثَري ئەوانەی بە بێ چوونە (حَجْ) پێ یان ئەڵێن (حاجی) مَحصولي هِمَّت و بەرەکەتی (حاجی رَسولن).

وە سائری مملکەتی دیش بەو (مِنواله) چەند مَراقِدیان هەیە بۆ ئەو نیازە ئەچنە سەیان، حتا لە لای دۆڵی (صحابان) قەبرێ هەیە قەبری (کەری پیرێژنی) دەڵێن مَخصوصی وولاغ ئاوس کردنە ئەوەی وولاغی نەزێ ئەچێ گیسکێکی ئەکاتە خێر گۆچانێ یا بەرچیغێ لە دەورەی قەبری ئەچەقێنێ بە نیازی وولاغ زان. ئیتر ئێمە چیمانە بەسەر حَضرەتي آدەم؟ ئەگەر توشی ئەم شرکە بوبێ چ جێی طَعنە لە أولادی، خصوصی جُهَلاء؟ تَعَجُّب لە (سَیِّدي آلوسي) ئەکەم ئەو قسەی چۆن قبوڵ کردیە گۆیا (اِذا صَحَّ ما فِي حَدیثِ فَهُوَ مَذْهَبي). (سَیِّد رَشید) رەحمەتی خوای لێ بێ ئەڵێ: (هیچ حَدیثي صحیح لەو بابەدا نیە، أساساً لە إسرائیلیان وەرگیراوە)، حاصلی عُلَمایِ تحقیق وەك (فخرالدین الرازی)و أشباهی ئەو روایەتیان قبوڵ نەکردووە – خودای تَعالان ئەو نَوعە أولادە باشانە بۆ أدەم زۆر بکا –. ئایا ئەو نَقّالانە ئەزانن ئەو حکایەتە پاش أخذي ذُرِّیَّتْ بوە لە ظَهْري آدەم؟ یا دوایێ؟ ئایا ئەوەندە وثوقەیان بە (آدەم و حوّا) نیە پاش ما جرايِ أكلي شجرە بە قسەی (إبلیس) هەڵنەخەڵەتێن؟ نێزیکە بڵێم ئەو نقالانە بە وسوسەی إبلیس هەڵخەڵەتاون – خوا دوورمان کا لە تَبْلیسی إبلیس–. إعتقادی أنام دەرحەق بە شێخ و أولیای مردی و زیندی زۆر بە قوەتە. (علی افندی) هەولێری لە (سِراجُ السالکین) ئەڵێ: (شێخ حسام الدین رۆژی بە دەروێش حَسَنی ووت ژنەکەت ئاوسە حَملەکەی کچە ئەوا ذَکَرێکمان پێوە چەسپاند، یعنی کردمانە کورِ). سُبحان

اللّه ئەوە فوق الشّرکة!!!

خوا كچی خلق كردبوو شێخ كردی بە كوڕ!!! پیاوێ وا ئەو نَوعە قسە بكا ئەبێ خەڵكی تر چ بڵێ؟ ئەو شرکە علاج ناكرێ! دەنگی دین و إعتقادیاتی أهلی سُنَّة و جماعتی وەرگرتیە، (كرامة الأولياء حَقٌّ) ئەدی!!! خلاصە ئەو طُرُقانە رێی كُفر و شركيان بۆ موسڵمانان گوشاد كرد بە تەرزێ كە بە رێی وَحْدانیەت و إیمانی ئەزانن.

بابم رەحمەتی خوای لێ بێ فەرموی: (كە چوین بۆ غەزای (قارص و بایزید) ساڵی (١٢٩٤) هجری رێمان بەناو (پسمامان) كەوت (سَیِّد عبدالكریمي سۆزی) لە (بتْبۆ) لە هۆبە ماڵێ پیاوێ منداڵێكی هێنا لای شێخ دوعای بەسەرا بخوێنێ، شێخ دوعای بۆ كرد ووتی خوا عمری درێژ كا، ووتی بابۆ وا مەبێژە! خودێ دوو كوڕی دامێ بردیەوە، ئەو كوڕە شێخ یَعْني (عبیداللەی نَهری) پێی كرم كردم، دوعای بكە شێخ عُمری درێژ بكا!!) حكایەت زۆرە خُلاصَةُ الكلام ئەو شرك و كُفری ئەمڕۆ لەناو موسڵمانان دا هەیە، حاشا لەناو مُشركیني عەرەب نەبوە!– تَعالى اللّه عَماّ يُشْرِكون–. نازانم تَدَخُّلي (مَلَكْ) لە تصویری بشر لە چ وادیێكە؟ ﴿أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا﴾ حتّا پێشكەیێ مێشێ. ﴿وَهُمْ يُخْلَقُونَ ١٩١﴾ خۆیان مَخلوقن وەك ئەو حَملانە. كەسێ خۆی بە عَینی طَریق بە وَلَدْ بێ، چۆن ئەگاتە مَرتَبەیێ وَلَدْ عَطا بكا؟ هایهو، دوورە، نابێ. ﴿وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ﴾ بۆ عبادەكانیان. ﴿نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ١٩٢﴾ بێ دەسەلات، بێ حِسّ و حركە، چیان پێ ناكرێ. ﴿وَإِن تَدْعُوهُمْ﴾ أيُّها البَشيرُ النَّذير! ﴿إِلَى ٱلْهُدَىٰ﴾ بۆ رێی راست. ﴿لَا يَتَّبِعُوكُمْ﴾ دواتان ناكەون، مع أنّە تۆ همَّت ئەكەی لە دەعوەتی الى الحقّ. ﴿سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ﴾ فەرقی نیە. ﴿أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَـٰمِتُونَ ١٩٣﴾ دوات ناكەون بەرێی راست دا ناڕۆن. أمّا بۆ وادی

شرك و ضَلال سەربەخۆ بۆى ئەڕۆن خۆلْ و زيخ و ئاوى بەسەر سەرى خۆيانا ئەكەن– (وَسَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ) (كما سَبَقَ، فافهَم!).

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ أوْلياو صُلَحا مردى و زيندى ﴿عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ﴾ فەرقتان چيە هەموو لە نَفسىَ پاشەكەوت بوين، ئەو قواو مَشاعِرو آلاتي ئەوان هەيانە ئێوەش هەتانە، بۆ عبادەتيان ئەكەن؟ بۆ هاواريان ئەبەنە بەر؟ ﴿فَٱدْعُوهُمْ ﴾ هاواريان كەنىَ ﴿فَلْيَسْتَجِيبُواْ لَكُمْ ﴾ با جوابتان دەنەوە دُعاتان بەجىَ بێنن. ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾﴾ كە ئەوانە نفع وضَرَرْ ئەدەن، ئاگادارن، ئەوەى بەوان ئەكرىَ بە ئێمە ناكرىَ. ﴿ أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَآ ﴾ ئێوە بىَ لاقن؟ ﴿أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَآ ﴾ شالاوى بۆ أخْذ يادَفع پىَ ئەبەن، وە ئێوە نيتانە؟ بىَ دەستن؟ ﴿أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ ﴾ ئێوە كوێرن؟ ﴿أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ﴾ ئێوە كەڕرن؟ بىَ گوێن؟ لە قواى عامله و مُدْرِكە شريك نين؟ بۆچى عبادەتى مِثلي خۆتان ئەكەن؟ بۆ إيمان بە رِسالتى كەسىَ نايێنن كە مثلى خۆتانە؟ بۆ عبادەتىَ شتىَ ئەكەن مِثل يا گەلىَ لە خۆتان بەرەو ژێرترە؟ ئەوانەى زيندى، وان، ئەوانەى مرديش، وابوين! پاش مردن چ ئەكەن؟ آلَت و أدەواتيان پىَ ئەدات؟ ئيش كردن خاصّي كبريائيە، كەوابىَ چ ئەكەن؟ بەچى ئەزانن ئەوان ئاگادرى حالّى ئێوەن. هاواريان ئەكەنىَ؟ نِداي ئێوە چۆن پىَ يان ئەگات؟ لە كوێن؟ هَواى مُكَيَّفْ بە كَيْفيە تي صَوت چۆن پىَ يان ئەگات؟ . خُلاصە هەمووى جَهالَتە.

﴿قُلِ ٱدْعُواْ شُرَكَآءَكُمْ ﴾ شريكى خۆتان وائەزانن شريكى خوان؟ ﴿ثُمَّ كِيدُونِ ﴾ فێلّم لىَ بكەن، چى دەربارەم ئەكەن بيكەن.﴿فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾﴾ آنەكەم مُهلەت مەدەن. ئا بزانم چيتان پىَ ئەكرىَ؟ ئێوە لە خوا نەترسن، من لە شُرَكاي ئێوە بترسم؟ أصْنام و غيره أصنام. ﴿إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ ﴾

قرآن و سائری كُتُبی سَماوی كە مَشحونن بە دَلائل لەسەر وَحْدانیەتی الاهي (سُبحان الله) قەدری عِلم لای پێغەمبەر چەند گەورە بووە، رَسولی كبریائی تەماشای شَواذ و خوارق ناكا، تابعی كتێبێكە كە لە لای خودا بۆی هاتوە، دوای خرافات و مُزَخرَفاتي بشريِ ناكەوێ. ﴿وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ١٩٦﴾ خۆی نَصرەتیان ئەدا. ئەوەی صالِح لە إعتقاد لە أعمال چ بگونجێ لە چاكە ئەوە بكا، لاشك خوا نَصرەتی ئەدا. لازمە بزانین عَملی صالح چیە، ئەمرۆ مُقابلي قوەت و بَطْش و آلات و أدواتي أجانِبْ، ئەبێ عملی صالحی ئێمە چ بێ؟ دوعا كردن و پاڕانەوە؟ إمداد لە أرواحی أولیایان؟ بەرماڵ بە كۆڵ دادان و تسبیح هەڵخراندنە؟ حاشا! مَعَ الأسف. صالح چیە؟ نایزانین، یاخود خۆمان بە غلط ئەبەین. ﴿وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ عیسی بێ، قُطبی فَرْد بێ، هەرچی هەبێ. ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ١٩٧﴾ ناتوانن نەخۆیان نە ئێوە سەرخەن یارمەتی كەن. حَقیقەتی ئەو آیتە بە حەق بۆ ئێمە ئاشكرا بووە. زیاتر لە پێنج صەد ساڵە موسڵمانان مغلوب ئەبن صەد هاوار بە پولێ، هاوار یا شێخ! یا فلان مَدَدي! (أللّهُمَّ نِكّسْ أعلامَهم وَ أيتِمْ أطفالهم وَوَ، خێر، بِالعكس بۆ خۆمان ئەبێ.

﴿وَإِن تَدْعُوهُمْ﴾ أنتَ وَ أصحابك یا محمد (ﷺ) دەعوەتی ئەو مُشرِكانە بكەن ﴿إِلَى ٱلْهُدَىٰ﴾ بۆ هِدایَتْ. ﴿لَا يَسْمَعُوا۟﴾ نابێن، نابیینن. ﴿وَتَرَىٰهُمْ﴾ یا محمد(ﷺ) ﴿يَنظُرُونَ إِلَيْكَ﴾ ئەو مشركانە تەماشای تۆ ئەكەن. ﴿وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ١٩٨﴾ ناتبینن، چونكی بە چاوی عداوەت تەماشات ئەكەن، تۆ چۆنی وات نابینن، بە شێتت حساب ئەكەن، لە كبرو عنادەوە خۆیان لە تۆ زیاتر ئەزانن. ئەو مَعنایە حَسَنە لە (حَسَنْ) نَقل كرایە، أمّا إرْجاعي ضَمیـري (هُمْ) بۆ أصنام، لای حَقیر، بێ مَعنایە وَلَوْ چاوی حَقیقي و زمانیان بۆ بخلقێنن.

﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ﴾ ئەوی خالِص و جَیِّد، پاك و چاك، لە إعتقادیان و أعمال و اداب،

وەرگرە حتّا شتی مُستَحْسَنْ وَلَوْ لە مُشرِکان بیّ قبولی کە تَعَصُّبْ مەنویّنە، إسماعیلی ئەڵیّ چیّ؟ إسرائیلی ئەڵیّ چیّ؟بنوارە چاکی و پاکی! ﴿وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ﴾ نافەرمویّ (بِالمَعروُفِ) عادەتی قرآنی لەسەر (مُعروف) ە مَعَ ضَمّ المُنْکَرِ. من ئەڵیّم مُراد اِرتفاع و بڵندیە، ئەوەی بڵندو بەرز بیّ أمری پیّ بکە.لە هەموو بڵندان بڵندتر إیمان بە وَحْدانیەتی خوایە، لەهەموو نەویان نەوی تر (بُتْ) پەرستیە عبادەتی مِثلە. کەسیّ (مُوَحِّد) بیّ ئەبیّ زۆر بەرزو عَزیزُ النَّفس بیّ، غَیْرِي خوداوەندی أنام کەس لە ژووری خۆی نەبینیّ کە بیپەرستیّ، لەو مقامە خۆی لە ریزەی (جبریل) و (سَیِّد الکونین) حساب بکا. حَقاً شِرك بەهەر صورەتیّ بیّ ذلّتە دناءَتە خواریە:

(لەبەر دەستی کەسیّ گەر رائەوەستیّ
ئەوەش رەسمیّکە لە رەسمی بوت پەرستیّ).

﴿وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾﴾ مُبالاتیان پیّ مەکە، هەرچی لە حەقت ئەکەن با بیکەن، رق نەت گریّ، جَهالەتیان سفاهەتیان بە مجامَلە مقابَلە بکە. ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ﴾ (نزغ) دەرزی لە پیّست راکردنە. ئەگەر شیطان وسوەسەی دای وسوسەیّ وردو باریك (أَنَّهُ) بۆ خوایەتی خاتمەی غضب سَوقت کا بۆ مُقابلەی سُفَهاء ﴿فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ﴾ پەنا ببە بۆ خوا ﴿إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾﴾ ئەت پاریزیّ لە هواجس و خَواطِري شَیْطاني، وَسْوەسەی تأْثیرت لیّ ناکا. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟﴾ بانەش گەیینە مقامی رسالەت ﴿إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾ کە بەوان گەیشت دەورە دەریّ وەك طَیْفي خَیال.﴿تَذَكَّرُوا۟﴾ یادی أمرو نهی إلاهی ئەکەن ﴿فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾﴾ مَواقعی خُطاو ریّی رشد ئەبینن، بَصیرانە خۆیان ئەپاریزن، حالی مُتَّقي وابیّ فَکَیْفَ حالی تۆ؟ دیارە وسوەسەی شیطان بۆ ئەو نوعە

بوزورگەوارانـە ناچـێتە دڵـیـان، دەوریـان ئـەدا، نهایـەت وەك نـوکی دەرزی بـە پێستیان ئەکەوێ.

﴿وَإِخۡوَٰنُهُمۡ﴾ اي شـیاطین یـا جـاهلین. ﴿یَمُدُّونَهُمۡ﴾ اي جـاهلي غـیره مُتَّقي دەوریان ئـەدەن. ﴿فِي ٱلۡغَيِّ﴾ لە فسـادیان زیاد ئەکـەن، فضـل لـەمنع و إعراض لێ هینانیان. ﴿ثُمَّ﴾ پاش وەسوەسـەی شیطان و إمدادي إخـوان. ﴿لَا یُقۡصِرُونَ ٢٠٢﴾ کورتی نایێنن لە فَساد و إفساد، نە لەوجدان و ضـمیر، نـە لەخارج. واعظێ زاجرێ نیە تا نەختێ کورت هەڵێنن لە غَـيٌّ و ضَـلال ﴿وَإِذَا لَمۡ تَأۡتِهِم بِـَٔایَةٖ﴾ هەر چەند تۆ إعراض بکەی لەو جاهِلانە، ئەوان لێت ناگـەرێن، لـە لَهث داناهێنن، إقتراحی آیات ئەکەن، کە آیتی مقترحیانت بـۆ نـەهێنان، ﴿قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَیۡتَهَاۚ﴾ بۆ خری ناکەیەوە بۆمانی ناهێنی؟ کَأَنَّهُ هینانی ایـتی مطلـوب لە دەست حضرەتي رسالەتە. ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا یُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّيۚ﴾ لـە خۆمـەوە نە ایاتی قرانی نە اکوانی، ناتوانم بێنم، لە چـنکی مـن نیـە عائـدی خوایـە، مـن رَسولم، وظیفەی من، إتباعی وحیە، ئەوەی لە طرف خوایەوە بۆم بێ دوای ئەو ئەکەوم، چیترنا.

﴿هَٰذَا﴾ ئەو قرانە حَکیمة کَریمە فَوقی کُلّی آیتە.خارقە دێوو دەروا چ علـم و حکمەتی لێ وەرناگیرێ، قوەتی فِکرو عَقلی پێ پەیدانابێ زیـاد ناکـا، بـەڵکو إعتماد لەسەر خوا رێ إنسانی لەهەموو علم و عَقل و هـۆش و سـعی إکتِشـاف و إختراع مَنع ئەکات. ئەو قرآنە ﴿بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ﴾ عَینی قوەتی قَلب و عَقلە، چاوی دڵی پێ ئەکرێتەوە، تاریکی جهـل و فسـاد و ضـلال بـەد أخلاقـی و بـەد أفعالی، پێی لائەدرێ. ﴿وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّقَوۡمٖ یُؤۡمِنُونَ ٢٠٣﴾ ئەوەی ئیمـانی پـێ هەبێ عَملی پێ بکا، رێ گوم ناکات دائما لەرووناکی دا ئەڕوا نـائِلی سَعادەتـی

مَعاش و مَعاد ئەبىٚ أبوابى سماوات و أرضي بۆ ئەكرێتەوە ئەبێتە عالِمْ لە نوامِسي طبيعەت بە أصولي شريعەت مەردى دونيا قيامەت. شواذ خوارق چن؟ بىٚ كەلك و فائدە ئەڕێن ئەگەر دواى أحكام و آياتى قرآنى نەكەون. ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ﴾ خاصّةً لە طَرَف پێغەمبەرى. ﴿فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ﴾ گوێى بۆ ڕاگرن، دلّى بدەنىٚ، خۆ كەرر مەكەن، نَفرەتى لىٚ مەكەن، پىٚ لە نفسى خۆتان بنێن، نەختىٚ تحمّل بكەن، تا بزانن چ ئەلّىٚ.﴿وَأَنصِتُواْ﴾ ووس بن. خۆتان بە قلەقياتى لِسانى مَشغول مەكەن، ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ٢٠٤﴾ لاشك ئەوەى بىٚ بُغض و عَداوەت گوىٚ لە قرآن بكا، تأثيري تىٚ ئەكا، دلّى بۆ هِدايَت و چاكە نەرم ئەبىٚ. (رَحْمَةُ اللّهِ)ى هِندى لە (إظهارُ الحَق) نقل ئەكا: شخصىٚ لە عُلَماى نصارى لەگەلّ عَلامّەي (قۆشەجى) مُدەيّىٚ مُناظَرەى كرد، سبەينەێى چووە لاى (مەلا على قۆشەجى) ديتى قرآنى ئەخوێند مەلاش دەنگى زۆر ناخۆش بو – عالِمەكەى مَسيحى گوێى لىٚ راگرت، كە مەلا لە خۆبۆوە عالِمەكەى مَسيحى گوتى: ((موسلّمان ئەبم)) – أشهد أن لااله الا الله وأشهد أن محمداً رَسول الله – مەلا فەرموى عجايب؟ چەند رۆژە مناظرە ئەكەى مُلْزَم نەبووى ئێستا چۆن موسلّمان بوى؟ گوتى: (مەلا)بەو دەنگى ناخۆش قرآنت ئەخوێند تأثيرێكى غَريبى لىٚ كردم، زاناندم ئەوە مَحض لە طَرَف خوايە (إيمانم هێنا) كەسىٚ گوێى لەو آيتە راگرىٚ وەمقامى بزانىٚ ئەزانىٚ ئێرە جێى قرائتى نوێژ و إمّام و مأمومىو جمعەو خطبە نيە. تفصيلاتي ئەوأحكامە ئەبىٚ لەصاحبى شريعەت وەرگيرىٚ. ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ﴾ يامحمد(ﷺ) يادى خواى خۆت بكە. ﴿فِى نَفْسِكَ﴾ لەنفسو دلّى خۆت بە تأمل و تدبرو تفكر. چ لە نوێژ چ لە قرآن خوندن چ لەدوعاو ذكري اسماءالله الحسنى. ﴿تَضَرُّعًا وَخِيفَةً﴾ بە ذِلّت و ضعيفي و ترسى ﴿وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾ بە ئاشكرايىٚ، نەگاتە دەرەجەى قسەكردن و گفتوگۆ لەگەلّ خەلّك. ﴿بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ﴾ لە هەمو سبەينەو ئێواران. ﴿وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ٢٠٥﴾ لە

هیچ أوقات. ذکري خودا بەطرزە زۆر مؤثرە، جَلال عظمەت و کبریائی خودا بە تەواوی لە دلّدا روو ئەچێ إستیلای قواو مشاعِر ئەکات. ئێمە کە أهلی علمین بە دائمي ذکري خوا ئەکەین، لە (تفسیر) لە (کلام)لە(أصول) شرح و إیضاحي آیاتي قرآني و ماهیەتی کِبریائی و صِفات و أسماء و أفعالي ئەکەین، أمّا هیچ تأثیري لە ئێمە نیە، بۆچی وایە؟ چونکی بەو نوعەی کە قران ئەفەرموێ وای ذکر ناکەین، عادةً چۆن بَحث لە حَقایق و رسومی مُمکِنات ئەکەین بەو نَوعەش بَحث لە ذات وصفاتي ئەکەین، خوا وەك ئێمە ذي ماهیّتە، وجودی زائدە لە سەر ماهیەتی، یا وجودی عینی ماهیّتە؟ ، وجودی بە مَعْنا کَونی فی الأعیان چۆن ئەبێتە عَینی ذات؟ قسەمان لە وجودی خاصە، ئەگەر وجودی خاص حَصر ئەبێ لە کَون، دیسان نابێتە عَین. وجودی ئەو مَجهولە، شتێ دییە. صفاتی زائِدە یاعَینە؟ یا لا وَلایە؟ ئەو صیفاتانە چِین؟ تَعریفیان چیە؟ چۆن ذاتي أحَدي ئەبێ بە موضوع بۆ ئەو صفاتە؟ لاشك بەو وجَهە شکوهو سَطوەتو هەیبەتي جەنابی حەق نایەتە دلْ. أمّا أهلی تَصَوُّف –ئەوانی راست– بەو طَریقي قرآنی ذکري خوای ئەکەن، وجدو بێ هۆشی و حالّیان بەسەردادێ صَفوتی قَلبیان ئەبێ، ترسی خوایان غالب ئەبێ، مەیلی دونیایان نامێنێ. أمّا ذِکري حای و حوی و دەف و دونبەلّەك و حەندەر حەندەر و هەلّپەڕین چ نیە!!! لاشَك بۆ حِفظي إسلام طَریقي ئێمە باشترە، وە بۆ شَخص طَریقي (صوفیانی بەرحەق) چاکترە. خۆ ئەگەر بێ و بەتەواوی لە قرآن بگەین و مُتَأدّب ببین آدابی، ئێمە ئەبینە (نوری علی نور) بۆ خۆشمان و بۆ أُمّتیش نفعمان زیاتر ئەبێ. بەلاّم تفسیرێ وەك (بَیْضاوي) لەبەر چەقێنی عبارەتی چەك بەردە چەك بەردەیی (نحو) ی یان (بُلَغا)یان و (مُتَفَلسِفان) إنسان ئاگای لە قران و معنای مقصودی نامێنێ. لە(تَفاسیري) نَقّالان لەبەر حکایَت وخرافات نازانی قرآن ئەلّێ چی. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ﴾ کە گەلێ کەس بە شُرَکایان ئەزانن. ئەوانەی مُقَرَّبین لای خوای ﴿لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ﴾ بەلّکو عبادەت

عبودیَّـت مایـەی إفتخاریانـە، أمّـا بـە مُقابلـەی ئـەو مُشـریکە مُسْـتَکْبِرانە وا ئەفەرموێ. ﴿وَيُسَبِّحُونَهُۥ﴾ تنزیە و تقدیس ئەکەن. ئەوانیش خالّی نین لـەنَقْـص چ نەبێ عالەمی إمکان دان، مُمکن هەرچی بێ، مُحتاجە. ئەوەی لەهـەمو نَقْـص مُبَرّا بێ، حَضرەتي واحِدي کبریائیە. ﴿وَلَهُۥ﴾ هەر بـۆ ئـەو ﴿يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢٠٦﴾﴾ سەر فرود ئەکەن گـەردەن دادەی إطاعـەتـن. ئێـوە ئـەی گرۆهـی مُشـرِکین بـۆ إستِکبار لە عِبادەتی واحِدي بێ شَریك ئەکەن؟ خۆ نَظَر بەو مُقَرَّبانـە، ئێـوە لـە أسافِل و أراذِل مَعْدودن.

تفسـیری سـورەی (أعـراف) تـەواو بـوو. ئـەوەی حـەز ئـەکا زۆر چـاك ئـەو سورەتە بزانێ تەماشای خُـلاصـەی (سـورة الأعـراف) بکـا لـە تَفسـیري (سَیِّد رَشید) رەحمەتی خوای لێ بێ خۆزی بمتانیبا بە مُجْمَلي تَرجمـە ونقلـي بکەمـە ئێرە، لکِنْ بێ هێزو طاقەتم لە (چنارۆك)م أوقاتی نووسینم کەمە خـودا تـوفیقم بدا ئەو تَفسیرە (کوردیە) تەواوکەم بـا گـەلێ نـاقَصیش بـێ أمّـا مَقصَـدي مـن مَعناي بَعضە آیتێکە کە معنای خۆمە، خوا بزریان نەکا[1].

---

[1] – سبەینەی سێ شەموو، حەفتی جمادی ثاني، دوازدەیی أغسطوسي رۆمی، سەنەیی هِجری قَمَري (١٣٥٥). سەنەی میلادی (١٩٣٦) .

## سورەتی (أنْفال)

سورەتی (أنْفال) هەشتەمینی سورەتی قُرآنە (مَدَنیە)، دوای (أعْراف) داندراوە، بۆچی؟ چی وایان نەفەرموە کەپولیّ بیّنیّ. کەوابیّ نَقلیان نەکەین وەقتی پیّ بەضایع نەدەین. (فَقیري سەراپا تَقصیر) بِحَوْلِهِ تَعالى وَجْهیّ غایَتْ وَجیه عَرض ئەکا، وەئەڵیّ: (ئەو سورەتە بەواسطەی سۆالي مُصَدَّر وا مَربوطە بە سورەتی سابقە ئەگەر بە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) فاصِلە نەدرابا، ئەبوە سورەتیّ واحِده).

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ﴾ في الحَقيقة ئەو سۆالە لە طَرَف أهلي إیمان زۆر دوور بو، نەدەبا بکریّ. مؤمِن بۆ غَیري إستِفادەی عِلم حەقی سۆالي لە حضرەتي رسالەت پەناە نیە. کافری عَنودو عَنید وەك (مُغیره) و (أبوجهل) و (وَلید) بەهەر طِرازي سۆال بکا ئەیکا، دایِماً خەریکی قَدَح و طَعْنە، لە إیذاو تَحقیري رَسولي أكرَم قصور ناکا. أمّا (مُؤمِن) حەقی نیە سۆالي أدْنی شائبەیّکی تیابیّ بیکا. دوشمن گویّ لە (قُرانْ) ناکا، رَسول ئەبینیّ، أمّا نایناسی چیە لەسەر چ فکرو مَشرَبە، مؤمِن ئەیناسیّ ئەزانیّ زاتیّ عالی هِمّتە کَریمُ النَّفسە بیّ مەیل و مُحابایە حُبّي جاهو رِئاسەت و إستِلاي مالّ لە دڵی ئەودا نیە، غایەی سَعادەت و هِدایەت و إرْتِقاي بَشَرە. کەسیّ وابیّ لە رووی طَمَع وإسْتِکراە چۆن سۆالي پرِو پاتارو تالآنی حَربی لیّ ئەکریّ؟ (چی لیّ ئەکەی؟ بۆ وائەکەی؟ ) شتیّ نەداتە ئەو، بیداتە شخصیّ تر چۆن پیّی ناخۆش ئەبیّ؟ ﴿قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ خۆشی تان بیّ و ترشیتان بیّ وایە، خوا چۆنی فەرمو رَسول بەو نَوْعە تَقسیمي ئەکا، وەك لە(حَدیث) ئەفەرمویّ: (أللهُ المُعْطي وَ أناالْقاسِمُ). ئەو

سؤال وجوابە هەرچەند پاش وەقعەی آتی واقع بووە أمّا بۆ ربطي سابِق ولاحِق بە وَجْهي مُقَدِّمە لە صدري سورەت إيرادْ كرا. ئەزانن ئەوتالآنـە إى كێيـە؟ ئـەو (أَنْفالَ)ە إى صناديدى كُفرو أساطيني عَداوەت و ضلالە كە لە سورەتى سابقە سؤال مُعامَلەيان لە حەق رَسول و أتباعي مَعلوم بو، وە سابِقاً بە إشارە وتَلويح و تَصريح زاناندرا ئەوانە خائِب و خاسِرْ ئەبن نائِلـي فَـلاح نـابن. پێغەمبـەر بـێ منەتى كردن هەرچى ئەيكەن بيكەن وَلـيّ و ناصـري وي، خوايـە، مُبـالاتي بـەو جاهِلانـە نيـە. ئـەمڕۆ پاتـالّى وان تَقسـيم ئـەكرێ، ئەبەخشـرێ. بَعضـي لـە موسڵمانان بە كراهەت ئەو سؤال ئەكەن. سورەتێ لە زەمـانى (نَصـر) و(عـِزَّت) لە(مَدينە) نازِل بووە لەتەك سـورەتێ كـە لـە زەمـانى ذِلَّـتْ لـە (مَكـە) هـاتووە دادەندرێ، ئەوە بێ شك ئەبێ بە امرى رَسول بێ. خۆت فِكر لە نَظمـي قُـران و تَرتيبى سُوَرْ كە بيهۆنەوە گوێ مەدەرە قسەی (جَلالـي سـيوطي) گۆيـا دانـانى ئەو سورەتە بە إشارەی رَسول نەبووە بە رَأي (إمـامي عُثمـان) بـووە! قسـەی نامَربوط و نامُنتَظَمْ مَعَ أنَّهُ جَمْعي قُران لە (مَصْحَفْ) لەزەمانى (إمامى أبـوبَكر) بووە، إستِنْسـاخي لـە زەمـانى (إمـامي عُثمـان) بـووە، كـە چـەند نُسـخەی لـێ گرتەوە بِنا لە إخْتِلافِ قـرآآت بـۆ أمْصـارى إسلاميەی هـەناردن. ئـەو سـورەتە ئەگەر بە گوێرەی نَظمي واقِعي با، ئەبا پێش (مائِدە) ذِكر كـرێ، بـەلاّم نَظمـى قُران أياتي و سورەتي لەگەلّ نَظمي نزول و وقوع و وَقايع، مُخالفە، نەك وَقايعي سـابِقە بەلّكـە وَقـايع و حـوادث و مـاجَراي زەمـانى رَسـولي مُجْتَبـى بـە وجهـى تَأريخي نايێنێ، بە وجهى إعتبارو إيقاظ و تنبيە و إمْتِنانْ، لە مَقامێ زۆر مُناسِب، ذكري ئەكا. بۆيە إنسان لازمە زۆر زۆر، گەلێ گەلێ بە ديقەت تەماشـاى نَظمـي قُران كا، حَتّا لەگەلێك جێ ئەگەر لە سَبَبى نُزولي نەپچڕێ مَعناي نايێ. ئيتر لام وايە ئاشكرابوو كە ئەم سورەتە لەمَوقِعي غايَتْ مُناسِبْ داندرايە.

﴿فَـاتَّقُواْ اللَّهَ﴾ خۆتان لەخوا بپارێزن بترسن.مَشاجرە و مُشـاحَنە و مُخالَفـە و مُراجعە بۆ شتى وا مەكەن، خاصَّةً لە زەمانى حَرب، دلّ لە هەمو نَزعەی پـاك

كەن، ئەگەر نَزغەیَ طائفي لە شَیطان دەوری دان، یادی خودا كەن، مەیڵن لە دڵتان بچەقیَ. ﴿وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ﴾ ئەوشتی لە بەینی ئێوە دایە، فاصلەی بەینی ئێوەیە، إصلاحي كەن. مەیڵن ببێتە سببی تَفَرقە و ناڕێكی. رابِطە لە بینی ئێوە وا بەقوەت بیَ إیثاري عَلی النَّفس بكەن أُخوّەتي إسلامیّە وا لە قَضا ئەخوازیَ (أنْ تُحب لأخیك ما تُحِبُّ لِنَفْسِكَ) أما (سَید رَشید) ئەڵیَ:( إصلاحي نَفسي ما بەینی خۆتان بكەن ئەو (ذاتە) حالَ و صیلەیَكە لە بەینی ئێوە، رَبطي بَعضیكتان بە بَعضیك ئەدا، ئەویش عِبارەتە لە رابِطەی إسلام، إصلاحي رابطەی إسلام بە وِفاق و تَعاون مواسات و تَركي أثَرَە). یَعْني شت بۆ خۆ ویستن تَفَوُقي پیَ ئەبیَ، وە بە إیثاریش ئەبیَ، بڵێم چی ئەوا وا ئەفەرمویَ! ! !

﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ مُقَرَّباني دەرگاهی (صَمَداني) إستِكبار لە عبادەت ناكەن ، سجدە بۆ خوا ئەبەن ئێوەش كە أصحابی حَضرەتي مُحَمَّدن (ﷺ) ئەبیَ فەرمان بەرداری خوا و پێغەمبەرین، سەری إطاعە لەسەر خاكی تَسلیم دانێن. ﴿إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١﴾ حقیقةً إطاعە لازمی إیمانە، مَلزوم بیَ لازم چۆن ئەبیَ؟ إطاعە لە شتیَ موافقي مەیل هونەر نیە، لە شتیَ كە مخالفی هەوای نَفس بیَ هونەرە معتبرە ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ﴾ ناوی خوای هات ﴿وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ﴾ دڵیان بترسیَ، جلال و عظمەت و سَطوەت و بَطشي كبریائي لە دڵیان راسخ بیَ. ﴿وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ﴾ آیاتي قرآني. ﴿زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا﴾ إیمانیان زیاد بكا. ولو شتیَ پیَ یان ناخۆش بیَ كە ایتی قرانی پێی وارد بو بۆ كردنی بە قوەتی إیمان قبوڵی كەن، پرتەو خرپە نەیەتە ناو دڵیان، إیمان تا بە قوەت تربیَ، إنسانی زیتر سَوق ئەكا بۆ إطاعە، هەر چەند گرانی و عوائقی هەبیَ، لای ئەدا سوكی ئەكا. دەفعەیَ ووتم: (سبەینان كە إنسان هەستا لە خەو بەدەنی گران بو نەیدەتوانی هەستیَ بۆ نوێژ، ملاحظەی قوەتی إیمان و

گرانی خەو بکا، ئەگەر قوەتی إیمان زیادبێ، گرانی خەو لائەدا). بە رەحمەتی خوا شادبێ (مەلا عزەتی) ئامۆزام ئەیگوت:(هەمو سبەینان کە هەڵدەستم کە ملاحظەی ئەو قسەی تۆ ئەکەم لەسەر بەدەن گرانی خۆم، بەسوکی هەڵدەستم بۆ نوێژ ئەچم). عمل گەرچی داخلی حقیقەتی إیمان نیە، أمّا لازمیەتی. کەسێ بڵێ إیمانم بە خوا هەیە، چۆن ئەبێ سوێندی بە درۆ بە زات و صفاتی خوا بخوا؟ بە سەری ئاغای بە گۆڕی شێخی، نەتوانی بەدرۆ سوێند بخوا!!! کاکی (أشعری) چی ئەفەرموێ؟ قوربان لە (مصر) تا (کۆیە) دونیا مالا ماڵ لەو نَوعە إیمان‌دارانە، ئەوانە حاشا أُمتی پێغەمبەر نین، أُمتی أشعَرین. (مُؤمِنْ) مؤمنێ بە گوللەی تفەنگ بکوژێ بڵێ کەیفم لە لینکە فرتەنەی دێ ئەبێ ئەوە چ إیمانێك بێ؟ شِدّەت و ضِعفي إیمان حەق نیە إنکار کرێ، مَنبَعَي إیمان دڵە. دڵ کە لە إیمان پڕبو،لەسەر هەمو أعضاي غلبە ئەکا. تفاوتی إیمان بە آیات و أحادیث و آثارو وِجْداناً ثابتە. هەرچەند أفرادی إنسان کە شریکن لە ماهیەتی إنسانی، أمّا تفاوتیان زۆرە لە لوازم و مآثري إنساني. ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢﴾ توکل بە بمعنای تَصوّفی لەگەڵ دینی إسلام ومقام مناسبەی نیە، وفي الحقیقە غیرە قابلە، ناکرێ. حَتّا طَیر ئەگەر لە هێلانەی خۆی نەچێتە دەر بۆ رزق نەخولێتەوە، ئێواران بە جیقڵدانە پڕی ناگەڕێتەوە. بەڵێ تشبث بە أسباب لازمە، هەرچەند وا ئەبێ مام صۆفی پوخت و تەمیز سفرە و خوانی دێتە بەردەم، أمّا هەزار کەس خەریك بووە تاکو ئەو نانە رێك خراوە. تَوَکّل ئەوەیە کە إمّامی (عمر) رحمه الله ئەفەرموێ: (ئەوەی لە عُهْدەی تۆ بێ، بیکە، دڵت بە خوا مربوط بێ بۆ نیل و پێ گەیشتنی)، چونکی سؤالي لە متوکل کرد هەر یەکێ جوابی داوە، آخري خۆی فەرموی:(ئەوەی تۆو ئەهاوێتە أرض ئەو مُتَوَکِّلە، رَجاو أمَل و أُمێدی هەر بە خوایە بۆی بکاتێ). ئێوە أُمێد و أمَلتان و رجاتان هەر بە خوابێ! دەرکەی فتوحاتتان بۆ ئەکاتەوە! گەلێ تالانتان چەنگ ئەکەوێ! ئەگەر لەو نَوبتە کەم و کورتی بو، لە سائِري نَوباتي دی

نابێ، ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ پشتی خۆیان بۆ بار بردنی تکالیف کوور ئەکەن، سەری فەرمان بەرداری لەسەر خاك دادەنێن. ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾﴾ لە رێی خوا صَرفی ماڵ ئەکەن، (إیثار) ئەکەن. چۆن ئێوە کە مؤمنن لەسەر أنفال عاجز ئەبن؟ لەحەق یەك دلگیر ئەبن؟ ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّاۚ﴾ مؤمني بەڕاستی هەر ئەوانەن، غَیری ئەوانە کەسی تر إیمانی بەڕاستی و دروستی نیە. بەڵێ هەمو لایەك إیمانمان بە خوا و مَلائکەت و کتب و رُسُل و آخرەت هەیە، أمّا شَرط ئەوەیە ئەو إیمانە بە قوەت تأثیر بکا، لەسەر هەواو هەوەس و رَزائِل غالب بێ. ئەو إیمانەیە زاتێ وەك (حَسَني بَصْري) (إمامي شافعي) أمثالي وان لە عُظَماي سَلَف نەیان توانیوە جَزْماً إدّعاي بکەن، بۆیە ئەفەرمون: (أنا مؤْمِن إنْ شاءَ الله). زۆر کەس لە مُدَّعیانی کَمالی إیمان لە بَعضێ مَواقِف بۆفیان دەرچووە خۆیان نەگرتوە. حَضرەتي (گەیلانی) ئەفەرموێ: (إیمان لە شَدائِد و مَصائِب دەرئەکەوێ). بەڵێ إیمانمان هەیە خوا حاضِر و ناظِرە هیچ لەوی بزر نابێ، ئەدی بۆچی لە پەنا ئەوی ئەیکەین ئەیکەین؟ لە حضوري پیرێژنێ، منداڵێ، ناتوانین بیکەین؟ بۆچی شەوقی شەبەق کە بزوت، بەهەزار یادی خودا و بطش و عقابي، دانامرکێ، أمّا بە زِلّەێ دەماریان لە بەدەن نامێنێ! حقا إیمانی بێ أثر، لاإیمانە، بون و نەبونی مُساویە! ﴿لَهُمْ دَرَجَٰتٌ﴾ زۆر بلَند بلَند ﴿عِندَ رَبِّهِمْ﴾ لای خوای خۆیان. خوا ئەزانێ چەندن و چەند بلَندن. مُحقّق بزانن إنسان تا هِمّەتی عالی تر و دوور بێ لە لَئامَەت و رَزالَت، مَرتبەی لای خوای بلَند ترە. خواو پێغەمبەرت لا چەند گەورەو بلَندبن، تۆش لای وان بەو نسبەتەی لە قَدْر و رَفیعي ﴿وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾﴾ نجیب پاك و خاوێن، بێ کدورَەت، نەك پروپاتالی تالانی، بەڵکو رِزقي دونیا، نسبەت بەو، ناشیرینە ناجسن تفتە. بَعضێ لە موسڵمانان

تقسیم و دارە بەش کردنی (انفال) یان بەو نۆعە لا ناخۆش و گران بو ﴿كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ﴾ لە(مدینە). ﴿بِٱلْحَقِّ﴾ بەجیێ و موافق. ﴿وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴿٥﴾﴾ پیێ یان ناخۆش بوو. مع أنە آخری پاش بونی نصرەت و ظفر بە حەق ﴿يُجَٰدِلُونَكَ فِى ٱلْحَقِّ﴾ قتال. ﴿بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ﴾ یقین بوو، لە إبْهام (إحدی الطائفتین) دەرچوو. جدالیێ بیێ مَعْنا، کاروانی (قُرَیش) بەسەلامەتی تیێ پەڕیێ، قتالیش نەبیێ، وەعدەی خوا چی لیێ دیێ؟ بەهانەو مَعْذەرەت، بەبیێ قوەت و أسبابی حَرب، خۆی نیە. زیرا دیارە ئەو مُجادلە مَحْضاً لە ترسەوە بووە، بۆیە ئەوەندەیان پیێ ناخۆش بو﴿كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ﴾ دەیان ئاژۆن. ﴿إِلَى ٱلْمَوْتِ﴾ بۆلای مردن. ﴿وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾﴾ مۆتیان لیێ عەیان بوو، شبهەیان نەبوو مغلوب ئەبن ئەکوژرێن.﴿ وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ﴾ (أیُّها الْمُؤْمِنُونَ). ﴿إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ﴾ کاروان یا ئەوانەی بە إمداد هاتبون لە (مکّة) بۆ مُقابلەی ئێوە ﴿أَنَّهَا لَكُمْ﴾ خوا نصْرەتتان لەسەریان ئەدا. ﴿وَتَوَدُّونَ﴾ فرقەیێ لە موسڵمانان حەزیان ئەکرد. ﴿أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ﴾ بیێ قوەت. ئەڵێن کاروانەکە چل سواری لەگەڵ بو، نفیری (قُرَیش) لە نۆصەد پتر بون. ﴿تَكُونُ لَكُمْ﴾ ئەتان ووت غالب ئەبین. ماڵیێ زۆرو زۆر باشمان بە مشقّەتیێ کەم دەست ئەکەویێ. ﴿وَيُرِيدُ ٱللَّهُ﴾ شتیێ غَیری مُرادي ئێوە ئەو إرادە ئەکا. ﴿أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ﴾ حەقیکی بە آیاتی مُنَزَّلە تَحقیق و تَثبیت بکا بی هێنێتە جیێ.

﴿وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾﴾ دواییان ببڕیێ، لە (طلیعە) تا (دومان) نەفەر نەیان هێڵیێ، أمّا بە (صَیْحة) و (زَلْزَلە) و (باو) شتي وەها نا، بەقوەی بازوی ئێوە، بە بارقەی (سَیف)، نەك بە (صاعِقة). ﴿لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ﴾ ثابت و قەرارگیری

کـا ﴿وَيُبۡطِلَ ٱلۡبَٰطِلَ﴾ یَعنـی شِـرك نـەیِّلیٚ ﴿وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾ ئەمـەش بـە إفنای أساطین و صنادیدی شِرك ئەبیٚ، تا ئەوان مـابن، دینـی إسـلام قـەرارگیر نـابیٚ – کمـا هـوَ حقّـهُ – إنتشـار ناکـا. دیـار بـوو ئەگـەر ئـەو گـەورە گەورانـە موسلّمان بوبان،دینی إسلام زۆرتر و زووتر إنتشاری ئەکرد، ئەوانـە مـانِع بـون، باریٚ کە موسلّمان نەبون با بفەوتێن. ﴿إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ﴾ ظاهری عِبارەت ئەگەیَنیٚ، ئەو هاناو دوعاو هاوارە، لە طَرَف موسلَمانان بـووە مُمکِنـە هـەمویان ئەو إسْتِغاثەیان کردبیٚ، خۆیان کەم (عَدَد) و بیٚ (عُـدّ) ـە بوین، دوشمـن زۆر و بـە أسـباب و ئامـادەیی شـەڕبوین. بـەلّام بـەگوێرەی رِوایـَتی (إبـنُ عَبّـاس) لـە حضرەتی (عُمَر)، ئەو إستِمداده لە طَرَف حضرەتی رسول الله (ﷺ)بووە، گۆیا زۆر ترساوە کە لەشکری وی مغلوب بیٚ کە دوشمنی وادیوە، رووی کردیتە قِبله دەستی درێژو بلّند کردووە لە بەر خوا پاڕاوەتـەوە:(خودایـە وَعْـدەتم بـۆ بێنـە جیٚ، خـۆ ئەگـەر ئـەو جَماعَتـەی لـە أهلـی إسـلام هـِلاك کـەی، لەسـەر أرضـی ناپەرسـترێی) بـە هُتـاف بـانگی کـردوە ئەوەنـدەی دەسـت بلّندکردیـە ردای سەرشانی کەوتووە، تاکو إمّامی (أبوبَکر) لە باوەشی کردیە عَرضی کردوە: یـا رَسول الله بەسیە کافیە چیتر خوا سوێند مـەدە، خـوا وەعـدەی خـۆی بـەجیٚ دێـنیٚ. ئـەوجا ئـەو آیَتـە نـازِل بـووە. بلّـێم چـی! مُقابَلـە ی إمّـامـی (أحمـد) و (بُخاری) و (مُسْلِم) و (أبو داود) و (تِرْمِزي) ناکریٚ! ! !

لە روایەتێکی (إبنُ جَریـر) ئـەلّیٚ: (إمـامي عمـر خـۆی عرضـی رسـول الله ی کردیـە وەسـوێندی بـۆ خواردیـە، خـوا وەفـا بـە عهـدت ئـەکا.) چـیت عَـرض کەم! ! ! ونُظّار ئەمەیان لا مُشْکِلْ بووە، أبوبکر لـەو إطمئنانـە، پێغەمبـەر لـەو إضْطرابە. ئایا (أبوبکر) وُثوقی بە وَعدی خوا زیـاتر بـووە لـە رسـولی مُجْتَبـی؟ جوابیان فەرمووە أمّا من تیٚ ناگەم! ئـەدی (صـدّیقی أکْبَـر) ئـەو وەعـدەی لـە پێغەمبەر وەرنەگرتبو؟ خودا بە جزم و تعین وەعدەی نەدا پێغەمبەری؟ چۆن خَوْف یا شَفَقَت لە حەقی أمّت بەسەریا غالب ئەبیٚ کە بەو نَوعە دوعا بکا؟ مـن

شتێکی تر ئەتوانم بڵێم: (شکی نەبو غالب ئەبێ، أمّا حەزی نەدەکرد گەورە گەورەکانی قُرَیش بکوژرێن) ئەیزانی بۆ عاقبەتی إسلام خراپە. خوێنی ئەو صنادیدانە لە دڵی ((أموی)) یان لە جۆش نەکەوت هەرچەندە لە فَتحی مَکّة رَسولي أکْرَمْ بە ((إذهبوا فانْتُم الطّلقاءُ)) باريَ گەورەی نانە سەر شان، تۆڵەی مَعَ زِیادةٍ دانەوە، لکن مَعَ الأسَف پێغەمبەر پاشی فَتح ئەوەندە نەژیا وە أکثري قُریش طُولي صُحبەتیان نەبوو تاکو أُخُوَّەتی إسلام بە تەواوی مَحْکَمْ بێ، دڵیان بە مُکَمَّلي لە غَلّ و غَش پاك ببێتەوە، بۆیە ئەوەندەی پێ نەچو عداوەتیان ژیاوە خۆبەخۆی تێك ئەنگژان، حقیقةً مُصیبەتێ گەورە بو بۆ دینی إسلام، ئێستاش أثَري ئەو شەڕو شۆڕە لەناو ئێمەدا ماوە بەڵکو حُکم فەرمایە). ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ﴾ (عَلی لِسانِ الرَّسول) پێتان گەیشت، یاخود لەخەوا هاویشتیە قَلبیان.﴿أَنِّي مُمِدُّكُم﴾ بە فریادتان ئەنێرم تقویەتان ئەکەم. ﴿بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ٩﴾ بە (کَسرْي) دال قراءتي جمهورە، بە (فَتْحي) دال قراءَتي (نافع) و (یعقوبە)، یَعني ئەو هەزار ملائکەتە دوای ئێوە، یاخۆ بە خۆی بە جووتە سوار، یەکێ سواری وولاغێ بێ لە پشتیەوەی یەکێ تر. ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ﴾ موژدە بە نَصرەت و غَلبە. ﴿وَلِتَطۡمَئِنَّ بِهِۦ﴾ بە ناردنیان. ﴿قُلُوبُكُمۡۚ﴾ دڵتان پێی راوەستێ خرت وپرتی تیا نەمێنێ.﴿وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ﴾ هەر لە لای خوایە.

أوّلاً: سەرکەوتنی لەشکر بە رابطەی قلب وإنشراحي صَدر ئەبێ، ئەوەش صِرف بەدەست خوایە کەس شرکەتی لەوەدا نیە.

ثانیاً: بەمەردی جەنگدیدەی جەنگ ئازمودە، ئەوانەی شەڕیان نەدیبێ هەرچەند بە شَجاعەتیش بن کە واقِعیان دیت ترس و دەهشەت غَلَبەیان لێ ئەکا. گەلێ سەر سپی و شێخ چونە پێش (روس)لە جِهەتی (رەواندن) هەر چەندە بوو تەقەی طوپیان گوێ لێ بوو شرقەی دانا لە حینی تەقینەوە، ئیتر

هەڵێ پەنا بەخوا، مامۆستا هەڵمەیٚ چ نیە تۆ دەڵێی أجَلْ یەکە دوو نیە ئەگەر أجَلت نە هاتبێ قەیدی ناکا، نەخێر چ گوێی ئەداتێ چارەسەرە.

ثالثاً: یەك غایە بن، غایەیێ عالی کە روحی لە تۆغرا بەخت بکەن.

رابعاً: خاصَّةً بۆ حَربي أیّامی ئێمە آلات و أدەواتـی حَدیثـە و مهارەتـي إستعمالي، مُقابلەی شیصت تیر بە تفەنگە شینکە ناکرێ! حوشترو سیّارە وە بارگیر و طَیارە یان نەگوتیە!!! شیرو تیرو گورزو کۆپاڵ کەڵك ناگرێ. ئەمرۆ دوعا بەکارنایێ، خوا، خۆت، علمی حَرب، قائدیێ چاك بە دِقتیێ تەواو إدارەی عَسْکَر بکا. ئەوەی بەتەمای مَلائکەت بێ قورِ بەسەر و ماڵ وێران ئەبێ. خوا خۆی ئەفەرموێ: (وَأعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُم مِنْ قُوَّةٍ) وە ئەفەرموێ: (لا تَغْفُلُوا عَنْ أسْلِحَتِكُمْ). ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ﴾ غالبە، ئەزانێ غَلَبە بەچی ئەبێ، -أسْتَعيذُ باللّه- ئەگەر خواش قُدرەت و قوەتی نەبا خوایەتی پێ نەدەکرا.

﴿حَكِيمٌ ١٠﴾ شت لە مَوقِعی مناسبی خۆی دادەنێ، کاری وی هەرزەکاری نیە. بەڵێ (حَرب) قوەتی ئەوێ حکمەتی ئەوێ تَرتیبی ئەوێ، هەرکەس موقعی خۆی بدرێتێ بە گوێرەی لیاقەت کاری پێ بسپێردرێ، کەسێ ناشی بکرێتە بینباشی بەهەزاران سەر بێ کڵاو ئەبێ. مەلا ئەتوانێ بە نوکی قَلَم أرض و آسمان تێك دا کُلّی آنێ ئەو عالەمە عظیمە بباتە فَنا عالەمێ مِثلي ئەو عالەمە بێنێتە وجود أمّا إدارەی دوو پیرێژنی پێ ناکرێ.

﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ﴾ بە نوعێ ترسی لە دڵانەهێشتن کە ئەبۆرژان بۆرژانی بەسەرا هەڵکێشان لەسەرتان غالب بوو. ﴿أَمَنَةً مِّنْهُ﴾ نُعاسێ نەبو فتوری دابنێ لە حَرب بکەون ئاگاتان لەخۆ ببڕێ بەڵکو (أمَنَةً مِنْهُ) لە طَرَف خوای أمْنیەتی پێ دان بەو نَصْرانە کەوتنە وەقتی أمّان و بێ خوف زەمانی إستراحەت و نوستن. ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ باران لە رۆژێ کە وَقعة قەوما. ﴿لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ﴾ بەغسل و دەست نوێژ. ﴿وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ

ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ وەسوەسەی (إبلیس) خَبیث، چی ئەکەن؟ ئەخنکێن لە تینان، چۆن نوێژ ئەکەن چۆن خۆتان لە (جَنابَت) ئەشۆن؟ ئەو خَطَراتەی نەهێشت.
﴿وَلِيَرۡبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمۡ﴾ بەبارانی رەحمەت. ﴿وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلۡأَقۡدَامَ ۝١١﴾ مادّي و مَعْنَوي. خۆتان راگرن لە (رَمل) روونەچن. ئەڵێن جەنابی رەسول لە موقعێ سەرئاو أمری نزولی دا (حُبابي بن مُنذِر بن جَموح)عَرضي کرد ئەوە بە (وَحي)یە یا بە تدبیرە فەرمووی تدبیرە تاکو بۆ ئاو مُعَطَل نەبین، عرضي کرد چاکتر وایە بچینە سەر بیرێ هەرە ئەولا، طَبیعي ئەو قُلوبانە یعنی بیری هەڵنەندراو بە ئاوی باران پڕ ئەبون، ئەوجا ئەوان مُعَطّل ئەبن بۆ ئاو وە ئێمە ئاو ئەخۆینەوە ئەوان ناخۆنەوە. پێغەمبەر (رأي وی قبولێ کرد لەو موقعەی کە إشارەی کردێ نزولیان کرد، ئەوەندەی لازمیان بو چاڵەکانیان لە ئاوی باران پڕ کرد، ئەمەش یەکێکە لە أسبابی ظَفَر کە سەرداری گشتی بە قسەی نەفەرێ بکا مادەم معقول و موافِق بێ.

﴿إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ﴾ خوای تۆ، چەند جوانە.﴿إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ﴾ دیارە ئەوانیش وەکی ئێمە محتاجی ئەو نوعە معینن ﴿فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ﴾ بە تَثبیتي مَعنَوی إلهامیان بکەن. ئێمە بە إمدادی ئێوە هاتین، ئێوە مەترسن، غلبە بۆ ئێوەیە ئایا شەڕیان کردیە یان نا؟ خلافیە.﴿سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ﴾ تحقیقاً و تأکیداً بزانن من ترس ئەهاوێمە دڵی کافران، ئەوە لە أعْظَم و أجلاي عَلائِمي شکانە. ﴿فَٱضۡرِبُواْ﴾ (أیها المؤمِنونَ). ﴿فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ﴾ لەسەران یا لە پشت ملان دەن، نەك لە لاملان، چونکی ئەوان پشت ئەدەن. ﴿وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ۝١٢﴾ ئەوانەی ڕووتان تێ ئەکەن، لە پەنجەیان دەن، لالێ ئەبنەوە، ناتوانن پەنجە بازیتان لەگەڵێ بکەن.

ئەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) پاش هَزیمەتی قَوم لە بەینی لاشەی مَقتولان ئەگەڕا ئەیفەرموو: (نُفلِق هاما) ئەوەندە صدری شعرێکیە کە حَضرەتی (أبوبکر) بەتەواوی ئەیخوێندەوە:

نُفلق هامًا مِن رِجالِ أعِزةٍ عَلَيْنا وَهُمْ كانوا أحْمَقَ وَ أظْلَمَ

دیارە رَسولی أکرم لای ناخۆش بووە کوژران و عَزیز و شُرَفای قَومی خۆی، وَفِي الحَقيقة حەقی بوو، چونکە عاقبەتی بۆ إسلام باش نەبوو. ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئەوە. ﴿بِأَنَّهُمْ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ﴾ لابەلای یان کردون، ئەوان لە طَرَفێ، ئەمان لە طَرَفێ، دوشمنایەتیان کردون. ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ لەسەری ناچێ. ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٣﴾﴾ پێیان ئەچێژێ. ﴿ ذَٰلِكُمْ ﴾ (أیها المُعادون). ﴿فَذُوقُوهُ﴾ بیچێژن لەدونیا. ﴿وَأَنَّ لِلْكَٰفِرِينَ﴾ هەر کەسێ بێ بەهەر نَوعە کُفرێ بێ. ﴿عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٤﴾﴾ لە داری آخِرَة -نَعوذُ بالله مِن عقابِهِ وَعَذابِهِ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ توشیان بون. ﴿زَحْفًا﴾ ئەوان هاتنە سەر ئێوە بۆ شەڕ. یا لەبەر مُناسَبەی وقعەی (بَدر) یا لەبەر دَفعی طَعن لە دینی ئێمە، وای فەرمووە. ﴿فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾﴾ ئەگەر چی بێ أدَبیە أمّا بەکوردی ئەڵێم: (قونیان تێ مەکەن) ئەوە لەو مقامە مُناسبە، وە إلاّ ئەیفەرموو (إظهار)، (سَیِّد رَشید) یش شتێ وا ئەفەرموێ. ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ﴾ کەسێ لە لەشکری ئێوە هەر کەسێ بێ ﴿يَوْمَئِذٍ﴾ ئەوێ رۆژێ ﴿دُبُرَهُۥٓ﴾ پشتیان داتێ هەڵێ. ﴿إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ﴾ بۆ لاێ بڕوا وا بنوێنێ کە هەڵدێ تا مخاصِمی دوای کەوێ لە لەشکری خۆی بێتە دەر ئەوجا باداتەوە سەری بۆ کوشتنی ﴿أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ﴾ نَقل بکا بۆ لای جَمعێ لە موسڵمانان

نَصرەتیان بدا. ئەوانە لە (تَوَلّيُ الدُّبر) نین، أمّا مُبالَغةً في الإحـترازِ عَـنِ الفِـرار)، ئەوانەشی بەفرار داناوە وە إستثنای فەرمووە. ﴿فَقَدْ بَآءَ﴾ ئەوەی فـرار بکـا لـەوەقتی حَـرب، (بَـدر) یـا غَـیری بَـدر، مادامـە آیَـت پـاش وَقْعـە نـازِل بـوبیٚ، تَخصیصی بە (یَومي بَدر) بەڵکو شمولی بۆ (یَومي بَدر) بیٚ معنایە.

ئەگــەر لەبــەر ﴿بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾﴾ تخصیصیان کردبیٚ، سَهلە لەبەر رُخصەتی آتی لەو سورەتەدا. ئـەو کەسـە بـە حەقیقەت ئەگەڕێتـەوە مُتَلَبِّس بـە غَضَبی خوایە، سـەراپای دادەگـریٚ، مـلاذُ ومَلْجاي وي جهَنَمە. ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ﴾ ئێوە لە غزوی (بدر) ئەوانتان نەکوشـتوە ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ﴾ خوا کوشتنی وە إلاّ ئێوە بەو کەمیە کَمّاً وکَیْفـاً ئـەوان بەو زۆریە بەو قوەت و أسبابە بە خَیالَ دا نەدەهات ئێوە ئەوان بکـوژن ئـەوان لەبەر ئێوە هەڵێن، ئەو کارە کاریٚ بو مَحْض بە تَأْيیدي ربّاني. ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ﴾ پێغەمبەر لۆچە خۆڵێکی هاویشت بۆ طَرَفِي دوشمن گەلێك لەوان خـۆڵی کەوتە ناو چاو و لوت و دەم ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾ لاشك ئەو تَـأثیرو وصـول و شمولە مَحْضاً بە خَلقي خـوا بـووە. بـەڵیٚ لێـرە قَـوْلي (أشـعري)م قبولـە، أمّـا منداڵیٚ بەردۆکەکی باویٚ بڵیٚ: (ئەوە مَحْض بە خلقي خوایە) قبولٚ نیە، خـواش پێی راضي نیە. جَبرِيّة وغَیرە جَبرِيّة هەریەك ئەو آیَتە بۆ لای خۆی رائەکێشیٚ.

(صوفِيّة) بۆ اَتّحاد ئەڕۆن، أمّا کشتی هیچە، صاحبی مُعجزە لە معجـزە بـیٚ تأثیر إذني نیە، بە ضربي عَصـا بَحـر شـەق نـابیٚ، بـەرد کـانی لـیٚ دەرنـاقولیٚ وَهکذا. . . هەرچەند قدرەتی إنسان مؤثّر بیٚ، ناگاتە ئەو دەرەجە، ئەو قووەتە خاصی إلاهیە، معتزلیش ئەوە ئەسەلمێنن.

﴿وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا﴾ جـەنابی حـەق بـەو نَوعـە نَصـرتی موسڵمانان ئەدا (أوّلاً) إیفاءً بِالوعد وە (ثانیاً) بۆ خاطري پیٚ یان عطا کا عطایَ جوان و پاك. أمّا تفسیری بە (إبلای فی الحَرب)یعنی تا موسڵمانان قِتال بکەن بە

قتالیٚ شَدید، صَبرکەن، صبریٚ گەورە، نَظر بە وَقعەی (بَدر) لام خۆش نیە، أمّا نَظر بە آتي باشە، وەكذا تَفسیر بە عَطا چونكی غَنـائمی (بَدر) ئەوەنـدە نـەبو جیٚ مِنَّتْ دانان بیٚ، أمّا تَفسیری بـە (إمتحـان)زۆر باشـە. جـەنابی حـەق بـەو یارمەتیەی نَصرەتی موسڵمانانی دا، دوشمن بەتەواوی لە قوەت نەكەوت، وەك ماری زەخم خوردە گەڕایەوە. ئەوجا بزانین موسڵمانان مِن بَعْد چی ئەكەن! إعتماد ئەدەنە سە خَوارِق و یارمەتی خوا؟ بەمستە حَصبایٚ ظَفَر ئەبەن؟ یا إحترازو إحْتِراس ئەكەن؟ أسبابی حَرب إكمال ئەكەن؟ بـە عَدَد و عُدَدیٚ تـەواو مُقابَلـەی عـدو ئەكـەن؟ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١٧﴾ لـە هـیچ غافـلٚ نیـە.
﴿ ذَٰلِكُمْ ﴾ ئەمـــەتان ئـــەوها بـــوو. ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ ٱلْكَٰفِرِينَ ١٨﴾ أعْدایەكانتان سعی زۆر ئەكەن بەهەر نَوعیٚ بیٚ قصور ناكـەن وەك (إنگلیـزی) ئەگەر بە ئازای نەبیٚ بە فڕوفێلٚ خەریك ئەبیٚ. جەنابی حەق فێڵی وان ضَعیف ئـەكا، ملائكـە نـانێریٚ، خَوارِقتـان بـۆ نـانوێنیٚ.﴿ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ ﴾ (ایهـا الوْمنون!). ئەوانەی كە پیٚ یان ناخۆش بوو حەزیان لیٚ نەبو ئـەمجارە توشـی شەر بن فی الحَقیقة حەزیان لیٚ بو موسڵمان بەسەر مُشركە كـان غالـب بـن، أمّـا ئـەم دەفعەیـە أمَلیـان نـەبو لەبـەر بـیٚ قـووەتی.﴿فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ﴾ مُشاهَدەتان كرد، لەسەر ئەو ناتەوانیـە، خـوا غـالبی كـردن.﴿وَإِن تَنتَهُوا۟ ﴾ لـە مجادە لەو مُعارَضەی رَسوُل الله جاریٚ تر نەیكـەن ﴿فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾ بـۆ ئێـوە چاكە.﴿وَإِن تَعُودُوا۟ ﴾ بۆ مجادەلـە.﴿نَعُدْ ﴾ بـە زَجـر تـوبیخ بـەڵكی بـە عقـاب. ﴿وَلَن تُغْنِىَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ ﴾ جماعـەتی ئێـوە ﴿شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ ﴾ ئەگـەر معونـەی خواتان لەگەڵ نەبیٚ، كثرەتي لەشكر بۆ ئێوە فائـدە نـادا، نەكـەن بـە كَثْـرەت هەڵخەڵەتێن.

(سیاهی لَشكر نَیایَد بەكار
كی یَكیٚ مَرد جنگی بَهْ أزصَد هزار)

شرط رێك و پێكيە، إطاعەی قائدە، غیرەت كەشي و صَبرو ثُباتە، رابطـەی قلبە. ئەو مَعنايە لە (عَطا) و (أُبَيِّە بن كعب) نقل كرايە وە (جُبّائی) إختيـاری كرديە، حَقيقة بەجیٚ یە، گەرچی أكثر لايان وايە خطابە لەگەلٚ ئـەو مُشركانەی كە هاتبون بۆ فتح. روايەتیٚ ئەكەن گۆيیا مشركەكان أستاری كعبـەيان گرتيـە دوعايان كرديە: (خوايە أعلى الجُنْدَين، أكْرَمَ الفئَـتَين، خَيْـرَ القَبيلَـتين، نَصـرت بدەی) ئەوجا هاتيين بۆ حَرب، وە لە وەقتی حَرب دا فَرداً (أبـو جهـل) دوعـای كرديـە: (خوايـە ديـني ئێمـە قَديمـە، ديـني محمـدی حادثـە، كیٚ هـەدين لات خۆشەويست ترو پیٚ راضي تری، أهلی ئەو دينی نَصـرەت بـدەی)، بـەلاٚم ئـەم قسەيە لای (حَقير) خۆی نيە! ئەو مُشركانە مغلوب بـون و هـەلاٚتن، لـەو حالٚـە چۆن خطابيان لە گەلٚ ئەكریٚ؟ أول و آخري خِطـاب لەگـەلٚ مؤْمنانـە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾﴾ بە إيمانیٚ كامل بیٚ دەغدەغە و مُجادەلە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ لـە سِلم لـە حَـرب لـە تقسـيمی غَنيمَتْ، ئەوان چيان فەرموو چۆنيان كرد، سەرپێچی مەكەن ﴿وَلَا تَوَلَّوْاْ عَنْهُ﴾ روو لە پێغەمبەر وەرمـەگێڕن ﴿وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾﴾ ئـەبێن، گـویٚ دێـرن تـیٚ ئەگـەن بـەهۆش و گۆشـن، وەكـی مشـركەكان بـیٚ گـویٚ نـين﴿ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾﴾ ئـەوەی ئـەيبيێن، تێـی ناگـەن، وە مقصد لە بيستن دەركی دەنگ و صَدا نيە، ئەوە بۆ حيواناتيش هەيە، ئـەوەی ئەيبينن تیٚ‌ی بگەن، علم و حكمەت و فائدە چی تێدا بیٚ وەری گرن عَملـی پـیٚ بكـەن ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ﴾ خـراپترينی حيواناتـیٚ كـە بەسـەر أرض دا دەڕوا لای خوا، كە لای ئەو وابیٚ، لـە حقيقـەتـدا وايـە، بـەلاٚم بَعضـی كـەس وا نازانن ﴿ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾﴾ كەڕو، بیٚ گویٚ شتیٚ چـاك نـەبیٚ، لاڵ بیٚ زوبان زوبانی لە حەق نەگەڕیٚ، بیٚ عَقل ناتیٚ كەيشتو دَركی حَقايق نەكا

نەیبەستێتەوە لە خراپە فی الحقیقة ئەو نوعە کەسانە لە هەموو حیوانات مَضرتر و خراپترن.

گەلێ جارم گوتیە إنسانی تێ گەیشتوو چاك لە هەموو شت حتّا لە (مَلَك) چاکترە، ئەوانە نَفعی مَحْضَن خێری مُجَرَّدن، إنسانی کەری بەد ڕەوشت لەهەموو شت خراپترە حتّا لە (شَیْطان) ئەوانە ضَرَرِي مَحْضن شەڕی مُجَرَّدن. خوا ئەزانێ ئەمڕۆ بەناو موسڵمان هەن بۆ موسڵمانان لە کافری حَربی بەد ترن، تەنها ناوەکەی هەیە موسڵمانانە، ئەوەی طاعت و عبادەت بێ نی یەتی، ئەوەی گوناهو عصیان بێ ئەیکا، باوڕ ناکەم هیچ کافری بەد سیَر لەناو قەومی خۆی وا خراپ بێ کەس خێری لێ نابینی– وەك مَسیحیان کفارەتی ذنوبیشی نیە– ﴿وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ﴾ لەو أشرارانە. ﴿خَيْرًا﴾ تێ گەیشتنو هۆش ﴿لَّأَسْمَعَهُمْ﴾ مَعْنای آیاتی ئەهاویشتنە گوێ یان تێی ئەگەیاندن، ئەوە وا ئەلێ، مرادی ئەوەیە ﴿وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ﴾ علی تقدیری تێ گەیشتنیان. ﴿لَتَوَلَّوا۟﴾ إعراض ئەنێن لە قبولێ و إذعان و تصدیق و باوەڕکردنی ﴿وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾﴾ وەك پێش (إسْماع) ببێن، نەبیێن، گوێی لێ کەن، گوێی لێ نەکەن، وەك یەکە أوَّل و آخري إعراض لە حەق و إیمان و چاکەیە. لەبەر معنای (خَیْر) مەلایان لێرە إضطرابیان هەیە (سعد الدین) لە (مُطَوَّل) تەواو قسەی لێ فەرمووە (وَلَوْ اسمَعَهُمَ) ناکاتە مَدخولی (وَلَوْ عَلم الله فیهم خَیْراً). (سَیِّد رَشید) ئەفەرموێ: (وَلَوْ اَسْمَعَهُمْ) وَقَدْ عَلِم ان لا خَیْرَ فیهمْ.

بەڵام ئەوەی من عرضم کردن زۆرباشە بێ دەغدەغەیە. ئەوەی گوێ لەو ایتە ڕاگرێ تێ بگا ئەزانێ خوای تعالان هەروا بە هەوەس خَلقي کفر و إیمان لە دلاندا ناکا ئەوەی اَدْنی قابلیەتێکی هەبێ هِدایەتی ئەدا مۆری لەسەر دلّ دانانێ، کە فطرەتي بە تەواوی نەما فَسادی بوو بەدی بووە مَلَکەی ئەوسا دلّی مۆر ئەکات، وە بە تۆبزی کەس ناکا بە کافر هەروەکو کەس ناکا بە مُؤْمِنْ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بە إيمـانی تـەواو. گـوێ ڕاگـرن خـوای تَعـالان مقیاسـێ عَظیمتان بۆ دادەنێ کە فَرق کەن لە بەینی حُکمی إلاهی و غَیرە إلاهی، تَمیز لە بـەینی خـالص و مَغشـوش، أصـل و دَخیـل، حـەق و مُفتَـری. ﴿ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ﴾ رَسولي مُجْتَبی، إمامی هُدی مَحْيِ عَرَبْ، بەڵکو محـی مافـەی بَشَـر. ﴿إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ﴾ حیاة بیّ، هەرچی هەبیّ. تەماشاکەن تیّ فکرن هەر حُکَما هەر أمریّ هەر شتیّ کە تَکلیفتان لیّ کرا ئەگەر حیاتێکی روحـی مَعنـوی تیا بوو، بزانن ئەوە لای خوایە حُکمی ئەوە پێی راضیە، هەرچی عِزّ و شەرەف و جەوهەرو سَعی و کۆشش و نِشاطي عِلمي تیابوو قَبولی کەن إلاهیـە لـە طَـرَف رَسولي ئەو پێتان گەیشتیە. ئەوەی داعی بـیّ بـۆ دَنـاءَتْ و رَزالَـتْ و کَسـالَتْ و عَطالَتْ گرانی بۆ عَمَل بزانن ئـەوە خـوایی نیـە، غَـلّ و غَشّـی تـیّ دایە قبـولی مەکەن. ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ﴾ بەس ئەو جملە جَلیلـە عائِدی إعتقادیانە، لازمە تَأمّل کەن لە إعتقادیات، إعتقادیاتی إجهتـادي نەکەنـە حائِل لە بەینی خۆتان و عَقْلتـان، أَعْظَمـي نفعـي الاهـي دەربـارەی بَشَـر عَقْلـە، فَصل و تَمیزی إنسان لە سائِری حَیوانات بە عَقله، کە عَقل نەما یا بیّ هێزکـرا، انسان لە حَواسیش خێر نابینیّ، سەرسەری سَطْحي شـتی حِـسّ ئـەکا، أمّـا لـە حِکمـەت و حَقـائق و دَقـایقی ئاگـادار نیـە. عَقـل بـۆ إنتظـامي حیـاتی دونیـا، سعادەتی هَیئەتی إجتماعی، ڕێ بە هەموو شت ئەبا، دۆزینـەوەی خـوا تَحَقُقُ ثُبوتي نُبُوّەت بە عَقْله. نـاتوانم وەك (مُعْتَزِلـة)علـی الاطـلاق عقـل بکەمـە حـاکم واضعي شرایع بۆ دونیا و قیامەت، ئـەوە مُـوجبی ثوابـە ئەمـە مـوجبی عِقابـە، ناتوانم بلّێم لە غیری ئەو صورەتە مَدار عَقلـە. أمّـا تفـاوتی دەرەجـاتی عقـول، تبایُنی میول، إختِلافی مَشارِب، تَنـافِي مَشـارِبي هـەوای نفس، حبّـی رئاسـەت، خساسەتی سیاسەت، عقلیان مشوش کردیە بۆیە بشر محتاجی اِرسـالی رُسُـله. خوای تعالان بۆ تأیدی عَقل و تعدیلی فطرەت و طبیعەت رُسُلي کرامي نـاردون،

بۆ نەرم کردنی بعضە دەماغیٚ ڕەق و ووشك، بە بَعضیٚ شَواذ و خَوارِق تَقویەی کردون. کە وابیٚ رسالەت بۆ هَدمی أحْکامی حِسّ و عَقل تێك دانیی قَواعِدی فطرەت و طبیعەت نیە. بناءً عَلیهِ ئێوە بە خَوارِق هەڵەخەڵەتێن! ملائکەتمان هاتە إمداد، لەمەو دواش هەر ئەبیٚ؟ بە لۆچە خۆڵێکی چاوی لەشکری دوشمن نوساندن و هەلاّتن؟ وەهکذا بە خَوارِق خوا ئەمان خاتە سەر؟ سبحان الله! ئێمە بە منداڵی (تصریفی زنجانی) لەبەر ئەخوێنین، پێمان ئەڵێن: (أبی یَأْبی) شاذَّة، شاذ خَرْمی قاعِدە ناکا، لەوە بە منداڵی تێی ناگەین، ناشُکری نەبیٚ بە گەورەیش تێی ناگەین! لای خۆمان مەلاین! تَرکی هەموو قواعِد ئەکەین دوای شواذ ئەکەوین، بۆ هەموو شتی دین و دونیای إعتماد ئەدەینە سەر (کَرامەت)، مع الأسَف بیٚ کَشف و کَرامەت ماین!!! (أشاعِرە) ئەفەرمون: (هەموو شت بە مَحْضی قُدرەتی خوا ئەبیٚ، گەلیٚ شت إبتداءً بیٚ واسطە بە خلقي خوایە، بِالفِعل إرادەی ئەکا، رابطە و نسبەت لە بەینی أشیایان دا نیە، قُدرەت و قُوا، بیٚ تأثیرن، بەڵکو نین).

لاشَكّ بەو إعتقادە خوا ئەبێتە حائل لە بەینی (مَرْء ) و دلی، ئەوەی خوا بزانیٚ ئەبیٚ، حتما ئەبیٚ، ئەوەی بزانیٚ نابیٚ، حتما نابیٚ، أنّە إمکان و إمتناعی أشیاء تابعی علمە. وهکَذا تەماشای إعتقادیات کەن علی الأکثَر حائلە لە بەینی إنسان و عَقل، بە غَیری عَطالەت و عجْزو کَسالەت راضي بوون بە أسارە ت و ذلّەت، چ فائدەی تری نەدا بۆ أُمّت.

بەو إعتقادیاتە لە هەموو إختراع و إکتِشاف مَحروم بوون، لە (أوج)ی عِزّو شَرَف کەوتنە حَضیضي ذلّەت و ڕەزالەت. بەواسطەی إعتقادیات کە خوا بووە (حائل) چارەی چۆن ئەکریٚ؟ ئەڵێن : (ئەوە عینی إعتقادی إسلامیە رَسولی أعظَم یاراني گوزین لەو إعتقادە دا بوین) فَما التَّدبیر؟ لاشَكّ ئەو إعتقادیاتە فاسدن یاخود غَلّ و غَشيّ تێکەلاّو بووە تسمیم کراون بوین بە زەهری حیاتی إسلامی.

یەکیٚ لە روأسای علمای طبیعەت ئەڵیٚ: (ئێمە إنکاری خوای ناکەین خوا

مَبْدَأی وُجُودە، أمّا ئێمە تەماشای عِلَلْ و أسبابی قَریبە ئەکەین ئەگەر هەموو شت رأساً بلا واسطەی إسناد بدەین بۆ خوا رێی علم ئەبەسترێ إکتشاف و إخْتِراع نامێنێ. سَبَبْ بەو مُزَخرەفاتی (ملیّون) کە تێکەلاوی إعتقادیاتیان کردیە (حُکَما) دین دەگرمێنن ئەلێن: (مانِعی تەرەقیە، موجبی جمود و خمولە) حَقیقةً وایە آثاري دیارە، إیمان بە علم و قدرەت و إرادەی خوا ئەبایە ئێمە بکا بە عالِم بە قادِر بە مُریدێ (أُلُو العَزم)، زێرا بلَندی عَبد بە گوێرەی بلَندی مَعبودە.

خوا وەعدی دا بە (نَصر) أمّا ئەفەرموێ: (لا تَغْفُلُوا عَنْ أسْلِحَتِکُمْ) وە ئەفەرمووێ: (وَأعِدّوا لَهُمْ ما استطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ) أصحابي گوزین تێی گەیشتن بەو إعتِقادە قوەتیان قدرەتیان سَعیان زیاد بوو، بەقوەی بازو بە ضربی شمشیر بە إستحقاری حیات بە روح لەسەر دەست دانان، وەعدەی خوایان گەیاندە جێ، ئەیانزانی هەموو شت بە إرادەی خوا ئەبێ، بۆیە ئەوەیان نەهاتە خاطرو خَیال، کردیان، بە ذِلّت و ژێر دەستی راضی نەبوون! ! ! حاصِلی ئەو آیَتە آیَتێ زۆر قیمەت دارە میزانێ مُستَقیمە مِقیاسێ راستە.

أوَّل و آخري دەعوەتی رَسولي مُجتَبی خاتم الرسل والانبیاء، بۆ حَیاتە، حَیاتێ بە عِزّ و إستقلال و مَجْد و شەرەف. واجبە لەسەر أمّت إجابەی دەعەوەتی پێغەمبەر بکەن، دوای قسەی ئەم و ئەو نەکەون وە إلاّ دەکەون، زاتاً کەوتن! ! ! وەبەو إعتقادیاتی مَغشوشە تا أبَد سەرناکەون. چوار آیَت بۆ سَعادەتی دین و دونیای أمّت لای (حَقیر) لە غایەت بەدەر قیمەت دارن، یەکێکیان ئەو آیَتەیە، تَفصیلی لە تفسیری آیَتی (إنَّ اللّهَ لاَ یُغَیِّرُ مَا بِقَومٍ حَتَّی یُغَیِّرُوا مَا بِأنفسِهِمْ) إنشاالله عَرض ئەکرێ. تا ئێستا چابو هەر نەیسە خوا حائِل بوو ڕوویکمان لە خوابوو، وَلَو من زۆر لە مَسئولیەتی رۆژی جَزا ئەترسم أمێدێ نَجات بوو، ئێستا شێخۆکە و شەیتانۆکە جنۆکە بوینە حائل لە بەینی ئێمەو خواو ئێمە و دڵ، ئەوە زۆر پیسە موجبی مَطرودي دونیا و آخرەتە

﴿وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٢٤﴾ ئەو ڕۆژە هەرکەس کردەوەی خۆی ئەزانیّ، پاداشی ئەدریّتیّ. ﴿وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةً﴾ ئێوە ئەوا غالب بوون لە (بدر) دَسْتُور العَمَلیّ زۆر بە فائدەتان وەرگرت، ئەوجا ئاگاداری دڵی خۆتان بن، تەماشای مَصالح و مَفاسِدی عامّە بکەن بە صَهْباي ظَفَرْ مەست مەبن، دەست بە فِتْنە ئەنگیزیّ و ئاگرۆکە کردنەوەی شەڕ هەلایساندن مەکەن، فتنە تەڕو هیشك پێکرا ئەسوتێنیّ إصابەی ظالِم و مَظلوم ئەکا، بە حُبیِّ رِئاسەت و مەیلی سەرداری تَفْرقە مەهاوێنە ناو خۆتان.

لام وایە (فِتْنە) لێرە بە مَعنی (إختبار) و (إمتِحان) نیە– لاشكّ فتنە بە مقام ئەگۆریّ– سەر دەفتەری فتنە لە عالەمی إسلامیەت، فتنەی زەمانی أمّامی (عثمان) بوو کە إمامي عثماني تيَدا ضايع بوو. فِتنة دەها إشتدادی کرد بەلاو مصائب بۆ إسلامیەت هات إزدیادی کرد، تا ئەمڕۆ ئاگری نەکوژاوە. عرضي حَضرەتي (زُبَیْر) یان کرد ئێوە خلیفەتان ضايع كرد يعني نَصرەتتان نەدا تا کوژرا، ئێستا ئێوە دێن طَلَبی خوێنی ئەکەن؟ فەرمووی: (ئێمە لە عَهدی پێغەمبەر (ﷺ) وە أبوبکر و عمر و عثمان ئەو آیَتەمان ئەخوێندەوە، وامان حساب نەدەکرد ئێمە أهلی ئەو فتنەیەین، تا فتنە کەوتە ناومان) سُبحان الله ئەمەش یەکێکە لە أثرِي حَیْلولەتی خوا لە بەینی إنسان و دڵی! واقعاً گەلیّ آیتی قرآن گوێی نەدرایە. گەلێك جارانم ووتیە ئەو مەلایە گەورانەی نافذُ الكَلِمە ئەو أولیایانەی (مُعْتَبَر و مَوثوقٌ بِهِ مُعْتَمَدٌ عَلَيْه) لای أُمَّت ئەبایە زۆر ئاگاداری قسەی خۆیان بن بزانن بۆ أمّت بۆ نَسْلی آتی زەرەرو نفع چیە، ئەبایە تیّ فکرن ئەو أفکاری ئەیهاوێنە ناو موسڵمانان ئایا سَوقیان ئەکا بۆ مردن یا بۆ حَیات؟ ئەمڕۆ ئێمە ئەزانین گەلیّ قسەی ئەو نَوعە زاتانە بوو بە سَمّی قاتِل بۆ وَحْدَتی إسلامیەت بۆ عِزّەت و مَجدی دین، بەڵکو گەلیّ مَظلوم و کەم عَقل پێی وەرگەڕان.

شێخی (عەرەبی) ئەفەرمویّ: (حَضرەتی رَسولُ الله خاتَمي نُبُوَّەتي

تَشریعیة، نُبُوّەتي بیّ تَشریعي نەگیراوە) لەو عصرە (قادیانی) پێی بە هیلاك چوو- تفرقەیێ تازە کەوتە بەینی موسڵمانان.

إعْتِقادي بوونی (مَهدی) و نزولی (عیسی) یان دانا، لە أعْصارو أمْصار چەند فتنەی لیّ بەرپا بوو، بە ملیۆن موسڵمانان کوژران لافاوی خوێنیان هەستا ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ۝٢٥﴾ لە حەق فتنە ئەنگێزان، نَظَر کورتان، خوود پەسندان، دەعیە داران، لووت بڵندان، بیّ شعوران، لە إنصاف دووران. فارسی ئەڵیّ: (أگرچی دێر گیرد سَخْت گیرد). سُبحْان الله خَلافەتی إسلامیان کردە مایەی فتنە، ئەمڕۆ خلافت مُنْقَرِض بوو بالکُلّیّە، دەوری إنگلیز گەمەی بە خَلافت کرد، ئەمڕۆش مەلای (سُنّي) و (شیعي) مجادەلەیان لەسەر خلافەتی (أبوبکر) و (علی) یە. إلاهی! ئەوە چ حَماقەتێکە؟ چ حیلولەتێکە لە بەینی ئەوان و دڵیان؟ ﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ﴾ خِطابیّ عامّە، یا خاصە بە (مهاجرین)، بۆ أهلی (بدر) بیّ لام زۆر جوانە. ﴿إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ حَتّا لە زەمانی غَلبە و قوەت و زۆریش، ئەو حالی ماضي لە فکر مەکەن، دائما یادی بکەن. إنسانیّ إنسان بیّ بەد أصل و بەد نهاد نەبیّ، أیّامی فَقرو فاقەوو ذِلّەت و مَسْکَنەتی لە فکر ناچیّ، تاکو لە حِفظي حال و إستقبال غافل نەبیّ. لە (قَحْط) و غَلاي سَنەی ١٣٣٦ هجری گەلیّ کەس سوالّیان ئەکرد لەبەر دەرکان ئەخولانەوە گوێچکە نانێکیان دابانیّ هەزار دوعایان ئەکرد، بە صەد حالّ تا قورتار بوون، دوایّ دیتماننەوە ئەو رابردوانەیان لە فکر نەمابوو دەعیە و فیزێکی تر شیوی ساواریان نەدەخوارد کەی ئەو پیاوانە سوالّیان کردوە بۆ چینکە نانیّ گەڕاون؟ أُمَمِ إسلامیە خاصةً قەمی (کورد) لەبەر بیّ تَذکری ماضي، لە سَعادەتي إسْتِقبال مَحروم بوین. ﴿تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ﴾ ئەترسان خەڵکی بتان ڕفێنن، فارس و ڕۆم و قریش و عشائری أطراف. ﴿فَـَٔاوَىٰكُمۡ﴾ مَأوی و جێیّ کی تیای مَصُون و مَحْفوظ بن، پێی دان، چ مَأوی

حِسّی چ مَعنوی. ﴿وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِۦ﴾ لەسەر (أعداء) ﴿وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ خۆش و پاك و خاوێن. ﴿لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٢٦﴾﴾ بە زێدە سعی و عمل، نە تەنها بە زوبان. حقا جێی تَشَكُّراتە لە چ حالێ بۆ چ حالێ!. لە (شاهنامە) ئەلێ:

پس أز خوردَنی أفعی وسوسە مار عَرَبْرا بە جایْ رَسیدت کار. کی تاجی کیانی کُنَنْد آرەزو بادْ بَر چرخی گردون تُفُو. هەرچەند ئەم قائلی (إیرانی) لەسەر تَحوُّلی عەرەب تف لە چەرخی گەردون ئەکا، أمّا عەرەب بەعرەبی نائِلی ئەو مقامە نەبون، بە إسلامیەت نائِل بوون، وَقتێ کە رابطەی إسلامیان سست بوو، چوونەوە سەر حالی عەرەبی سابق(طـه حسـین)ي (مصـري) تطبیقاتێکی ئەکا لە بەینی حالی ئێستای عەرەب لەگەڵ پێش زەمانی سَعادەت و أوائلی رسالەت، ئەلێ: (فەرقی نیە اِلاّ لە جِهەتی دەوڵەتاکانی مُتَوَلّي لە بَدَل ((إیران)) ((إنکلیز))، لە جێی ((ڕۆم)) ((فەرەنسە)).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَٰنَٰتِكُمْ﴾ سَعادەتی أمّت بە أمانەت و وەفایە، أدای وظیفەو إیش و کاری عمومی و خصوصی بەتەواوی بێ نَقْص، حتّا وا باشە هەر کارێ بیکەی وَلَوْ عَلی وَجهْ الْکَمالِ وَ التّمام بێ، بە ناقصي بزانی سعی بکەی بۆ چاکترو تەواو تر. نَوعە خیانەتێ هەیە لە بعضێ کەس مِلَت و أُمَّت و دەوڵەت مەحو ئەکاتەوە.

ئەی أهلی إیمان خیانَت مەکەن دەربارەی خواو پێغەمبەر فەرمایشیان بە مُکَمَّلي بەجێ بگەیێنن! ئەگەر تَوظیف کران بەتەواوی بێ کەم و کورتی أدای وَظیفە بکەن! وە وەظیفە بەنا أهل مەدەن! ئەوە خیانتە لەگەڵ خواو رَسول و أمَّت! زۆر خراپە! خۆ بە خۆی لە أمّاناتی خۆتان هەرچی بێ حتّا مَعنوی خیانَت مەکەن! خیانَت لە علم و إعتقادیات لە هەموو شتێ خراپترە، بە إعتقادی نا موافق أُمَّت ئەمرێ، لە عَقل و حِسّ ئەبێ، لە ذِلّي أسارەت دا ئەمێنێ، سعی ناکا بۆ نجات بوون، چونکی لە مَقولەی رَضا بە قَضا، قبولی

إرادةُ الله، الجازمی ئـەزانیٚ. ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ٢٧﴾ طبیعـي بەنـەزانین و غفْلَـتْ، نابێتە خیانت، فاعل مسئول نابیٚ، ئەگەر حَقیقةً لە نەزانین بـیٚ، بـە شَـرطيٚ لـە جَهله کە مَعذور بیٚ، یاخود ئێوە ئەزانن خیانَت خراپە لەبەر عِنایَتْ نەبیٚ حاجَت بە نَهـی نیـە. ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ﴾ عَلـى الأكثـر إنسـان توشی خیانَت ئەبیٚ لە جِهَت مـالّ لـە طَـرَف أولاد. مـالّ ڕیشـەی جەرگـە، أولاد ثَمَرەي دڵە، نەیان کەن بە حائـل لـە بـەینی خـۆو خـواو إنفـاقی فی سـبیل الله و باعثي خیانَت لەگەڵ یـەك! بُخْـل مەکـەن! بـە طَمَـعْ مـەبن! سُبْحانَ الله حـالي بَشَري موسڵمان گەیشتە چ دەرەجە! برا بـرای ئـەکوژیٚ لەسـەر کۆتکـە جـۆیٚ دوو مست نۆك. ئەوسالّ لە وەقتی درونە برایٚ زگـی برایٚکـی داك و بـابی خـۆی دڕاند بە داسی سەپانی چـونکی پێـی وتبـو تـۆ ناصـاغی ئـیش ناکـەی حـەقی سـەپانیت نـادەینیٚ. ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ٢٨﴾ مـؤمِنْ ئـەبیٚ مـالّو و ولدی خۆی بۆ خزمەت خواو رَسول أُمَّت بویٚ! تاکو لە طَرَف خوا نـائِلي أجـریٚ گەورە ببیٚ! أومیدیان بە (ما عْنـدَ الله) زیـاتر بـیٚ لـەوەی کـە لـە لای خۆیانـە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا﴾ لەهـەر کـارو صـنعتیٚ هەبیٚ ئەگەر إنسان تیایا نەبیٚ بە صاحبی فکرو بصیرەت، تەرەقی ناکا، ناقص ئەمێنیٚ. حتّا (مەلا) ئەگەر چاوی لە نوسراوە بیٚ خۆی نەبێتـە صـاحبی قـوەی نَظَري و إسْتِنْباطي، لە زۆر جیٚ دادەمێنیٚ، لەسەر دەرس فـەقیٚ سـؤالێکی لـیٚ بکا، ئەگەر لە قونە قەیدی حاشیەدا نـەیبینیٚ، نـاتوانیٚ لـە بصـیرەتی خـۆی جوابی داتەوە، بۆیە (مُقَلِّدْ) هەرچەند زۆر مەلا بیٚ أنواعی علوم بزانیٚ، ناگـا بـە (فقیـە). ئەگـەر هـەموو شـت لـە طَـرَف خـوا بـە موسـڵمانان بگـوتریٚ، وەك (جوولەکان) بیٚ بصیرەت و فکر ئەبن. جەنابی حـەق قاعدە بۆ موسـڵمانان دا ئەنیٚ، بەواسطەی وی بیانکا بە أهلی فکرو نَظَري صـائِب بـە حَقـایق و دقـایقی أمور بکەن، ئەو أمورە چ دینی چ دونیَوی چ عِلمی چ عَمَلی چ حَربی چ سِلمی چ فَردی چ إجتِماعی! ئەوەش چیە؟

تقوایه! خۆپاراستنه لـه مـەیلی فاسـد! چۆن جـەنابی حـەق رَبُّ العالمَینـه نِسـبەتـی علـی (السَّـواءَ)ه خصوصـیەتی لەگـەڵ کـەس نیـە، إلاّ بـە تقـوا و خۆپاراستن له رِزائل نەبێ، ئێوەش ئەی أهلی إیمان ئەگـەر ئـەو تقوایـه بـەجێ بێنن خوا قوەتێکی (دَرّاکه) تان ئەداتێ نورێکتان ئەهاوێته نـاو دلَ، کـە بـەوی فرق بکەن له بەینی حەق و باطِلْ، صَحیح و فاسِدْ، ضارّو نافعْ، حُجَّت و شُبْهه، خـالِص و مَغْشـوش، تَمیـزي مُتَشـابه بکـەن! أحکـامی إلاهـی لەگـەڵ أحکـامی دَخیله جودا ئەکەنەوە! به میلی شاعیرانه چاکەو خراپه پێك نەنوێنن!

﴿وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ﴾ إنسان که تەماشـای أحـوالی (نَفسّیه) ئـەکا ئەزانێ (نَفس)ی نامرێ! بەتەواوی بۆ حەق رام نابێ! دائماً مەیلی سـەربەخۆی و بێ قەیدی ئەکات!!!. گەلێ جار پاش مُلاحَظەی کَیْفیّات ي نَفْسیَّەی خۆم و آثاري خەلك ئەکەم، ئەلێم: (نفس أصلاً موسڵمان نابێ، اَللّهُمَّ مەگەر له ملیۆنـێ یەك دوو، بەلاّم إنسانی عاقل و مُتَّقي به حَیا ئـەتوانێ نفسـی خـۆی ضَبْط بکـا نەیلێ سَیِّئاتي دەرکەوی، شَرارەی شەڕی، زوبان بیکێشیته دەر. ).

ئێوە ئەگەر تقوای خوای بکـەن! خـوای تعـالان سـیئاتی ئێـوە دا ئەپۆشـێ نایلێ له قووه بێته فعل. ﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ﴾ بەو مَیْلي بێ أثَـره ناتـان گـرێ لێتـان خۆش ئـەبێ. ﴿وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٢٩﴾ جـەنابی حـەق خالقـه مُطّلِعـي أسرارە سروشتی طبیعتي إنسان ئەزانێ، بەو گوێره له فَضْـلي گـەورەی خـۆی معامَلەیان لەگەڵ ئەکات. نَعوذُ بِاللّه ئەگەر به فکری بَعْضێ کەس لَهُ أهلی علم و تَصَوُّفْ دەربارەی عِباد معامله بکا، لەکەم کەس خۆش ئەبێ! لَهُ الَحمدْ کـه تـەرازووی مُجازات و مُکافات به دەست خۆیەتی نایداته کەس.

پاش وەفـاتی بـابم شـەوێ لەخـەومادیت تَشـریفی لـه مَدرسـه بـۆ لای مـالێ ئەهاتەوە منیش ئەچوم بۆ مَدْرسه، لەو سەری کۆلاّن راوەسـتا، ئـەمنیش لـەم سەری کۆلان ڕاوەستام، دیتم زۆر بەرِق بوو له ڕقان ڕەنگی سوور هەلاّیسـا بـو به توندی فەرموی: (ڕۆله ئەوه مَعنای چیه بَعضه کەس به سَیِّئاتي أولاد طَعن

لە بابی ئەدەن؟) عَرضم کرد: (وا ئەبیّ باب خُلقێکی بەدی هەیە، أمّا بە عَقل و کیاسَتْ دای دەپۆشیّ، أثري دەرناکەویّ، ئەو خُلقە خراپە بە حُکمی وُراثتي مَعْنَوي بۆ وَلَدی نَقلی ئەکا، ئەویش ئەو کیاسَت و سیاسَتەی نیە أثري بزرکا، شَرارەی دەر ئەکەویّ، زەرەر بە عِباد ئەگەیَنیّ، بۆیە لۆمەی بابی ئەکەن!) بە جەوابەکەم مَسرور بوو رِقی نەما فەرمووی: (راست ئەکەی).

جەنابی حەق بە فَضلي عَظیمي خۆی عەیبمان داپۆشی! ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ ئەو تَذکارە خاصَّةُ رَسولي مُجْتَبایە. ئەو آیَتە جێی لە میانی سورەتی(أعراف) ئەبێتەوە بەتەواوی، لەسەر ئەو حالەش لە مناسبەی (أعراف) و(أنفال) عاجزن. أسلوبی قرانی دایە، کە إعتبار، بە مَواقعی إعتبار، زیاتر ئەکا، بۆیە ئەو تَذکارە لەو مَقامە پاش ظَفَرْ لەسەر ئەو ماکِرانە إیراد کرا. حقاً ناظمي آیاتی أکوان و ناظمي آیاتي قرآن یەکە. ئەوان کافران تَدْبیریان لە حەق تۆ ئەکرد! ﴿لِيُثْبِتُوكَ﴾ حەپس و قەیدو بەندت کەن نەیَلن إخْتِلاط و دەعوەتی کەس بکەی. ﴿أَوْ يَقْتُلُوكَ﴾ بتکوژن ﴿أَوْ يُخْرِجُوكَ﴾ دەرت کەن لە مەفتەن. ئەلێن (شَیْطان) بە صورەتي شێخیّ (نَجدي) هاتوە حاضِري مَجْلسی مُشاوەرەیان بووە لە مَیانی آراءْ رَأي (أبو جَهلي) پەسەند کردوە کەوتویەتی: (لەهەر قبیلە کورِیّ زرنگ وەرئەگرین هەریەکە شیرێکیان ئەدەینە دەست تێکرا وێکرا بەیەك ضربە حضرەتی محمد بکوژن خوێنی لەناو قبائل بلاّو ئەبیّ خزمی نێزیکی ناتوانن شەرِ بکەن مَجْبوراً بە خوێن راضي ئەبن). بەلیّ (إبلیس) مُقابلی کەسیّ وەك (أبو جهل) بە غَیْری (سَلَّمْتُ) چی پیّ ئەکریّ؟ (سَیِّد رَشید) إخلاصي (نَجْدي) یانی زۆرە نازانم ئەو تَمْثیلیەی چۆن قبول کردیە؟ هەر چۆنیّ بیّ جەنابی حەق حِفظي رَسولی خۆی کرد، لەو شەوە هجرەتی کرد لە (مَکّە)!.

گەر چی حەزم لە قسەی پرِو چوچ نیە أمّا بە کَمالی تأسُّف عَرض ئەکەم: رَسولی کبریاشەو شەوە (عَلي) لە جیّ خۆی نوستاند (أبوبکر)ی لەگەلّ خۆی برد! تەماشاکەن!. هەردووك لە چی مَهْلَکەی عَظیم دابوین!!! لە مُقابلي ئەو

جان سوپارديه (رافضي) ئەڵێن: (أبوبكری بۆيه لەگەڵ خۆی برد لێی أمين نەبو بە جێی بێلێ سِرّی ئاشكرا ئەكرد). مُقابَلةً خَوارِجي ئەڵێن: (بۆيه علی لە جێی خۆی دانا تاكو بيكوژن لە كۆل موسڵمانان ببێتەوە)!.

ئەوجا بنۆرنە سفاهەتی أُمَّتْ بە چ دەرەجە گەيشتوە! ئەگەر حالی (أبوبكر) و (علی) دەربارەی رَسول الله وا بوبێ! ئەبێ ئەو سُفَهايانە حاڵيان چۆن بێ؟ ﴿وَيَمۡكُرُونَ﴾ (بالإستمرار)! ﴿وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُ﴾ (بالمُقابَلـه)! ﴿وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ۝٣٠﴾ كێ بە حُسنی تَدبير ئەكاتە خوا؟ عاقِبەتی مَكريان خُسْران بوو، جەنابی حەق رَسولی خۆی- بَعْدَ الحفظ- غالِب كرد، ئەو ماكرانە مەحوو نابوود بون! ﴿وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا﴾ يَعني قرآني مُنَزَّلي مِن عند الله! ﴿قَالُواْ﴾ لە مَكرو خدْعەوە ﴿قَدۡ سَمِعۡنَا لَوۡ نَشَآءُ لَقُلۡنَا مِثۡلَ هَٰذَآ﴾ ئەگەر حەز بكەين وەكی ئەو قرآنە ئەڵێين! ئەوە چی يە؟ تا ئێمە لە مُعارضەی عاجز بين! ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ۝٣١﴾ حِكاياتي رابردووانە نوسراوەتەوە هەر چۆنێ بو بێ چاك خراپ مَعقول غَيرە مَعقول، ئێمەش كەيفمان لێ بێ، ئەو نَوعە حكاياتانە هەڵئەبەستين!. شكم نيە ئەو قسەيان بە دڵ نەبووە، هيچ نەبێ عەرەب بوين، سَليقَةً مَزايای عەرەبيان زانيوە وە كەمێ هۆش و گۆشيان بووە، زاناندويانە قران حكايەت نيە، ئيتر ئەوەندە بەسيە بۆ مُعانَدە! ئەوان خوا لە حەقيان ئەفەرموێ (وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا)! ئەوا ديتتان وەعدی خوا هاتە جێ! أساطير لە كێ؟ ئەو نَوعە إخبارو إعجازە لە كێ؟ رَسولی أكرم أوَّل وآخِر لە حالی ذِلَّـەت و عِزَّەت مِزاج و مەيلی هومايونی نەگۆڕاوە، ظاهِر و باطِن مَقصَدي سعادەتی بَشَرْ بووە، بێ فرق و جودای لە بەينی خزم و بێگانە، حَياتێ بە إنْتظام لە دونيا، نَيْلي كرامەتێ أبدی لە عُقْبا! بَعضێ لە مُستَشْرِقان دەربارەی حَضرەتي محمد (ﷺ) ئەڵێن: (زۆر عالی هممەت بووە، إمتيازێكی بۆ خۆی دانەناوە، ئەوێ ڕۆژێ لە (مكه) دەركرا لەسەر چ مەيل و مزاج و مشرەبێ

بوو، ئەویؒ ڕۆژیش كە لەگەلٚ (١٢٠٠٠) دوازدە هەزار كەس فتحی (مَكّە)ی كرد لەسە عَینی مَیل و مِزاج و مَشْرَب بوو، خِدعەی نەبوو، لە دەعوەتی الی اللە ثابتْ قَدَم بوو).

﴿وَإِذۡ قَالُواْ﴾ لەڕووی صَرْف و أخْذی فِكری عامّە! ﴿ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا﴾ قُران. ﴿هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ﴾ ئەو هەر حەقێكە لە طَرَف تو نازل بوتە سەر ئەو زاتە، دینی ئێمە باطِلە! شَمَّەیٚ حەقی تیانیە! ﴿فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لە (سِجِّیل)ی مُسَوَّم. وەكی باراندت بەسەر (أصحابُ الفیل) حِفْظی ئێمەو (بَیْت) ی خۆت كرد. سەیری چ منافقیٚ دەنوێنن لەو دوعایە؟ بە ﴿أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ٣٢﴾ وەك سائری أُمَمی رُسُلی سابِقْ كە بۆ سەلامەتی رُسُلەكان كافرەكانت پیٚ بە هیلاك دا، زیاتر ئەنوینن كە ئەوان لەسەر حەقن وە دەعوای محمد (ﷺ) باطِلە! ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمۡ وَأَنتَ فِيهِمۡۚ﴾ تأْریخ شاهدیٚ ڕاستە ئەو رُسُلانەی أعْدایان بە ئافاتی سماوی فەوتاون، خۆیان و مؤمنەكانیشان، دەوامیان نەكردووە، دینیان ظَبطْ نەكراوە، ئەو وحی بۆیان هاتووە، نەنوسراوەتەوە، خۆیان و دینیان مُنقَرِض بوین. جەنابی حەق إرادەی وایە ئەو كتابە حكیمە حِفظ بكریٚ، ئەو دینە حەقە، مُحَرَّراً مُهذّباً، بە إعتقادیّات و عَمَلِیّات، ثابت و بەردەوام بیٚ، بۆیە بە خلافی سُنَّتی خۆی ئێوەی بە عذابی إستِئْصالی عَذاب نەدا! ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمۡ وَهُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ٣٣﴾ سَبەبێكی تر هەیە بۆ عَذابی أُمَمی سالِفە، لەواندانیە، گەرچی دەربارەی ضُعَفای مُؤمنیان زۆر بیٚ ڕەحم و ظالمانە مُعامَلە ئەكەن، أمّا وەك أسلافیان، سَیِّئاتی عامّەیان نیە، بەسایەی (بَیْت ی شَریف) بَقِیّەیٚ لە دینی (إسماعیل) یان لەناو ماوە، ڕوویان بالكُلیّە لە خوا وەرنەگێڕاوە بە مَكارِمن گوناهی بكەن دای دەپۆشن، لەناو خۆیان بیٚ مُنكَراتن، ڕیٚ گریان نیە،

بەڵکو لە خوا ئەترسن کە عذابیان بدا لە سەر گوناه وَلَوْ بە عَذابي دونیا بیٚ. لەبەر ئەم دوو وَجْهە بە عَذابیٚ کە دواییان بیٚنیٚ، عَذابیان نادا!. ئەوا لە بَدَلْ أحْجاري سماوي، بە ئێوە تیرە بارانی کردن، بە بارِقەی سِیوفی لامِعە بَعضیکی کوێر کردن، بَعضیکی بَصیرەت دانیٚ، بە شمشێری ئەو بیٚ هێزانە، لە مل و پەنجە و گەردەن کەشی و تطاولي وانی دا! ﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ﴾ خدمەت و طَوافِ بَیتیان نیە بە دین و ئاینیٚ تەواو بچیٚ! ﴿وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ حتاً ئەو وەقتی کە لە (مکّە) بوون موسڵمانەکان مَنع ئەکران، مەگەر بەدزی چوبان طَوافیان کردبا، وَبَعْدَ الهِجْرَتیش مَعلومە! وەپاش غَزوی (بَدر) بالکُلیّە منعی موسڵمانانیان کرد! تا فَتْحي (مَکّە) ئەو حصارە هەرنەگیرا! ﴿وَمَا كَانُوا﴾ في الحقیقە. ﴿أَوْلِيَاءَهُ﴾ حەقی ولایەتیان لەسەر (مَسجِدَ الحرام) نیە! ﴿إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ﴾ بناکردەی (إبراهیم ی خلیل) – إمّام الموَحّدین– ئەبا هەر لە طَرَف أهلي تَقوا، لە شرك، لەو أموری مُسْتَقْبَحە و مُسْتَهْجَنە، خدمەت و نظارەت بکریٚ! حەق هەر بۆ ئەوانە! مشرکی تابعی هەوا بە لینگی ڕووت طواف بکا چ حەقێکی هەیە؟ ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ﴾ لەبەر غرور ﴿لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾﴾ طبیعي کەمێکیان ئەیانزانی، أمّا دەسەڵاتیان نەبوو. سُبْحانَ الله لە زەمانی إستِلای جَهل و نَقص لەسەر أُمّـتي محمد (ﷺ) شێت و گێژو وێژو عەورەت بەدەرەوە لایان أولیای خوان! ئەوی عالِم و عاقِل و مُحَدِّث و مُفَسِّرو بە حیاو وِقار و أدَبْ بیٚ، لایان حەقی وِلایەتی نیە، کەیفیان لەگەڵ گێلەکان زۆر دیٚ! ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ﴾ عبادەت و طوافیان. ﴿عِندَ الْبَيْتِ﴾ (کَعْبە)! ﴿إِلَّا مُكَاءً وَتَصْدِيَةً﴾ فیتەو چەپڵە بوو، عبادەت نەبوو، گەمەو گاڵتە بوو، وەك (طقوسي) بَعضیٚ مِلَلْ رَقص و سَماو چالغ و دیلانە بوو. هەر ئەوانە نوعاً ما بونە سَبَبی نەهاتنی عَذابي إسْتِئْصالي، أمّا

نەبونە مانعی عَذابي قتل و مغلوبی بە دەستی ئێوە! ﴿فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ۝٣٥﴾ ئەگەر إيمانيان هينايا، لەو عَذابەش نَجاتيان ئەبوو، بَقيّەش ئەگەر موسڵمان نەبن، ئەو عذابە ئەچێژن! ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەوانەی غَريقن لە كُفر، دائِماً خەريكن ﴿يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ﴾ نقود و غَيرە نقود. ﴿لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ﴾ مَنعي خەڵك كەن لە ڕێی خوا، يَعنی دينی إسلام! زاتاً كەسێ ئارەزوو بكا دوشمن منكوب بكا، نابێ دڵی بە ماڵ مُتَعلِّق بێ، بەڵكو ئەبێ نَفس و ماڵ، لەبەری دەست دانێ لە أوغری أمَلی خۆی صَرفی كا!. ﴿فَسَيُنفِقُونَهَا﴾ (عَلی الأستِمرار!). ﴿ثُمَّ تَكُونُ عَلَيۡهِمۡ حَسۡرَةً﴾ عاقبەت ئەبێتە كەسەر لە سەريان لەسەر دڵيان، چونكی بێ هودە ئەڕوا. ﴿ثُمَّ يُغۡلَبُونَۗ﴾ با لە بَعْضێ غالب بن نوعاً ما خێرێ لە إنفاقيان ببينن، نهايەت ئەوان ژێر ئەكەون!. حقيقةً لە أوَّلي وابوو حتّا مُحاربە (صَليبی) عاقبەتی بۆموسڵمانان بوو، إنفاق و سعی بە هەبا چوو! أمّا دوای گۆڕا! ئەوروپای بۆ إنقِراضي دينی إسلام، حرباً وسلماً، ماڵ صَرف ئەكەن بەسەر ئەكەون موسڵمانان مَغلوب ئەبن، خصوص بە طُرقي سَيِّئات و فَحشيات بِالْحَرةً دينيان ضَعيف كرد، بە بَعضێ مَنْظريّات زەلزەلەيان هاويشتە ناو عقائدي راسِختی إسلاميّە. سەوادی أعْظَمْ مەيلی لادينی ئەكەن، تا مَعارفْ زياد ئەكا، دين كەم ئەكا! پيرەژنێ جوولەكە دەهەزار(١٠٠٠٠) ليرە ئەدا بۆ بنای مَكْتَبێ، يەك شخص چار صەد (٤٠٠٠٠) هەزار ليرە ئەدا موقعێ دروست ئەكا بۆ لاوانی مَسيحی. ئەوان ئەزانن بێ دينی ئێمە بۆ ئەوان باشە! أمّا فی الحَقيقةً بێ دينی بۆ موسڵمانان خراپە!!!. دينی إسلام حَياتی حقيقيە بۆ هَيكەلی إجتماعی بەو شَرطە دينە بەڕاستيەكەی كە پێغەمبەر و يارانی نێزيكی لەسەری بوين، بكرێ! دينێ خفيف و نِشاط و عَمَلە! عَمَلي چاك و بگونجێ بۆ صلاحی دونيا و قيامەت! دينێ بێ بُغض و قين و حقِد و حَسَد و غَشّ و خيانەتە! دينی حُبّ و

وَلاو بیّ تَفرەقەیە! دینی ایشارە بۆ برادەری مؤْمِن!. مَعَ الأسَفْ کەس نیە پەرۆشی ئەو دینەی بیّ، ئەوا ئەڕوا! تەماشاکەن! إیمان لە دلآن ئەچێتەوە، وەك بَعضە پارچە لباسیّ ئەمڕۆ لەبەری ئەکەی بە سَعاتیّ.دەست ئەکا بەڕەنگ چونەوە. نەکو خۆیان ماندی کەن، مالّ صَرف کەن، ئەڵێن: (ئەوە (إرادة الله)یە ئەبیّ هەروا بیّ!) أمّا بۆ إختلاساتی خۆیان مَرحَبا لە (ارادة الله) ناکەن! بەهەزار ئەیڕەنگ و أفسون و حِیلە و رِیا کاری خەریك ئەبن تا لوقمە نانیّ ڕەزیلانە بەدەست ئەخەن. خُلاصە ئیش تێك چوو، بڕوا ناکەم ڕێك کەوێتەوە!

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ لەسەر کفر بمرن ﴿إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحۡشَرُونَ ٣٦﴾ دەئاژورێن!

﴿لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ﴾ بۆیە خوا وا ئەکا، تا پیس و پاك لێك جودا کاتەوە، پیس بە پیسی چیّ، پاك بە پاکی خۆی مُکافات وەرگریّ. ﴿وَيَجۡعَلَ ٱلۡخَبِيثَ بَعۡضَهُۥ عَلَىٰ بَعۡضٖ﴾ کافری پیس باوێتە سەر کافری پیس، یا مالی پیس، لە ڕێی پیسی صَرف کرا بیّ، باوێتە، سەر کافری پیس کە مالی لە ڕێی پیسی صَرف کردبیّ. ﴿فَيَرۡكُمَهُۥ جَمِيعٗا﴾ هەمووان گرکاتەوە. ﴿فَيَجۡعَلَهُۥ فِي جَهَنَّمَۚ﴾ مالّ و صاحِب مالَ، تاپێی داغ بیّ! ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٣٧﴾ کاملن، تەواون لە خُسران، تیّ شکاون لە زەرەری دونیا و قیامەت و نَفس و نَفیس! ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ ئەوانی مَحارِب. ﴿إِن يَنتَهُواْ﴾ لە کُفرو حَرب. ﴿يُغۡفَرۡ لَهُم مَّا قَدۡ سَلَفَ﴾ (ألإسلامُ يَجُبُّ ما قَبْلَهُ)، أماّ بۆ مُرْتَدْ، نا!. کەسیّ إستدلال بکا بەو آیَتە، ئەگەر مُرْتَدْ موسلّمان بێتەوە حقوقی عباد و إلاهی لەسەر رَفع ئەبیّ، غَلَطْ ئەفەرمویّ!! إسنادی ئەو قَولە بۆ إمامی (حَنَفي) إفترایە! رأی إمامی(مالِك)یش إنشاءالله هەروایە!..

﴿وَإِن يَعُودُواْ﴾ بۆ قتال! ﴿فَقَدۡ مَضَتۡ سُنَّتُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٣٨﴾ (العاقبة لِلْمُتَّقِينَ! واللهُ يَتَوَلّى الصّالحِين!) عادەتی خوای وای تَقَرُّر کردیە. مُحقّق بزانن،

مَغلوب ئـەبن! ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ﴾ ئەگـەر نەگەڕانـەوە! ﴿حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ﴾ ئەوەندە بێ هێز بن نەتوانن إفساد بکەن ببنە بەرهەڵست. ﴿وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ﴾ بەهەموو أصول و فروعی، بـە حُریَّت بـەجێ بگەیەنـدرێ، مَنعی (حج) نەکرێ! بەدەسیسەش خـەڵکی هەڵنەخەڵـەتێنن! ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ﴾ (بَعْدَ التَّبليغ)! ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ﴾ سِرّي و عَلَني – بَعْدَ قبـولِ الإسـلام–! ﴿بَصِيرٞ ٣٩﴾ هیچـی لـێ بـزر نـابێ! ﴿وَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ نەگەڕانـەوە قبـولی ئـەو دەعوەتـەیان نـەکرد، إعراضـیان لـە دیـن نـا! ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ﴾ (أيُّها المؤْمنـونَ الكامِلونَ المُتَّقُونَ المُنْفِقوُن) ﴿أَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَىٰكُمۡۚ﴾ بەڕاستی بـە یقـین بـزانن خـوا ناصـری ئێوەیـە! ﴿نِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ﴾ بەنـدەگانی خـۆی بـە ضـایع نـادا! ﴿وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ٤٠﴾ ئەوەی نَصرتی بدا، مَغلوب نـابێ! بـەڵێ تـا موسـڵمانان تـەنها خوایان بە (وَلي) خۆیان ئەزانی بە فەرمایشاتی خوایان ڕەفتـار ئـەکرد، وابـو! پاش ئەوە کە هەزار هەزار (ولی) تریان بۆ خۆیان پـەیا کـرد، خوایـان لـە فکـر کرد، ئیش گۆڕا، موسڵمانان أهمیەتیان نەدا بە مادِّیات و طَبیعِیّات، بە مَعنَوِیّات و زُخْرُفِ إعتقادیّـات هەڵخەڵـەتان، تَفـرقـەیان بـوو، بـوون بـە دوشـمـنی یـەك، دوشمنی دینیان لە فکر کرد، بۆیە مَغلوب و مَنکوب بوون. –نَعُوذُ بِالله ـ [1]

[1] ـــ تەواو بو تفسیری جُزأی (تاسع) نۆیەم لە چنارۆك سبەینەی جمعة ٨ ماهی رجب الله، ١٢ ی أیلولی رۆمی، ١٣٥٥ هِجری قَمری، ١٩٣٦ میلادی.

# ناوەڕۆکی بەرگی سێیەم